٦٥
سالی دوانزەهەم
زستانی
٢٠١١

# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات



**ناونیشان:**
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
شەقامی سالم - سلێمانی
تەلەفۆن: دەزگای سەردەم ٣١٢٨٩٢٠ - ٣١٢٠٨٩٠
سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

**نرخی (١٢٥٠) دینار**

# ناوەرۆک



## فیکر و فەلسەفە



## گفتوگۆ



## ئەدەب و هونەر

## وێستگەکانی سەردەم



• سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.
• داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.
• ئەو بەڕێزانەی بە نووسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمییەکان لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە پێڕەوبکەن.
• بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ بکرێن، سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕ هاوپێچ بکرێن.
• ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.
• بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.
• گۆڤاری سەردەم مافی چاکردنی زمان و باشترکردنی بابەتەکانی لە ڕووی هونەریەوە هەیە، بەبێ دەستێوەردان لە ناوەرۆکی بابەتەکە.
• پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەر و سایتی گۆڤارەکەوە ئەنجام دەدرێن.



# هەڵچوونی کولتووری گریك

بێرتراند ڕەسل
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

هیچ شتێک لە سەرجەم مێژووی جیهاندا بەقەد گەشانەوەی کتوپڕی کولتوور لە گریکیا سووڕهێنەر یان بۆ ڕوونکردنەوە ئاڵۆز نییە. زۆر لەو شتانە کە سەر بە تێگەی کولتوورن، چەند هەزار ساڵێک لەوەوبەر لە میسر و میسۆپۆتامیا هەبوون و لەو کاتەش بەدوواوە بەنێو وڵاتانی دراوسێیاندا بڵاوبووبوونەوە، بەڵام گریکەکان بۆ یەکەم جار هەندێک توخمیان بەدیهێنا کە هێشتا لە کولتووردا نەبوون. بەگشتی زانراوە کە گریکەکان چییان لەنێو جیهانی ئەدەب و هونەردا ئافراندووە، بەڵام ئەوە کە ئەوان لە کایەی هزری پەتیدا بەدییانهێنا، تەواو دانسقەیە. ئەوان ماتماتیک[1] و زانستی سروشتی و فەلسەفەیان کەشف کرد، ئەوان لەبری ئەوەی بە وێنە ڕووداوە مێژووییەکان بگێڕنەوە، مێژوویان نووسییەوە، هەروەها ئەوان، سەربەخۆ لە تێڕوانینە ترادیسیۆنییە ئۆرتۆدۆکسەکان، تێڕوانینی نوێیان سەبارەت بە کرۆکی جیهان و مەغزای ژیان گۆڕان پێدا. سەرەنجامی ئەم بەدیهێنانانە هێندە سووڕهێنەر بوو کە ئیتر مرۆڤان تەنانەت هەتا نوێترین سەردەم بەوە قایلن کە رابمێنن و خۆیان بە دەربڕینی ئەفسانەیی سەبارەت بە هێزی ئافرێنەری گریکەکان خاڵیبکەنەوە. بەڵام سەرباری ئەمە مرۆڤ دەتوانێت بە تێگەی زانستی لە گۆڕانی گریکیا تێبگات، جگە لەمە ئەو تێگەیشتنە شایستەی ئەوەیە تەقەلای بۆ بدرێت.

فەلسەفە لەتەک «تاڵس»دا سەرچاوە دەگرێت. ئێمە خۆشبەختانە دەتوانین کاتی تاڵس دیاری بکەین، چونکە ئەو پرۆگنۆزێکی لەبارەی مانگگیران دەربڕیبوو و ئەستێرەناسان ڕوودانەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی ٥٨٥ پ.ز. بەم پێیە فەلسەفە و زانست کە لە سەرچاوەوە لە یەک جیانەبوون، لە سەرەتای سەدەی شەشەمدا سەریانهەڵداوە. بەڵام ئایا پێش ئەم کاتە چی لە گریکیا و وڵاتانی

دراوسـێیدا روویدابـوو؟ هەموو وەڵامدانەوەیەک دەبێـت لایەنی کەم تا رادەیەک پشـت بە مەزەنە ببەسـتێت. بەڵام ئێمە ئەمڕۆ بەڕاستی بەهۆی دەسـتکەوتەکانی ئارکیۆلۆژییەوە پتر لە باپیرانمان زانیاریمان سەبارەت بە گۆڕانەکانی ئەو سەردەمە هەیە.



هونەری نووسین نزیکەی ٤٠٠٠ پ.ز. لە میسـر، پاشـان کەمێک درەنگتر لە میسـۆپۆتامیا، گۆڕان پێدرا. مرۆڤ بـۆ یەکەم جار لەم دوو وڵاتەدا دەستیان دایە نووسین، ئەمەش بەوە کە ئـەوەی گەرەکی دەربڕین بوو، بـە وێنە دادەڕێژرا. ئیـدی هێنـدەی نەخایانـد ئەم هێمایانـە بوون بە بـاو، کە ئیتر وشە بەڕێی ئیدیۆگرامەوە دەدرایەوە — وەک چـۆن ئەمـە ئەمڕۆش لە چین باوە. پاشـان ئەم سیستەمە گرانە لە رەوتی چەند هەزار ساڵدا گوڕرا بۆ خەتی ئەلفبایی.

هـۆی ئاوەڵابوونـی کولتوور لـە میسـر و میسـۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە بـۆ روبارەکانی نیل و دیجلـە و فورات. ئـەم روبارانە چاندنیان ئاسـان و بەبرەو دەکرد. کولتووری ئەم دوو وڵاتە لە زۆر رووەوە لەو کولتووره دەچوو کە ئیسپانیەکان لە مەکسیک و پێرو بینیانەوە. پاشایەک هەبوو بە پایەگایەکی خودایانە و دەسەڵاتێکی دێسـپۆتییەوە. لە میسر سەرجەمی وڵات موڵکی پاشـا بوو. هەروەها ئایینێکی فرەخوداگەرایی بە خودایەکـی باڵاترینەوە هەبوو کە تەنیا پاشـا پەیوەندییەکی تایبەتیـی لەتەکیدا هەبوو. هاوکات ئەریسـتۆکراتییەکی سەربازی و لەپاڵ ئەمەشدا ئەریستۆکراتییەکی کاهینەکان هەبوو. هەر ئەوەندە پاشا لاواز ببوایە یان لە شەڕەوە بگلایە، ئیتر ئەم کاستەی کاهینەکان زۆر جار هەلەکەی دەقۆزتەوە و خۆی لە مافەکانی پاشـا هەڵدەقورتاند. کاری نێو ئەو زەوییانە کە تایبەت بوون بە کشـتیاری، تەرخانکرابوو بۆ کۆیلەکان کە موڵکی پاشا و ئەریستۆکراتەکان و کاهینەکان بوون.

لە نێوان ئایینی میسری و بابلیدا جیاوازییەکی گەورە هەبوو. بە تایبەتی مەرگ لەلای میسرییەکان رۆڵێکی گەورەی دەگێڕا. ئەوان باوەڕیان بەوە هەبوو کە دەروونی مردووەکان بۆ ژێرجیهان دادەبەزێت و لەوێ ئۆسـیریس دادگایی دەکات بەگوێرەی وەرچەرخانەکانی ژیانی. ئەوان دەیانگۆت، دەروون لە

کۆتاییدا بۆ نێو لەش دەگەڕێتەوە، ئەم تێڕوانینەش بوو بە پاڵهێز بۆ مۆمیاکردن و دروســتکردنی گۆڕە مەزنەکان. پیرامیدەکان (هەرەمەکان) لە کۆتایی هەزارەی چوارەم و سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا لە لایەن پاشـــای جیاجیاوە هەڵبەستران. بەڵام بەدووی ئەم کاتەدا کولتووری میسری هێدی هێدی وشــک هەڵهــات، هاوکات کۆنزەرڤاتیڤیزمــی ئایینی بوو بە ئاســتەنگ لەبەردەم هەر پێشــکەوتنێکدا. نزیکەی ١٨٠٠ ی پ.ن. هیکسۆســـە بە رەچەڵەک سامییەکان میسریان داگیر کرد و نزیکەی دووســـەد ســاڵ حوکمی ئەو وڵاتەیان کرد، بەبێ ئەوەی هیچ ئەســـەرێک لە میسر جێبهێڵن. بەڵام پێدەچێت ئەوان رۆڵێکیان بۆ ئەوە گێڕابێت کە کولتووری میســری لە ســوریا و پالەســتیندا بڵاوببێتەوە.

بابل لەچاو میسردا گۆڕانێکی جەنگاوەرانەتری هەبوو. بابل سەرەتا لەلایەن سامییەکانەوە حوکم نەدەکرا، بەڵکو لە لایەن ســۆمەرییەکانەوە کە رەچەڵەکێکی نەزانراویان هەیە. سۆمەرییەکان خەتی مسمارییان گۆڕی و پاشان سامییە داگیرکەرەکان ئەو خەتەیان لێوەرگرتن. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن چەندین شار هەبوون کە لە یەکتری سەربەخۆ بوون و هەموو لەدژی یەکتری دەجەنگین، بەڵام بابل لە کۆتایی ئەم جەنگانەدا ســـەروەریی ســـەند و دەوڵەتێکی مەزنی دامەزراند، لێرەشدا پایەگایەکی ژێرینەی دا بە خودای شـــارەکانی دی، بەڵام بۆ خوداکەی خۆی بەناوی مەردۆخ پایەگایەکی ئەوتۆی تەرخان کرد کە هاوئاستی ئەو پایەگایە بوو کە درەنگتر زیۆس لە پانتیۆنی گریکیا وەریگرت.

ئایینی میســـری و بابلی لە بنەڕەتدا، بە هەمان شـــێوەی ئایینەکانی دیکەی ئەنتیکە، ئایینی «بەپیتـــی» بوون. زەوی مێ بوو، بەڵام خۆر نێر بوو. گا وەک بەرجەســـتەی بەخشـــندەیی نێرینە دادەنـــرا. هاوکات ژمارەیەکی فرە گاخودا هەبوو. بەڵام لە بابل ئەشـــتار کە مێخودا بوو، پایەگایەکی پێشـــینەی لەنێو مێخوداکانی دیکەدا هەبوو. مەزنەدایک لە سەرجەم خۆرئاوای ئاسیادا لەژێر ناوی جیاوازدا دەپەرســـترا. کاتێک کۆلۆنیســـتە گریکەکان پەرســـتگا پیرۆزێندراوەکانی مەزنەدایکیان لە ئاســـیای بچووک بینییەوە، ناویان نا ئەرتێمیس و خودی سروتەکەشـــیان وەرگرت. ئەمە سەرچاوەی «دیانا»ی ئێفێزوسیەکانە کە پاشان ئایینی کریستیانی ناوەکەی گۆڕی بۆ مریەمی پاکیزە، ئینجا لە کۆنسیلێکدا لە ئێفێزوس ناوی «دایکی خودا» بە شێوەیەکی یاسایی چەسپێنرا.

لەکـــوێ ئایین بەتونـــدی گرێدرابووایە بە حکومەتی دەوڵەتەوە، لەوێ هەردەم مۆتیڤی سیاســـی رۆڵێکـــی گێڕاوە بۆ ئەوەی ســـیما ســـەرچاوەییەکانی ئەو ئایینە بگۆڕرێـــن. دەوڵەت خودایەک یان مێخودایەکـــی بۆ دادەنرا، ئەم خودایەتییە نەک تەنیا دەبـــوو بەتەنگ بەرووبوومێکی لەڕادەبەدەری کشـــتیارییەوە بێت، بەڵکو هاوکات دەبوو بەتەنگ ســـەرکەوتنی ئەو دەوڵەتەشـــەوە بێت، لێرەشدا کاســـتێکی دەوڵەمەندی کاهینەکان کاری لە سروت و رێنوما ئایینییەکاندا دەکرد و خودایانی بەشە جیاکانی دەوڵەتی لە پانتیۆنێکدا یەکدەخست.

لەبەر ئـــەوەی حکومەت بەتوندی بە خوداکانەوە گرێدرابوو، ئـــەوا لێرەوە پەیوەندییەک لە نێوان خودایەتی و مۆرالدا دەهاتە ئاراوە. خودایەک یاسای بە یاسادانەر دەبەخشی، لەبەر ئەم هۆیە هەموو شـــکاندنێکی یاسا وەک گوناهی ئەنجامدراو بەرانبەر بە خودا راڤەدەکرا. کۆنترین کتێبی یاسایی کە

هەتا ئەمڕۆ زانرابێت، ئەوەی حامورابییە لە بابل کە بۆ نزیکەی ۲۱۰۰ ی پ.ز. دەگەڕێتەوە. حامورابی بەجەختی رایگەیاند کە گوایە ئەو یاسانامەیەی لە لایەن مەردۆخەوە پێدراوە. پەیوەندیی نێوان ئایین و مۆرال بەردەوام لە رەوتی ئەنتیکەدا چڕتر دەبۆوە.

ئایینی بابلی بە پێچەوانەی ئایینی میسرییەوە پتر رووی دەکردە مشووری ماتەری لە ئەمجیهان و بەختەوەریی لـــە ئەوجیهان. بێگومان جادووگەری، فاڵچێتی و ئەســترۆلۆژی، تایبەتمەندییەکی بابل نەبوون، بەڵام لە بابل پتر لە هەر جێیەکی دی تەشـــەنەیان کردبوو و هاوکات هەر لە بابلەوە کاریگەرییان لەسەر ئەنتیکە نواند. هەروەها هەندێک شتی دیکە هەن کە سەر بە کایەی زانستن و لە بابل سەریانهەڵداوە: دابەشکردنی شەو و رۆژ بەسەر بیستوچوار سەعاتدا و بازنە بەسەر ۳٦۰ پلەدا، هاوکات ئاشـــکراکردنی ســـوورِەکانی ئەســـتێرەگیران، کە ئیتر مرۆڤ دەیتوانی بە جەختی پرۆگنۆز لەبارەی مانگگیران و هەتا رادەیەکی نزیکیش لەبارەی خۆرگیران دابنێت. پاشان دەبینین کە تاڵس ئەم شارەزاییە بابلییەی وەرگرت.

میســـر و میسۆپۆتامیا کولتوورێکی کشـــتیارییان هەبوو، بەڵام وڵاتانی دراوسێیان کولتوورێکی شوانییان هەبوو. ئینجا لەتەک پەرەسەندنی بازرگانیدا توخمێکی دیکە هاتە پاڵیان کە سەرەتا تەنیا لەســـەر رێگەی دەریا دەخرایە گەڕ: مرۆڤ هەتا نزیکەی ۱۰۰۰ی پ.ز. چەکی لە برۆنز دروست دەکرد، ئینجا ئەو گەلانە کە خاوەنی ئەو میتالە زەرووریيە نەبوون، دەبوو بەرِێی بازرگانی یان جەردەیەتیی دەریـــاوە پەیدای بکەن. بەڵام جەردەیەتیی دەریـــا یاریدەدەرێکی کاتی بوو. لە دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاســـیی تا رادەیەک سرەوتوودا بازرگانی ســـوودمەندتر بوو. لەوە دەچێت کە کرێتا لە بازرگانیدا رێچکەشکێن بوو بێت. نزیکەی یازدە سەدەی رەبەق، لە ۲۵۰۰ هەتا ۱٤۰۰ی پ.ز.، لە کرێتا کولتوورێکی باڵا بەناوی کولتووری «مینۆ»یی شکۆفەی کردبوو کە لە رووی هونەرییەوە لە ئاستێکی باڵادا بوو. ئەوەی لەم کولتوورە کرێتییە ماوەتەوە، هەســـتێک بێدار دەکاتەوە ســـەبارەت بە جۆش و نزیکەی رابواردنی دێکادێنت کە تەواو جیاوازن لە تاریکییە راچڵەکێنەرەکانی پەرســـتگەی میســـری. مرۆڤ هەتا هەڵکەندنەکانی سێر ئارسەر ئیڤانس و کەسانی دی نزیکەی هیچی لەبارەی ئەم کولتوورە بەو واتایـــە نەدەزانی. ئەوە کولتووری گەلێکی دەریایی بوو بە پەیوەندییەکی پتەوەوە لەتەک میســـردا — بێگومان نەک لە سەردەمی هیکسۆسەکاندا. لە داڕشتنە میسرییەکانەوە بەڕوونی دەردەکەوێت کە بازرگانیی نێوان میســـر و کرێتا لە دەستی دەریاوانە کرێتییەکاندا بوو و ئەم بازرگانییە لە دەوری ۱۵۰۰ی پ.ز. گەیشـــتە لوتکە. هەروەها پێدەچێت کە ئایینی کرێتا شێوە نزیکییەکی لە ئایینەکانی سوریا و ئاسیای بچووک هەبووبێت، بەڵام کرێتییەکان لە هونەردا پتر خۆیان بە میسرەوە پەیوەست دەکرد، جا گەرچی هونەرەکەی خۆیان زۆر رەسەن و پڕژین بوو. چەقی کولتووری کرێتی «کۆشکی مینۆس» بوو لە کنۆســـۆز. یادوەرییەکانی ئەو کۆشکە تەنانەت لە داستانەکانی گریکیای کلاسیکدا درێژە بە ژیانیان دەدەن. کۆشـــکەکانی کرێتا زۆر قەشـــەنگ بوون، بەڵام دەمەو کۆتایی ســـەدەی چوارەمـــی پێش زایيـــن وێران کران — پێدەچێت لە لایەن گریکی هێرشـــهێنەوە بۆ ئەوێ. داتەکانی مێژووی کرێتا بەڕێی دۆزراوە میسرییەکان لە کرێتا و دۆزراوە کرێتییەکان لە میسر حساب دەکرێن.

ئێمە لە زانینماندا بەرەهایی بەندین بە پارچە بەڵگەی ئارکیۆلۆژییەوە.

کرێتییەکان مێخودایەک، رەنگە چەند مێخودایەکیان دەپەرســـت، بەڵام بەدەگمەن دەشێت گومان لەوە بکرێت کە «خانمە ســـەروەری ئاژەڵان»، خانمە راوچییەک، هەبوو و پێدەچێت یەکەم فۆرمی «ئارتێمیس»[٢] ی کلاسیکی بێت. پێدەچێت کە ئەو هەر وەها دایک بووبێت. تاکە خودایەکی نێرینە کە لە تەنیشت «جەنابە سەروەری ئاژەڵان»ـەوەیە، کوڕە بچووکەکەی ئەو خانمەیە. پێدەچێت ئەوان بڕوایان بە ژیان لە ئەوجیهان هەبووبێت. لەوێ، وەک چۆن لە ئایینی میسریشدا، کردەوە جیهانییەکان پاداشـــت دەدرێنەوە یان ســـزا دەدرێن. گـــەر بەگوێرەی هونەرەکەیان بڕیـــار بدەین، ئەوا پێدەچێت کرێتییـــەکان وەک ســـەرجەم گەلێکی پڕجـــۆش بووبن و خورافیاتی تاریک هێنـــدە نەیئاڵۆزاندبن. ئەوان حەزیان لە شـــەڕی گا بوو و لەکاتی روودانیـــدا تۆرێیادۆری نێر و مێ هونەری ئەکرۆباتیکی سووڕهێنەریان ئەنجام دەدا. بەگوێرەی تێڕوانینی سێر ئارسەر ئیڤانس، شەڕی گا نواندنێکی ئایینی بوو، ئەو کەسانەش کە نواندنەکەیان ئەنجام دەدا، ئەندامانی باڵاترین توێژی بەگزادەیی بوون، بەڵام ئەم تێڕوانینە بەگشتی ناناسێنرێت. ئەو وێنانە کە بۆمان ماونەتەوە، زۆر زیندوو و ریالیستین.

کولتووری مینۆیی، پێش تێکشـــکاندنی، نزیکەی لە ١٦٠٠ی پ.ز. بەسەر گریکیای سەرکیشوەردا بڵاوبۆوە و پاشـــان، بە گۆڕانکاریـــی جیاوازەوە تێیدا، هەتا نزیکـــەی ٩٠٠ی پ.ز. لەوێ مایەوە. ئەم کولتوورەی سەرکیشـــوەر ناودەنرێت کولتووری «میکێنی» و بەناوبانگە بە گۆڕی پاشاکان و قەڵای ســـەر چیاکانەوە. پێدەچێت مرۆڤ لێرە زۆرتر لە کرێتا ترســـی لە جەنگ هەبووبێت. گۆڕ و شوورا کە ماونەتەوە، هێشـــتا هەر کاریگەرییان لەســـەر ئەندێشـــەی گریکیای کلاســـیکی دەنواند. ئیشە کۆنە هونەرییەکانی نێو کۆشـــکەکان کاری راســـتەقینەی کرێتین یان زۆر نزیکن لە ئیشە هونەریە کرێتییەکانـــەوە. ئەوە کە هۆمێـــر بۆمانی دەگێڕێتەوە، بریتییە لە کولتـــووری میکێنیی بینراو لە پەچەی داستانەوە.

بەڵام جەختییەک ســـەبارەت بە میکێنەکان نییە. ئایا سەرهەڵدانی کولتوورەکەیان بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتـــەوە، کە ئەوان لەلایەن کرێتییەکانەوە ژێرخـــران؟ ئایا میکێنەکان بە زمانی گریکی دەدوان یان رەچەڵەکێکی کۆنتری نیشـــتەجێیان هەبوو؟ ئێمە ناتوانین وەڵامێکی پوخت بۆ ئەم پرســـیارانە بدۆزینەوە، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت نزیک لە راســـتی گریمانە ســـەبارەت بەوە بکات، کە میکێنەکان داگیرکەری گریکزمان بوون و لایەنی کەم ئەریســـتۆکراتییەکەیان لە هێرشهێنانی بلۆند پێکهاتبوو، کە لە باکوورەوە هاتبوون و لەتەک خۆیاندا زمانی گریکییان هێنابوو.

گریکەکان بە سێ شەپۆلی دواییەکیدا هاتن بۆ گریکیا. سەرەتا «ئیۆنییەکان» هاتن، دوای ئەمان «ئاخێییەکان» و بەدووی ئەمانیشدا «دۆڕەکان» هاتن. پێدەچێت ئیونییەکان سەرجەم کولتووری کرێتییان وەرگرتبێت، هەروەک چۆن درەنگتر رۆمەکان کولتووری گریکییان وەرگرت. بەڵام ئیۆنییەکان لەلایـــەن ئاخێییەکانەوە، کە پاش خۆیان هاتن، تەنگپێهەڵچنران و موڵکەکانیان لێداگیرکرا. زانیاری ئێمە لەبارەی ئاخێییەکان دەگەڕێتەوە بۆ تاتەی هیتێتییەکان کە لە بۆگاستاکوێی دۆزرانەوە. بەپێی ئەم تاتانە ئاخێییەکان لە سەدەی چواردەیەمی پ.ز. خاوەنی دەوڵەتێکی بەهێز و رێکخراو بوون، بەڵام

لە کۆتاییدا کولتووری میکێنی کە بەهۆی جەنگەکانی نێوان ئیۆنی و ئاخێییەکانەوە لاواز بووبوو، لە لایەن دۆڕەکانەوە کە وەک دوایەمین هۆز گریکیایان داگیر کرد، تێکشکێندرا. بەڵام کاتێک داگیرکەرانی پێشین ئایینی مینۆییان وەرگرت، ئەوا دۆڕەکان بە پێچەوانەوە ئیمانی هیندۆجەرمانیانەی خۆیانیان پاراست. سەرباری ئەمە هێشتا هەر ئایینی سەردەمی میکێنی بەلاوازی لە ژیاندا مابوو، بەتایبەتی لەنێو توێژەکانی خوارەوەدا. ئایینی گریکیای سەردەمی کلاسیکی تێکەڵێک بوو لە هەردووکیان. هەندێک مێخودا بەڕاستی سەرچاوەیەکی میکێنییان هەیە.

گەرچی ئەو دارشتنەی سەرەوە تەنیا ئەگەرییە، بەڵام دەبێت ئەوە بهێنینەوە یاد کە ئێمە نازانین داخۆ میکێنەکان گریک بوون یان نا. ئێمە ئەوەندە دەزانین کە کولتووری میکێنی داوەشا، ئینجا لەکاتی کوژانەوەیدا ئاسن جێی بە برۆنز لێژکرد و سەروەریی بەسەر دەریادا کەوتە دەستی فینیسیەکانەوە.

لە نزیکەی کۆتایی سەردەمی میکێنەکان و کەمێک درەنگتردا بڕێکی هاتووەکان وەک کشتیار نیشتەجێ بوون، بڕێکی دیکەیان بەردەوامییان بە کۆچەکەیان دا، ئەمان سەرەتا رۆیشتن بۆ سەر دورگەکان و ئاسیای بچووک، پاشان رووەو سیسیلیا و باشووری ئیتالیا. ئەمان شاری نوێیان دروستکرد و بە بازرگانیی دەریا دەژیان. گریکەکان بەتایبەتی لەم شارانەی سەر رۆخی دەریادا هەنگاویان نا بۆ ئەوەی شتێکی نوێ لە رووی چۆنێتییەوە ئەنجام بدەن. ئەسینا لە سەردەمێکی درەنگتردا پایەگایەکی پێشینەیی بەدەستهێنا، پایەگایەک کە بە هەمان شێوە پابەند بوو بەو هەلە دەریاییەوە کە بۆی هەڵکەوتبوو.

گریکیای سەر کیشوەر شاخاوییە و زۆرینەی خاکەکەی بێپیتە، شاخەکان رێگرن لە گوێزانەوەی ئاسان بەنێو وڵاتدا، بەڵام ژمارەیەکی فرە دۆڵی بەپیت هەن کە رووەو دەریا درێژ دەبنەوە. لەنێو ئەم دۆڵانەدا کۆمەڵی بچووکی داخراو سەریانهەڵدا کە بە کشتیاری دەژیان، هەر کۆمەڵە گوندێکیش دەوری شارێکی نزیکیان لە رۆخی دەریاوە دابوو. کێ نەیتوانیایە بەهۆی پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتوان و تێپەڕکردنی لە سەرچاوە خۆییەکانی دابینکردنی گوزەران بژێوی خۆی لە گوند دابین بکات، ناچار بوو واز لە کشتیاری بهێنێت و ببێت بە دەریاوان. شارەکانی سەر کیشوەر زۆر جار لەو شوێنانەنەدا کۆلۆنییان دادەمەزراند، کە تێیاندا دابینکردنی گوزەران زۆر ئاسانتر بوو وەک لە گوند. بۆیە لە زووترین قۆناغەکانی مێژوودا گریکەکانی ئاسیای بچووک و سیسیلیا و ئیتالیا دەوڵەمەندتر بوون لە گریکەکانی گریکیای سەر کیشوەر.

رێکخراوی کۆمەڵایەتیی ناوچە جیاکانی گریکیا لە یەکتری جیاواز بوون. لە سپارتا چینێکی بچووکی ئەریستۆکراتی هەبوو و بە کاری ئەو کۆیلانە دەژیا کە لە هۆزەکانی دیکە گیرابوون. دانیشتوانی ناوچە هەژارترە کشتیارییەکان بەتایبەتی لە کشتیاران پێکهاتبوون کە بە یاریدەی خێزانەکانیان کاریان دەکرد. بەڵام لەو شوێنانە کە بازرگانی و پیشەسازی گەشانەوە، هاووڵاتییە ئازادەکان دەوڵەمەند بوون، چونکە کاریان بە کۆیلە دەکرد: پیاوانی کۆیلەیان لە کانەکان و ژنەکانیان لە چنیندا دەخستە کار. ئەم کۆیلانە لە ئیۆنیا خەڵکی وڵاتە بەربەرییە دراوسێکان بوون کە سەرەتا

بەرێی جەنگەوە دەگیران و دەکران بە کۆیلە، ئینجا لەتەک بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەراندا دابڕانی ژنە سومعەدارەکانیش پەرەی سەند، ئەمەش بە چەشنێک کە ئیتر ئەوان لە سەردەمی درەنگتردا بەشدارییەکی کەمیان لە ژیانی کولتووریی گریکیدا کرد- جگە لە سپارتا و لێسپۆس.

بەگشتی رەوتی گۆڕانەکە بە شێوەیەک بوو کە سەرەتا دەسەڵاتداریی مۆنارشی دامەزرا و بەدوویدا دەسەڵاتداریی ئەریستۆکراتی هات، پاشان دەسەڵاتدارییەکانی تیرانیس و دیمۆکراتی جێگۆڕکێیان بە یەکتری دەکرد. بێگومان پاشاکان دەسەڵاتێکی رەهایان نەبوو (وەک لە میسر و بابل)، بەڵکو دەبوو راوێژ بە شورایەکی پیران بکەن و بۆیان نەبوو بە پێچەوانەی ئادەتەکانەوە هەڵوێست وەربگرن - گەر ئەمەیان بکردایە، ئەوسا سزا دەدران.

بێگومان تیرانیس واتای دەسەڵاتدارییەکی خراپی نەدەگەیاند، بەڵکو تەنیا واتای دەسەڵاتداریی یەک پیاوی دەگەیاند کە مافی نەبوو داواکاریی بۆ جێگرتنەوەی دەسەڵاتەکەی بەرزبکاتەوە. هەروەها دێمۆکراتی واتای دەسەڵاتی هەموو هاوولاتیانی دەگەیاند، بێگومان بەدەر لە ژنان و کۆیلەکان. تیرانەکان، بە هەمان شێوەی مێدیچی، سەرەتا بەهۆی رەچەڵەکیانەوە بە دەسەڵات دەگەیشتن، واتا بەو هۆیەوە کە ئەوان ئەندامی خێزانە دەوڵەمەندەکان بوون، سەرچاوەی سامانی ئەم خێزانانەش بەزۆریی دەگەڕایەوە بۆ کانەکانی ئاڵتون و زیو، ئینجا دوای ئەوە کە لەو دوو میتالە دراو لێدرا، ئیتر ئەو کانانە سامانی زیاتریان بۆ دەخستنەوە. ئەم سیستەمەی پارەی کانزایی ماوەیەکی کورت پێش ۷۰۰ی پ.ز. لە لیدیای دراوسێی ئیۆنیا گۆڕرا.

یەکێک لە گرنگترین سەرەنجامەکانی بازرگانی و جەردەیەتیی دەریا (کە سەرەتا بەدەگمەن جیاوازی لە نێوانیاندا دەکرا) ئەوە بوو کە گریکەکان فێری نووسین بوون. بێگومان چەند هەزار ساڵێک لەوەوبەر «خەت»ی نووسین لە میسر و بابل هەبوو، هەروەها کرێتییە مینۆییەکانیش خاوەنی خەت بوون کە هەتا ئەمرۆ رووننەکراوەتەوە، بەڵام هەتا ئێستا ئاشکرا نییە کە داخۆ گریکەکان پێش سەدەی دەیەمی پ.ز. خاوەنی خەت بووبن. گریکەکان لە فینیسیەکانەوە فێری هونەری نووسین بوون، فینیسییەکان خۆیشیان وەک دانیشتوانی سوریا لەژێر کاریگەریی میسر و بابلدا بوون، هەروەها ئەوان هەتا گەشانەوەی شارە گریکیەکانی ئیۆنیا و ئیتالیا و سیسیلیا رابەری بازرگانیی دەریا بوون. لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا سووریەکان هێشتا هەر بە خەتی مسماریی بابلی نامەیان بۆ ئەخناتۆن (پاشا گومراکەی میسر) دەنووسی، بەڵام بە پێچەوانەوە هیرام ی تیروسی (۹٦۹-۹۳٦ پ.ز.) ئەلفبێی فینیسیی بەکاردەهێنا. پێدەچێت خودی ئەم ئەلفبێیە لە خەتی میسرییەوە گۆڕانیپێدرابێت. میسرییەکان سەرەتا خەتێکی وێنەییان بەکاردەهێنا و وێنەکان هێدی هێدی بوون بوون بە باو. ئەو وێنانە بۆ دیاریکردنی رەگی وشە بەکاردەهێنران (یەکەم رەگی ناوی شتە داڕێژراوەکان) کە پاشان گۆڕانیان تێدا کراو و بوون بە پیتی پەتی[۳]. ئەوە فینیسیەکان بوون نەک میسریەکان کە بەوپەڕی بڕواوە ئەم گۆڕانەی دواییان ئەنجام دا و لێوەی ئەلفبێ بە هەموو سوودەکانیەوە سەریهەڵدا. گریکەکان ئەم ئەلفبێیەیان لە فینیسیەکان وەرگرت و لەتەک زمانەکەی خۆیاندا گونجاندیان، واتا ڤۆکالی زمانەکەی خۆیانیان هێنایە نێویەوە. پێشتر تەنیا کۆنسۆنانت

لەنێو ئەم ئەلفبێ فینیسـیـیەدا هەبوو. هیچ گومانی تێدا نییە کە دانانی ئەم شـێوازە ئاسـانترەی نووسین گۆڕی دا بە گەشانەوەی کولتووری گریکی.

هۆمێـر یەکەم بەرهەمە لە گۆڕانی کولتووری گریکیدا. مرۆڤ ناچارە سـەبارەت بە (سـەرجەم هۆمێر) پشت بە مەزەنە ببەستێت، لێرەشدا مرۆڤ بەگشتی لەو بڕوایەدایە کە کێشەی هۆمێر هێندی ریزێک هۆنەرە نەک یەک تاکە هۆنەر. لەم جۆرە تێگەیشـتنەدا میانەیەکی نزیکەی دووسـەد ساڵی لە نێوان تەواوبوونی ئیلیاس و تەواوبوونی ئۆدیسـێدا هەیە، ئەم ساڵانەش دەکەونە نێوان ٧٥٠- ٥٥٠ ی پ.ز. هەندێـک توێژەری دی لەو بڕوایەدان کە (هۆمێر) نزیکەی لە کۆتایی سـەدەی هەشـتەمدا تەواو بووە. پیزیستراتوس، کە لە نێوان ٥٦٠-٥٢٧ پ.ز. دەسەڵاتدار بوو، هۆنراوەکانی هۆمێری (لەم فۆرمەی ئەمڕۆیاندا) برد بۆ ئەسینا. ئیدی لەم کاتە بەدواوە لاوانی ئەسینا ئیشەکەی هۆمێریان دەرخ دەکرد، ئەمەش شـێوازێک بوو کە لە وانەکانیاندا زۆرترین گرنگیی پێدەدرا. بەڵام هۆمێر لە هەندێک ناوچەی دیکەدا، بەتایبەتی لە سپارتا، درەنگتر واتایەکی بەم چەشنەی وەرگرت.

ئیشەکانی هۆمێر، بە هەمان شێوەی ئێپۆسە کۆشکییەکانی کۆتایی چەرخی ناڤین، نوێنەرایەتیی روانگە هۆشەکییەکانی ئەریستۆکراسـیی ژیاریێنراو (کولتیڤەکراو) دەکەن، ئەریستۆکراسییەک کە خورافیاتەکانی نێو گەلی بە شتی هەڕەمەکی دادەنا و ڕەتیدەکردەوە. بڕێکی زۆر لەم خورافیاتە لە سـەردەمی درەنگتردا دەرکەوتەوە. ژمارەیەکی فرە نووسەرانی مۆدێرن کە پشتیان بە ئەنترۆپۆلۆژی دەبەست، گەیشتن بەو بڕوایە کە بە هیچ شێوەیەک هۆمێر پریمیتیڤ نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە هاوشـێوەی رۆشنگەرێکی سـەدەی هەژدەیەم کاری پاکژێنەری لە میتۆسەکانی ئەنتیکەدا کردووە و بەمـەش ئەو بریتی بـووە لە نوێنەری ئیدیالەکانی توێژی سـەرەوەی کۆمەڵ. خوداکانی ئۆلومپ کە لەلای هۆمێر نوێنەری ئایین بوون، لەلای گریکەکان نە لە سـەردەمی هۆمێر و نە لە سـەردەمی درەنگتردا بابەتی رەهای پەرسـتن بوون، بەڵام لە ئیمانی گەلدا توخمی تاریکتر و دڕتر هەبوون کە بێگومان رۆشنبیرانی گریک هەتا رادەی شیان دژایەتییان دەکردن، بەڵام سەرباری ئەمە ئەم توخمانە هێشـتا هەر خۆیان مەڵاس دابوو بۆ ئەوەی لە سـاتەکانی لاوازی یان ترسدا دەربپەڕن. لە سەردەمی داوەشـانەکەدا دەرکەوت کە ئەو بڕوا ئایینیانەی پێشـتر هۆمێر وازی لێنهێنابوون، هێشتا هەر لە سەردەمی کلاسیکیدا بە نیمچە داوەشاوی مابوونەوە. ئەمە هەندێک شت روون دەکاتەوە، کە ئەگەر لە حاڵەتی دیکەدا باس بکرێن، دژبێژ و سووڕهێنەر دەنوێنن.

ئایینـی پریمیتیـڤ لە هەمـوو لایەک مەسـەلەی هۆز بوو نەک تـاک. وەک کـرداری ئایینی سـروتگەلی تایبەتی ئەنجام دەدران بۆ ئەوەی بەڕێی جادووی رێزمەندەوە (سەمپاتیکەوە) شکۆفە بە بەرژەوەندییەکانی هۆز بدرێت، ئەمەش بەتایبەتی بە پیتیی رووەک و ئاژەڵ و مرۆڤی دەگرتەوە. هەروەها گەرەک بوو خۆر لە کاتی وەرچەرخانی زستانەیدا ببزوێنرێت تاوەکو لە هێزی کەم نەکات، هـاوکات بەهار و پاییز ئاهەنگـی تایبەتمەندیان گەرەک بوو و ئـەم ئاهەنگانە زۆر جار هەژانێکی (ئێکستازێکی) باڵای کۆمەڵایەتییان بە شێوەیەکی ئەوتۆ دەهێنایە گۆڕێ، کە ئیتر تاکەکان هەستی تاکێتیی خۆیانیان بزر دەکرد و خۆیان وەک یەکانگیر لەتەک سـەرجەم هۆزەکەیاندا هەستپێدەکرد.

لــە هەموو جێیەکی جیهاندا، لە قۆناغێکی تایبەتیــی گۆڕانی ئایینیدا، ئاژەڵ و مرۆڤی پیرۆزێندراو بەئاهەنگەوە دەکران بە قوربانی و دەخوران. وڵاتە جیاکان لە ســەردەمی تەواو جیاوازدا چوونە نێو ئــەم قۆناغەوە. بــەڵام بەقوربانیکردنی مرۆڤ ماوەیەکی درێژتری خایانــد وەک لە خواردنی مرۆڤی بەقوربانیکــراو. ئەمە لە گریکیا تەنانەت لە ســەرەتای کاتی مێژووییدا هێشــتا هەر لەگۆڕێدابوو. ســروتی بەپیتی، بەبێ ئەو جــۆرە مۆرکە بەزەبرانە، لە ســەرجەم گریکیادا باو بــوو. بەتایبەتی پەرجووەکانی ئیلیۆزیا سیمبۆلێکی کشتیارییان هەبوو.

ئێمە دەبێت بیدرکێنین کە ئایین لەلای هۆمێر هێندە ئایینی نییە. خوداکان ئەوپەڕی مرۆڤین و تەنیا بەڕێی نەمری و هێزی سەرمرۆڤییانەوە لە مرۆڤ جیا دەبنەوە. لە رووی مۆرالییەوە بڕوانین، ناتوانین هیچ شتێک بەسوودی ئەوان بدێژین، ئەوەش زۆر کەم شیاوی تێگەیشتنە کە بۆچی گریکەکان ئەوەندە رێزیان لێدەگرتن (verehrt). پێدەچێت لە هەندێک جێدا، رەنگە لە پێوەنانەکانی سەردەمانی درەنگتردا، بە بێڕێزیی ڤۆڵتێریانە مامەڵەیان لەتەکدا کرابێت. بەڵام هەســتی راســتەقینەی ئایینی لەلای هۆمێر کەمتر رووەدەکاتە خوداکانــی ئۆلومپ، بەڵکو پتر رووەدەکاتە چییەتییە تاریکترەکانی وەک «قەدەر»، «زەروورە» یان «بەڵا». ئەمانە ئەو چییەتیانەن کە تەنانەت زیۆس لەژێر رکێفیاندا بوو. قەدەر کاریگەریی لەســەر ســەرجەم هزری گریکی نواند. پێدەچێت لەمەوە بووبێت کە زانست بڕوای بە یاسایەکی سروشتی هێنابێت.

خوداکانــی هۆمێر بریتی بــوون لە خودایەتیی ئەریســتۆکراتییەکی ســەرکەوتوو نەک خودای ســوودمەندی و بەپیتی بۆ ئەو مرۆڤانە کە بەڕاســتی خەریکی کشــتیاری بوون. جیلبەرت مورای دەبێژێت:

«خوداکانــی زۆرینەی گەلان دەبێژن، کە ئــەوان جیهانیان خولقاندووە، بەڵام ئۆلومپییەکان ئەم داواکارییــە بەرزناکەنەوە. ئەوان ئەوپەڕی جیهانیان داگیرکردووە (...)، ئینجا ئێســتا ئەوان، دوای ئەوەی جیهانیان داگیرکردووە، چی دەکەن؟ ئایا خۆیان بە حکومەتەوە خەریک دەکەن؟ ئایا پشتیوانی شــکۆفەی کشتیاری دەکەن؟ ئایا خەریکی بازرگانی و پیشەسازین؟ نەخێر، هیچ کام لەمانە ناکەن. لەبەر چ هۆیەک دەبێت ئەوان هەر جۆرە کارێکی سەرڕاســتانە ئەنجام بدەن؟ بۆ ئەوان زۆر خۆشترە بە داهاتەکانیان بژین و بە تاڵی بروســکەکانیان ســزای ئەو کەســانە بدەن کە پارە نادەن. ئەوان سەرۆک چەتەی سەرکەوتوون، رووتێنەرەوەی پادشایین، ئەوان شەڕ دەکەن و دەخۆن، گەمان دەکەن و موزیک دەژەنن، ئەوان بە قەڕابە مەی دەنۆشن و قاقا بەو ئاسنگەرە شەلە پێدەکەنن کە خزمەتیان دەکات. هەروەها ئەوان هەرگیز درۆ ناکەن، لە حاڵەتی خۆشەویستی و جەنگدا نەبێت»[٤].

ســەرجەم ئیشــەکەی هۆمێر بەرهەمی ئیۆنیا بوو کە بەشــێکی ئاســیای بچووکــی هێلێنی و دوورگەکانی دراوســێی بوو. پێدەچێت لە کاتێکدا، درەنگترین کات لە میانەی ســەدەی شەشــەمی پێش زایینیدا، هۆنراوەکانی ئەو لە فۆرمی ئەمڕۆییاندا تۆمار کرابن. بەڵام هەر لە رەوتی ئەم سەدەیەدا بوو کە زانست و فەلسەفە و ماتماتیکی گریکی سەریانهەڵدا. هاوکات لە بەشەکانی دیکەی جیهاندا رووداوی دیکەی پڕواتا دەرکەوتن: کۆنفوشــیوس، بودا، زەردەشــت، کە گەر بەڕاستی هەبووبن، ئەوا

سەر بەم سەدەیەن[٥]. کۆرش لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمدا دەوڵەتی فارسیی دامەزراند. لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا شارە گریکییەکانی ئیۆنیا کە فارسەکان ئۆتۆنۆمییەکی سنووردارییان پێدابوون، ڕاپەڕینێکی بێئاکامییان ئەنجام دا و داریوش دایمرکاندەوە. سەرەنجامی ئەم ڕووداوە ئەوە بوو کە باشترین پیاوانی ئەو شارانە نەفی کران. چەند فەیلەسوفێکی ئەم قۆناغە کەسانی هەڵاتوو بوون کە لە بەشە هێشتا داگیرنەکراوەکانی جیهانی هێلێنیدا لە شارەوە بۆ شار دەگەڕان، لەم ڕەوتەشدا ئەو کولتوورەیان بڵاو دەکردەوە کە هەتا ئەو دەمە بەتایبەتی بە ئیۆنیاوە پابەند مابۆوە. گریکەکانی ئەو شارە هێشتا ئازادانە مامەڵەیەکی ڕێزمەندیان لەگەڵ ئەو فەیلەسوفە هەڵاتووانەدا دەکرد. کسێنۆفانێس کە خۆیشی هەڵاتوویەک بوو و سەرەتای سەدەی شەشەم هێشتا لە هەرەتی گەنجێتیدا بوو، دەبێژێت: «کاتی زستان، لە دەم ئاگرداندا، کاتێک مرۆڤ بەتێری لەسەر جێگەی نەرم ڕاکشاوە، بەدەم خواردنەوەی شەرابی شیرین و کرماندنی نۆکەوە گفتوگۆ سەرهەڵدەدات. ئەرێ تۆی نێو پیاوان کێیت و لە کێیت؟ ئەرێ بەڕێزترینم، تۆ چەند ساڵانیت؟ تەمەنت چەند بوو کاتێک میدییەکە هات؟»[٦]. بەڵام باقییەکەی دیکەی گریکیا سەرکەوتووانە لە شەڕەکانی سالامیس و پلاتێیدا بەرگریی لە سەربەخۆییەکەی دەکرد، کە ئیتر پاشان ئیۆنیا بەدووی ئەم شەڕانەدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئازاد بوو[٧].

گریکیا لە ژمارەیەکی فرە دەوڵەتی بچووکی سەربەخۆ پێکهاتبوو و هەر دەوڵەتێک پێکهاتبوو لە شارێک و برێک ناوچەی کشتیاری بە دەوریدا. بەشە جیاوازەکانی جیهانی گریکی ئاستی تەواو جیاوازی کولتوورییان هەبوو و تەنیا کەمینەیەکی ئەم شارەدەوڵەتانە ڕۆڵێکی لە سەرجەم بەدیهێنانە (کولتوورییە — و) گریکییەکەدا گێڕا. سپارتا کە پاشان زۆرتر لەبارەی دەدوێین، دەوڵەتێکی سەربازی بوو، بەڵام لە ڕووی کولتوورییەوە بەواتا نەبوو. کۆرینت، کە سەنتەرێکی گەورەی بازرگانی بوو، دەوڵەمەند و گەشاوە بوو، بەڵام پیاوانی هێندە مەزنی نەهێنایە ئاراوە.

هەروەها گوندەدەوڵەت هەبوون کە تەنیا خەریکی کشتیاری بوون، وەک بۆ نموونە (بە واتای وشە) ئەرکادیا، کە شارنشینەکان وەک نموونەی ئارامی پێشبینیان دەکرد، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت هێشتا هەر لەنێو بەربەرییزمە بەزەبرەکانی ئەنتیکەدا نقووم بوو بوو.

دانیشتوان هێرمێس و پانیان دەپەرست و کۆمەڵێک کولتیان بۆ بەپیتی هەبوو، لێرەشدا زۆر جار تەنیا کۆڵەکەیەکی زبر داتاشراو لەبریی بتی خوداکە دادەنرا. بزن سیمبۆلی بەپیتی بوو، چونکە دانیشتوانی گوند ئەوەندە هەژار بوون کە نەیاندەتوانی گا ڕابگرن. کاتێک ئالیک کەم دەبۆوە، بتەکەی پان تێهەڵدانی دەخوارد (شتێکی بەم چەشنە ئەمڕۆش لە گوندە کەلاکەوتووە چینییەکاندا ڕوو دەدات). هەروەها هۆزێکی پێکهاتوو لە مرۆڤەگورگ (وێرۆلف) هەبوو کە پێدەچێت پەیوەست بوو بێت بە قوربانیدانی مرۆڤ و کەنیبالیزمەوە. مرۆڤ لەو باوەڕەدا بوو کە هەر کەس یەک جار چێژی مرۆڤێکی قوربانیکراوی بکردایە، ئیتر دەبوو بە مرۆڤەگورگ. هەروەها ئەشکەوتێک هەبوو کە بۆ زیۆس لیکایۆس (زیوس-گورگ) پیرۆزێندرابوو؛ هیچ کەسێک لەنێو ئەم ئەشکەوتەدا سێبەری نەدەخستەوە و کێ بچووایەتە نێوییەوە، لە ماوەی ساڵێکدا دەمرد. سەرجەمی ئەم خورافیاتە

تەنانەت لە سەردەمی کلاسیکیدا هێشتا هەر لە برەودا بوو[٨].

وەک هەندێک دەبێژن، ناوی پان لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە پائۆن (Paon) کە نزیکەی واتای دابینکەری بژێوی یان شوان دەگەیەنێت. کاتێک ئەسیناش لە سەدەی پێنجەمدا دوای جەنگی فارسەکان کەوتە پەرستنی پان، ئیتر ئەو ناوەی لێنرا کە وەک «خودا-مەزن» پەسەن دەکرێت[٩].

بەڵام لە گریکیای کۆندا زۆر شتی دیکە هەبوون کە دەتوانین وەک ئایین لە مەغزای خۆماندا هەستیان پێبکەین. ئەمیان پەیوەست نەبوو بە ئۆلومپییەکانەوە، بەڵکو بەند بوو بە دیۆنیسۆس یان باکخوسەوە، کە ئێمە زۆر جار وەک خودای شەراب و مەستی پێشبینیی دەکەین. بەڵام ئەوە زۆر جێی سەرنجە کە چۆن لە پەرستنی ئەم خودایەوە میستیسیزمێکی قووڵ سەری هەڵدا کە کاری کردە سەر زۆر فەیلەسوف و تەنانەت رۆڵێکی بۆ سەرهەڵدانی ئایینی کریستیانی گێڕا. کێ بیەوێت دیراسەی گۆڕانی هزری گریکی بکات، دەبێت بێ چەند و چوون ئەمە بزانێت.

دیۆنیسۆس یان باکخوس لە بنەڕەتدا خودایەکی تراکیا بوو. تراکیاییەکان زۆر کەمتر لە گریکەکان ژیارێندرابوون (kultiviert). گریکەکان ئەوانیان وەک بەربەر دەبینی. تراکییەکان وەک هەموو گەلە پریمیتیڤەکان کە بە کشتیارییەوە خەریکن، کولتی تایبەتییان بۆ بەپیتی و خودایەکیان هەبوو کە پشتگیریی برەوی دەکرد. ناوی ئەو خودایە باکخوس بوو. بەڵام بەتەواوی روون نەبۆتەوە کە داخۆ باکخوس شێوەی پیاوێک یان گایەکی هەبووبێت. دوای ئەوە کە تراکییەکان هونەری تەخەموری بیرەیان دۆزییەوە، ئیتر مەستییان بە شتێکی خودایانە دەزانی و لەبەر ئەم هۆیە باکخوسیان دەپەرست. ئینجا دوای ئەوە کە ئەوان درەنگتر شەرابیان ناسی و فێری خواردنەوەی بوون، ئیتر نرخێکی باڵاتریان بە باکخوس دا. ئێستا لە باکخوسدا کەمتر پشتگیریکەرێکی بەپیتی دەبینرا، بەڵکو بە پێچەوانەوە وەک ئەو خودایە دەبینرا کە ترێ و مەستیی خودایانە دەخاتەوە، ئەویش لەو شێوەیەدا کە شەراب دەیهێنێتە گۆڕێ.

ئەوە نەزانراوە کە لە چ سەردەمێکدا پەرستنی باکخوس لە تراکیاوە پەڕییەوە بۆ گریکیا، بەڵام پێدەچێت ئەمە ماوەیەکی کورت پێش سەرەتای حسابکردنی مێژووییانەی کات بووبێت. بێگومان کولتی باکخوس لە لایەن ئۆرتۆدۆکسەکانەوە بەرهەڵستی کرا، بەڵام سەرباری ئەمە خۆی لە گریکیا سەپاند. ئەم کولتە زۆر توخمی بەربەرییانەی تێدا بوو، بۆ نموونە ئاژەڵی بەرەڵا (ماڵینەکراو — و) پارچە پارچە دەکرا و بەکاڵی دەخورا. هەروەها ئەم کولتە سیمایەکی مێیینەیی سەیری لە خۆ گرتبوو. پیرەژنان و کیژانی بەئابرووی جەزمبوو بەدەم سەماوە، لە کۆمەڵی فراواندا چەندین شەویان لەسەر گردەکان بەسەر دەبرد. پێدەچێت ئەم مەستییە تا رادەیەک سروشتێکی ئەلکوهولییانەی هەبووبێت، بەڵام لە بنەڕەتدا بەتایبەتی سروشتێکی میستیکییانەی هەبوو. مێردەکان گرنگییان بەم خووە نەدەدا، بەڵام نەیان دەوێرا لە مەسەلە ئایینییەکاندا بەرهەڵستی بنوێنن. یۆریپیدێس لە شانۆنامەی «باکخەکان»دا پیشانی داوین کە ئەم سروتە چەند جوان و هاوکات بەزەبر بوو.

ئەوە بە هیچ شێوەیەک مایەی سوڕمان نییە کە بۆچی دیۆنیسۆس بە خۆشییەوە لە گریکیا وەرگیرا. ئاخر گریکەکانیش، لایەنی کەم بەشێکیان، وەک سەرجەم ئەو گەلانە کە خێرا لە رووی

کولتوورییەوە گۆڕراون، ڕەهەندێکی تایبەتییان بۆ شـــتی پریمیتیڤ هەبوو. ئەوان تاســـەی شێوازە ژیانێکی ڕەمەکیانەتر و ســـۆزمەندانەتریان لەو ژیانە دەکرد کە ڕێنوما ســـەروەرەکانی مۆرال ڕێیان پێـــدەدا. ئاوەزمەندبوون بۆ ئەو پیاوانـــە یان ئەو ژنانە کە ناچارن جیاواز لە هەســـتکردنی خۆیان ڕەفتار بنوێنن، شـــتێکی پڕئەرکە، ڕەوشت لە حاڵەتێکی بەم چەشنەدا وەک بارێک و وەک کۆیلەتی هەســـتپێدەکرێت، ئەمەش دەبێت بە پاڵهێزی پەرچەکردار لە هزرین و هەستکردن و ڕەفتارنواندندا. لـــە خـــوارەوە بەتایبەتی بە پەرچەکردارەوە لە هزریندا خەریک دەبین، بەڵام جارێ گەرەکە شـــتێک سەبارەت بە پەرچەکردار لە هەستکردن و ڕەفتارنواندندا ببێژین.

مرۆڤی ژیارییێنراو بەڕێی «حەزەر»ەوە لە وەحشـــی جیا دەبێتەوە، یان — بە تێگەیەکی فراوانتر — بەڕێی مشـــوورەوە. مرۆڤی ژیارییێنراو بە ویســـتی ئازادی خۆی موعاناتی هەنووکەیی بۆ خاتری شـــادیی ئایندەیی قبووڵ دەکات، جا گەر تەنانەت ئەو شـــادییە ئایندەییانە زۆر دوور بن. بێگومان دوای ئەوە کە مرۆڤ دەســـتی دایە چاندن، ئەم هەڵوێســـتەش واتای پەیدا کرد. هیچ ئاژەڵێک و هیچ وەحشییەک لە بەهاردا کار ناکات بۆ ئەوەی لە زستانی ئایندەدا شتێکی بۆ خواردن هەبێت، بێگومان هەندێک دەگمەنە فۆرمی کرداری ڕەمەکیانەی لێدەربچێت کە لەم حاڵەتەدا شـــازن، وەک بۆ نموونە گەر هەنگ هەنگوین ڕۆبکات یان سمۆرە گوێز بشارێتەوە. بەڵام مەسەلەکە لەم حاڵەتانەدا بەند نییە بە مشووری ئاگامەندەوە، بەڵکو بەندە بە ڕەمەکی ڕاستەوخۆوە بۆ ئەوە، کە شتێک بکرێت و ڕەنگە درەنگتر، لایەنی کەم لە ڕەچاوی مرۆڤەوە، سودمەند بێت. بەڵام بە پێچەوانەوە مشووری ڕاستەقینە ئەو کاتە هەیە، گەر مرۆڤێک شتێک بکات بەبێ ئەوەی بۆ ئەو کردارە پاڵی پێوەنرابێت، بەڵکو ئەو ئەنجامی دەدات، چونکە زەینی پێی دەڵێت کە ئەو لە کاتێکی درەنگتردا سوودی لێدەبینێت. مەرجی ڕاو بریتـــی نییە لە مشـــوور، چونکە ڕاوکردن حەزە، بە پێچەوانـــەوە کێڵانی زەوی بریتییە لە کار و ناشێت لە ڕەمەکی سپۆنتانەوە ئەنجام بدرێت.

کولتوور نەک تەنیا بەڕێی مشـــوورەوە کە زەبرێکە و لە خۆ دەکرێت، ئاســـتەنگ بۆ ڕەمەکەکان دادەنێـــت، بەڵکو هەروەها بەڕێی یاســـا و نەرێـــت و ئایینەوە. کولتوور ئەم ئاســـتەنگدانانەی لە بەربەرێتییـــەوە وەک میرات بـــۆ ماوەتەوە، بەڵام ئەمە ئێســـتا لەلای کولتوور کەمتـــر ڕەمەکییانە ڕوو دەدات، بەڵکو بەزۆریی بە شـــێوەیەکی سیســـتەماتیکیتر. هەندێک کرداری تایبەتی وەک تاوان دادەنرێـــن و ســـزا دەدرێن؛ کـــرداری دیکە هەن کە ســـزا نادرێن، بەڵام بە خـــراپ دادەنرێن و دەبن بەهـــۆی بێزرانی کۆمەڵایەتییانەی تاوانباران. ئینجا لەتەک خاوەندارییی تایبەتیدا چەوســـانەوەی ژن دێتە گۆڕێ و ســـتاندی کۆیلەکان سەرهەڵدەدات؛ لە لایەک بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت بەسەر کەسی تاکدا دەسەپێنرێن، لە لایەکی دی کەسی تاک، کە فێر بووە لە ژیانی وەک سەرجەم بڕوانێت، هەتا ڕادەیەکی زۆر ئامادەی خۆی دەکات بە قوربانیی ئایندە.

دیارە مرۆڤ دەتوانێت موبالەغە لەم مشوورەدا بکات، وەک بۆ نموونە کەسی ڕەزیل. بەڵام مشوور، بەبێ ئەوەی مرۆڤ ئەم هەڵوێســـتە تونـــدەی ڕەزیلیش وەربگرێت، دەتوانێت ببێت بەهۆی دۆڕاندنی هەندێک لە جوانترین شـــتەکانی ژیان. بەڵام کێ دیۆنیســـۆس بپەرستێت، ئەو کەسە بە پێچەوانەی

مشـــوورەوە کردار دەنوێنێت: ئەو کەسە لەنێو مەستیی جەستەیی و هۆشەکیدا دیسان بە چڕێتیی ئەو هەستکردنە دەگاتەوە کە ئەو بەهۆی مشوورەوە بزری کردبوو؛ ئەو کەسە دیسان شادی و جوانیی جیهان ئاشکرا دەکاتەوە، ئەندێشەی ئەو کتوپڕ لە کۆتەکانی پێشبڕیاری ڕۆژانە ئازاد بووە. سروتی باکخوس ئەوەی بەرەڵا کرد کە ناو دەنرێت «هەژان» (ئێنتهوســـیازم). واتای ئەم وشـــەیە لە رووی ئێتیمۆلۆژییەوە ئەوەیە کە خودا دەچێتە نێو پەرستەرەوە، ئەمەش بە چەشنێک کە ئیتر ئەو باوەڕ دەکات لەتەک خودادا یەکانگیر بووە. ئێمە لە زۆر باڵاترین بەدیهێنانی مرۆڤدا توخمێکی تایبەتیی مەستی (Rausch) دەبینینەوە[10]. لێرەدا سۆز یەکسەر سەروەری بەسەر مشووردا دەنوێنێت. ژیان بەبێ توخمی باکخوســـیانە بێجۆش دەبوو، بەڵام لەتەک ئەو توخمەدا پڕمەترســـی دەبێت. مشـــوور لەدژی سۆز — ئەم ناکۆکییە بەنێو سەرجەم مێژووی جیهاندا درێژ دەبێتەوە. بەڵام مەسەلەکە لێرەدا بەندە بە ناکۆکییەکەوە کە ناتوانین پابەند پێوەی هەڵوێستێکی تەواو یەکلایەنی وەربگرین.

کولتووری ژێر ڕکێفی ئاوەز لە جیهانی هزردا نزیکەی هاوواتایە بە زانســـت. بەڵام زانستی پەتی ساتارکەر نییە، بەڵکو مرۆڤان پێویستیان بە سۆز و هونەر و ئایینیش هەیە. زانست پێی دەکرێت سنوور بۆ مەعریفە دابنێت، بەڵام هیچ گەرەک نییە ئاستەنگ بۆ هێزی پێشبینی دابنێت. چ لەنێو فەیلەســـوفە گریکییەکان و چ لەنێو فەیلەســـوفانی پاش ئەواندا، فەیلەسوفان هەبوون کە بەزۆری هەڵوێســـتێکی زانستییان هەبوو، بەڵام فەیلەسوفانیش هەبوون کە هەڵوێستێکی ئایینییان هەبوو؛ ئەمانەی دوایی زۆر شـــتیان، جا راستەوخۆ یان ناڕاســـتەوخۆ، لە ئایینی باکخوسەوە پێگەیشتبوو. ئەمە بەتایبەتی پلاتۆن دەگرێتەوە، بەڕێی ئەویشەوە ئەو جەرەیانانەی پاش خۆی دەگرێتەوە کە لە کۆتاییدا ڕژانە نێو ئایینی کرستیانییەوە.

کولتی دیۆنیســـۆس لە فۆرمە سەرچاوەییەکەیدا بەزەبر و هەتا رادەیەکی زۆر قێزەوەن بوو، بەڵام لەم فۆرمەیەوە کاریگەریی لەســـەر فەیلەســـوفەکان نەنواند، بەڵکو لە فۆرمێکی هۆشـــێنراوەوە کە دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئۆرفیوس. ئەو فۆرمە زاهید (ئاســـکێزی) بوو و مەستیی هۆشەکیی خستە جێی مەستیی جەستەیی.

ئۆرفیوس دیاردەیەکی تاریک، بەڵام ســـەرنجڕاکێش بوو. هەندێک باوەڕ دەکەن کە ئەو بەڕاســـتی هەبووە، هەندێکی دیکە بە خودایەک یان بە فیگورێکی ئەندێشەیی دایدەنێن. بەگوێرەی گێڕانەوەکە، ئۆرفیوس بە هەمان شێوەی باکخوس لە تراکیاوە هاتبوو، بەڵام پتر ڕێی تێدەچێت کە ئەو (یان ئەو بزووتنەوەیـــە کە ناوی ئەوی هەڵگرتـــووە) لە کرێتاوە هاتبێت. بەهەر حاڵ، ڕێبازە ئۆرفییەکان زۆر شت لە خۆ دەگرن کە پێدەچێت سەرچاوەیان لە میسر بێت، میسریش بەتایبەتی بەڕێگەی کرێتاوە کاری کردە سەر گریکیا. وەک دەگۆترێت، ئۆرفیوس بریتی بووە لە چاکسازێک، بەڵام مێنادەکان کە لەلایەن ئۆرتۆدۆکسیی باکخوسییەوە قامچیژەن کرابوون، لەتوپەتیان کردووە. ئۆرفیوس لە داڕشتنی کۆنی داستانەکەدا، جیاواز لە داڕشتنەکانی درەنگتر، هێندە مەیلی بۆ موزیک نییە. ئەو لە بنەڕەتدا کاهین و فەیلەسوف بوو.

ئۆرفیـــوس (گەر ئەو بەڕاســـتی لە ژیاندا بووبێت) هـــەر ڕێبازێکی هەبووبێت، مەســـەلەیەکە،

بـــەڵام ڕێبازی ئۆرفییەکان بەچاکی ناســـراوە. ئەوان بڕوایان بە دۆنادۆنـــی دەروون هەبوو، هەروەها دەیانگۆت، دەروون لە ئایندەدا، بەپێی بەڕێوەبردنی ژیانی لەســـەر زەمین، یان بە پیرۆزیی ئەبەدی دەگات یاخود ژانی ئەبەدیی پێدەبڕێت. ئۆرفییەکان تەقەلایان بۆ «پاکژ»بوونە دەدا، ئەمەشـــیان تا ڕادەیەک بەڕێی ئاهەنگی پاکژێنەر، تا ڕادەیەکی دی بەڕێی خۆ بەدوورگرتن لە هەندێک پیســـبوون، ئەنجـــام دەدا. ئەوانەیان کە ئیمانێکی توندڕەویان هەبوو، گۆشـــتی ئاژەڵیـــان نەدەخوارد، بێگومان ئەو بۆنە ســـروتیانەی لێدەربچێت کە کەمێکیان لە قوربانییەکە وەک ســـاکرامێنت دەخوارد. ئەوان دەیانگۆت، بەشـــێکی مرۆڤ لە توخمی زەمینی و بەشـــێکی دیکەی لە توخمی ئاســـمانی پێکدێت، بەشـــە ئاسمانییەکە بەڕێی ژیانێکی پاکژەوە پەرەدەســـێنێت و بەشە زەمینییەکەش دەپووکێتەوە، ئیتر مرۆڤ لە کۆتاییدا دەتوانێت لەتەک باکخوســـدا یەکانگیر ببێت و ناو دەنرێت «باکخوســـێک». ئۆرفییەکان تیۆلۆژییەکیان هەبوو کە بەوردی کاری تێدا کرا بوو. بەگوێرەی ئەو تیۆلۆژییە، باکخوس دوو جار زایێنرا بوو، جارێک لە لایەن ســـەمێلەی دایکییەوە و جارێک لە ئێســـکی پشـــتی زیۆسی باوکییەوە.

ئەفســـانەی دیۆنیســـۆس زۆر جار ڕاڤە کراوە. بەگوێرەی یەکێک لەو ڕاڤانە، دیۆنیســـۆس کوڕی زیۆس و پێرســـەفۆنە. ئەو لـــە تەمەنی لاوێتیدا لە لایەن زەبەلاحەکانـــەوە (تیتانەکانەوە) لەتوپەت دەکرێت و گۆشـــتەکەی هەتا دەم دڵی دەخۆن. هەندێک دەبێژن کە زیۆس ئەم دڵەی پێشکەشـــی ســـەمێلە کردووە، بەڵام هەندێکی دیکە دەبێژن کە گوایە زیۆس ئەو دڵەی قووت داوە. بە هەر حاڵ، دیۆنیسۆس لە هەردوو حاڵەتدا دیسان دەزاێنرێتەوە. کاتێک باکخەکان ئاژەڵێکی بەرەڵایان لەتوپەت دەکرد و گۆشـــتەکەیان بەکاڵی قـــووت دەدا، ئەوا ئەم کردارەیان بە دارشـــتنەوەیەکی نوێی ڕووداوە دێرینەکە دادەنا- ئاخر دیۆنیسۆســـیش لە لایەن زەبەلاحەکانەوە لەتوپەت کرابوو و گۆشـــتەکەی لە لایەن ئەوانەوە بەکاڵی خورا بوو. لێرەدا ئاژەڵەکە هەتا ڕادەیەکی تایبەتی بریتی بوو لە بەرجەستەی (ئینکەرناسیۆنی) خوداکە. زەبەلاحەکان زەمینی بوون، بەڵام دوای ئەوە کە ئەوان خودایان خواردبوو، ئیتر لە ناخیاندا پزیســـکێکی خودایەتی ئەنگوتبوو. بێگومان مرۆڤیش لە بەشـــێکدا زەمینییە و لە بەشـــێکی دیکەیدا خوداییە، لێرەشدا سروتە باکخوسییەکان هەوڵێک بوون بۆ ئەوە کە هەتا ڕادەی شیان مرۆڤ بە جەوهەری خودایەتی پڕبکەنەوە.

(...)

لەســـەر تاتەی ئۆرفییەکان کە لەنێو گـــۆڕدا دۆزراونەتەوە، ئامۆژگاری بـــۆ دەروونی مردووەکە نووسراون، کە چۆن ئەو ڕێگەی خۆی رووەو ئەوجیهان دەدۆزێتەوە و گەرەکە چی ببێژێت بۆ ئەوەی شایسەی خەڵاس بێت. بێگومان ئەو تاتانە تەنیا پارچەن و نووسراوەکانی سەریان ناتەواون. لەسەر یەکێکیان (تاتەی پێتیگلیا) کە بە باشترین شێوە ماوەتەوە، نووسراوە:

«تۆ لەلای چەپیماڵەکەی هادێسەوە کانییەک و لەپاڵیدا دارسەرووییەکی سپی دەبینیت — لەم کانیە نزیک مەکەوە. بەڵام لەلای گۆمی یادەوەری کانییەکی دی دەبینیت: ئاوی خوڕی ســـازگار کە لە بەردەمیدا پاسەوانان وەستاون. ببێژە: من منداڵێکی زەمین و ئاسمانی ئەستێرەییم. ئێوە دەزانن

کە ڕەگەزی من لە ئاسمانەوە هاتووە.

ببینن، من وشکهەڵهاتووم و وا لە تینواندا دەخنکێم. خێرا ئەو ئاوە سازگارەم بدەنێ کە لە گۆمی یادەوەرییەوە هەڵدەقوڵێت. ئەوان لە کانی پیرۆز ئاوت بۆ خواردنەوە دەدەنێ، پاشان تۆ دەڕۆیت بۆ نێو جیهانی پاڵەوانەکانی دی ...».

لەسەر تاتەیەکی دی نووسراوە: «پیرۆز بیت، تۆ کە موئاناتت چەشتووە ... تۆ لە مرۆڤەوە دەبیت بە خودا». هەروەها لەسەر تاتەیەکی دی نووسراوە: «ئەی بەختەوەر و لێبووردە، تۆ لەبری ئەوەی بمریت، گەرەکە خودایەک بیت».

ئەو کانیە کە نابێت دەروون ئاوی لێبخواتەوە، کانیی لێتە (Lethe)یە کە لەیادچوونەوە لەتەک خۆیدا دەهێنێت. کانییەکەی دیکە بریتییە لە منێمۆسینە (Mnemosyne)، واتا یادەوەری. گەر دەروون بیەوێت خەلاسی پێببڕێت، ئەوا نابێت لە ئەوجیهان لەیادچوونەوەی هەبێت، بە پێچەوانەوە دەبێت بگات بە زاکیرەیەکی سەرسروشتی.

ئۆرفییەکان سەکتێکی زاهید (ئاسکێزی) بوون. بۆ ئەوان شەراب، وەک چۆن درەنگتر لە ساکرامێنتی کرستیانیدا، بریتی بوو لە سیمبۆل. ئەو مەستییە کە ئەوان بۆی دەگەڕان، بریتی بوو لە «هەژان» (ئێنتوسیازم)، بریتی بوو لە مەستیی یەکانگیربوون لەتەک خودادا. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون لەسەر ئەم شێوازە بە مەعریفەی میستیکییانەی ئەوتۆ بگەن کە لەسەر ڕێگەی ئاسایی شیاوی پێگەیشتن نین. ئەم توخمە میستیکییە بەڕێی پیتاگۆراسەوە چووە نێو فەلسەفەی گریکییەوە. پیتاگۆراس ریفۆرمی ئۆرفیزمی کرد، وەک چۆن ئۆرفیوس پێشتر ئایینی دیۆنیسۆسی ریفۆرم کرد. توخمە ئۆرفییەکان لە پیتاگۆراسەوە ڕژانە نێو فەلسەفەی پلاتۆنەوە و بەڕێی ئەمیشەوە ڕژانە نێو زۆرینەی سیستەمە فەلسەفەییەکانی پاش ئەوەوە- بێگومان گەر هاتوو ئەو سیستەمانە هەتا رادەیەک دیاریکردنێکی ئایینییانەیان هەبووبێت.

هەندێک توخمی باکخوسی لەو ناوچانەدا هەر بەردەوام بوون، کە لێیان ئۆرفیزم کاریگەریی نواندبوو. فەمینیزم یەکێک بوو لەم توخمانە، کە لە لای پیتاگۆراس زۆر بەهێز نوێنەرایەتی دەکرا. پلاتۆن تەنانەت گەیشتە ئەو رادەیە کە داوای هاومافیی تەواوەتیی سیاسیی بۆ ژنان بکات. پیتاگۆراس دەبێژێت: «لە سروشتەوە ڕەگەزی ژنان لە ئیمانداری نزیکترە». توخمێکی دیکەی باکخوسی ڕێزگرتن بوو لە جووڵە ناخەکییە سۆزمەندەکان. تراژیدیای گریکی لە سروتەکانی دیۆنیسۆسەوە سەریهەڵدا. بەتایبەتی یۆریپیدێس هەردوو خودا سەرەکییەکەی ئۆرفیزمی دەپەرست کە بریتی بوون لە دیۆنیسۆس و ئێرۆس. ئەو بە بێڕێزی دەیڕوانیە مرۆڤی فیزدار بە ڕەفتاری بێخەوشەوە. ئەو لە تراژیدیاکانیدا وای دەکرد کە ئەو جۆرە مرۆڤە شێت ببێت یان خوداکان بە چەشنێک غەزەبی لێبگرن کە ئیتر لە فیزدارییەکەیەوە بخزێتە نێو موعاناتی دیکەوە.

بەگوێرەی تێگەیشتنی ترادیسیۆنی، گریکەکان جۆشێکی شایانی پێسوورمانیان هەبووە، ئەمەش گوایە دەرفەتی بۆ ڕەخساندوون بە چەشنێک لە سۆز بڕوانن کە هەروەک لە ناخەوە بەشدار نەبێت، ئەوان هەروەها لەو سۆزەدا دەرک بە سەرجەم جوانی بکەن بەبێ ئەوەی لێرەدا سەنگیندیی ئۆلومپیانە

لەدەســـت بـــدەن. بەڵام ئەم تێڕوانینـــە یەکلایەنییە. ڕەنگە ئەم تێڕوانینە هۆمێر و ســـۆفۆکلێس و ئەریستۆتێلیس بگرێتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک چواندنی بۆ ئەو جۆرە گریکانە نییە کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاســـتەوخۆ لەژێر کاریگەریی باکخوس یان ئۆرفیوسدا بوون. میستێرییە ئێلیۆزییەکان بریتی بوون لە بەشە پیرۆزەکەی ئاییی دەوڵەتیانەی ئەسینا (...).

ئۆرفیوس «بەجۆشتر» نییە لە لایەنگرە ریفۆرمەنەکراوەکەی دیۆنیسۆس. بۆ ئۆرفیوس ژیان لەسەر ئەم جیهانە پڕموعانات و شەکەتکەرە. ئێمە بە چەرخێکەوە ئالاوین کە بەڕێی زایین و مەرگەوە بەبێ وەستان دەخولێتەوە. ئەستێرەکان ژیانی هەقیقیی ئێمەن، بەڵام ئێمە بە زەمینەوە بەستراوینەتەوە. ئێمـــە تەنیا بەڕێی پاکژبوونەوە و دەســـتبەرداربوون و ژیانی زاهیدەوە دەتوانین لەو چەرخە دەرباز ببین و پاشان لە جەزمبووندا لەتەک خودادا یەکانگیر ببین. ئەمە لە بنەڕەتدا تێڕوانینی ئەو مرۆڤانە نییە کە ژیانیان بە خۆشی و شادمانی ڕادەبووڕێت (...).

نـــەک هەموو گریکەکان، بەڵام زۆریان ســـۆزمەند و نابەختیار بوون، بە خۆیان ناکۆک بوون، بە زەین بۆ لایەک و بە ســـۆزەکانیان بۆ لایەکی دی دەبزوێنران. ئەوان دەیانتوانی بە هێزی ئەندێشەیان ئاسمان و بە فیزی ئاگامەندیان دۆزەخ بۆ خۆیان دروست بکەن. ئەوان پرنسیپێکیان هەبوو: «هەرگیز بێپێوری ڕەچاونەکرێت!»، کەچی ئەوەی ڕاســـتی بێت ئەوان لە هەموو شـــتێکدا بێپێور بوون: لە هزرینـــی پەتیدا، لە هونەری هۆنینەوەدا، لە ئایین و لە گوناهدا. مەزنی ئەوان لەوەدا بوو (بێگومان هەتا ئەو کاتە کە ئەوان مەزن بوون) کە سۆز و زەینیان پێکەوەدەلکاند. هیچ کام لەم دوو توخمە پێی نەدەکرا جیهان بۆ سەرجەم ئایندە بەو چەشنە بگۆڕێت کە ئەوان لەنێو یەکێتییەکەی هەردووکیاندا کردیان. ئیدیالە میتۆلۆژیەکەی ئەوان بریتی نییە لە زیۆسی ئۆلەمپی، بەڵکو پرۆمێتۆسە کە ئاگری لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەمین و بۆ ئەو کارەی بە ژانی ئەبەدی سزا درا.

بێگومان گەر ئەوەی ئێستا گۆتمان، بە مۆرکی سەرجەم گریکەکان دابنرێت، یەکلایەنی دەبێت بە هەمان شـــێوەی ئەو تێڕوانە کە دەڵێت گریکەکان «جۆش»ێکی تایبەتمەندیان هەبووە. لە بنەڕەتدا دوو ئاڕاستە لە گریکیا هەبوون: یەکێکی سۆزمەند، ئایینی، میستیکی، ئەوجیهانی، ئینجا یەکێکی ڕۆشن، ئەمپیری، ئاوەزگەرایی و کراوە بۆ هەمەلایەنێتییەکەی هەقیقەتی دراو. ئەم ئاڕاستەیەی دووەم لە لایەن هێرۆدۆت نوێنەرایەتی دەکرا، هەروەها لە لایەن یەکەم فەیلەسوفە ئیۆنیەکان و لە ڕادەیەکی تایبەتیشدا لە لایەن ئەریستۆتێلیس. بیلۆچ[11] لە کۆتایی ڕاڤەی ئۆرفیکدا دەبێژێت:

«گەلـــی گریک زۆر بەهێزتر بوو لەوەی هەمووان بەگشـــتی ئیمانێـــک قبووڵ بکەن کە نەرێنیی ئەمجیهان دەکات و ژیانی ڕاستەقینە دەباتە ئەوجیهانەوە. بۆیە ڕێبازی ئۆرفی بە ناوەندی تا ڕادەیەک تەســـکی ئەندامانەوە پابەند مایەوە و بە هیچ شێوەیەک کاریگەریی لەسەر ئاییی دەوڵەت نەنواند، ئەمەی تەنانەت لەو کۆمەڵانەشدا پێنەکرا کە وەک ئەسینا ئاهەنگە نهێنیئامێزەکانیان هێنابووە نێو کولتەکانی دەوڵەتەوە و بە یاســـا پاراستبوویانن. دەبوو جارێ هەزارەیەکی تەواو تێبپەڕێت تاوەکو ئەم ئیدێیانە لە جیهانی گریکیدا ســـەرکەوتن بەدەست بهێنن — بێگومان لە پۆشاکی تیۆلۆژیانەی تەواو جیاوازدا».

لە بنەڕەتدا مەســـەلەکە تەواو بەم شێوەیە نەبوو، چونکە ڕێبازی نهێنیئامێزی ئیلیۆزییەکان بە ئۆرفیزم تەنرابوون. بەگشتی ئەو کەسانە کە لە ناخەوە ئایینی بوون، ڕوویان دەکردە ئۆرفیزم، بەڵام ئاوەزگەراکان بە پێچەوانەوە ڕەتیان دەکردەوە. پایەگای ئۆفیزم دەشــێت بەراورد بکرێت بە پایەگای مێتۆدیزم لە ئینگلاندی کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا.

کەم یان زۆر لامان ئاشکرایە کە ڕۆشنبیرێکی گریکی چی لە باوکی خۆی فێر دەبوو، بەڵام ئێمە زۆر کەم لەبارەی ئەوە دەزانین کە داخۆ ئەو لە سەرەتاکانی منداڵیدا چی لە دایکی خۆی فێربووبێت — دایکـــی کە بـــەزۆری لەو ژیانە کولتوورییە بـــەدەر کرابوو، کە پیاوان تێیدا پێدەگەیشـــتن. با ئەســـینایییە ڕۆشنبیرەکان لە کاری هۆشەکیانەی ئاگامەندیاندا زۆر ئاوەزگەراش بووبن، بەڵام ڕەنگە ئەوان لەپاڵ ئەمەدا تەنانەت لە لەبارترین سەردەمدا شێوەیەکی هزرین و هەستکردنیان هێشتبێتەوە کە ڕیشـــەی بەقووڵی لەنێو ترادیســـیۆن و یادەوەریی منداڵیدا داکوتیبوو، کە ئیتر لە ســـەردەمە تەنگژاویەکاندا بەئاشـــکرا ڕووندەبۆوە کە ئەم شـــێوەیەی هزرین و هەســـتکردن بەهێزترە لە لایەنە ئاوەزگەراکە. لەبەر ئەم هۆیە هەرگیز ناشێت بە شرۆڤەیەکی ئاسان هەڵوێستی هۆشەکیانەی گریکی ساغبکرێتەوە.

لـــە نوێترین ســـەردەمدا بەتەواوی ڕوونبۆتەوە کە ئایین، بەتایبەتـــی ئایینی نا-ئۆلومپی، چەند کاریگەر بووە لەســـەر هزری گریکی. کتێبێکی شۆڕشـــگێر کە (Jane Harrison) لەژێر ناونیشانی (Prolegomena to the study of Greek Religion) نووسیویەتی، جەخت دەکات کە لە ئایینی گریکییە مامناوەندیەکادا چ توخمی پریمیتیڤ و چ توخمی دیۆنیسۆسی هەبوون. هەروەها نووسینەکەی (F.M. Cornford) بە ناونیشـــانی (From Religion to Philosophy) هەوڵ دەدات بۆ ئەو کەســـانە کە گرنگی بە فەلســـەفەی گریکی دەدەن، کاریگەریی ئایین لەســـەر فەیلەسوفەکان ڕوونبکاتەوە، بەڵام کۆنفـــۆرد لـــە زۆری ڕاڤەکانیدا، یان، پابەند بەم حاڵەتەی ئێرەوە، لـــە ئەنترۆپۆلۆژیەکەیدا، هێندە شایانی متمانەپێکردن نییە[١٢]. بەڵام هاوسەنگترین داڕشتن کە من بینیبێتم، خۆی لە نووسینەکەی (John Burnet)دا دەبینێتەوە ...

بەرنێت دەبێژێت، «لە شەپۆلی سەرلەنوێ ژیاوەی هەستی ئایینییەوە کە سەدەی شەشەمی پێش زایین سەرجەم هێلاسی گرتەوە»، ناکۆکییەک لە نێوان زانست و ئاییندا سەریهەڵدا، لێرەشدا شوێنی ڕوودانی ناکۆکییەکە لە ئیۆنیاوە بۆ خۆرئاوا پەڕییەوە. بەرنێت دەبێژێت، کە «ئایینی گریکیی سەر کیشـــوەر تەواو جیاواز لە ئایینی ئیۆنی گۆڕانی بینی. بەتایبەتی کولتی دیۆنیسۆس کە لە تراکیاوە هات و لەلای هۆمێر بەدەگمەن ناودەهێنرێت، تۆوی تێڕوانینێکی تەواو نوێی سەبارەت بە پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهانەوە لە خۆ گرتبوو. بێگومان هەڵە دەبێت گەر هەر جۆرە شـــێوازە هزرینێکی مەزن بدرێتـــە پاڵ تراکییەکان، بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە گریکەکان بە فێنۆمێنی ئێکســـتاز (هەژان) بۆیان دەرکەوت کە دەبێت دەروون زۆرتر بێت لە تەنیا کۆپییەکی لاوازی خود، هەروەها دەروون لە سروشتە ڕاستەقینەکەیدا تەنیا (لە دەرەوەی لەش) دەتوانێت خۆی پیشان بدات.

لـــەوە دەچـــوو کە ئایینی گریکی بخزێتە نێـــو هەمان ئەو قۆناغەوە کـــە ئایینەکانی خۆرهەڵات

تێیکەوتبوون. بێگومان تێگەیشــتن لەو هەقیقەتە زەحمەتە کە داخۆ چ هەڵوێســتێکی دیکە جگە لە زانســتی گەشاوە ئەم گۆڕانەی وەســتاندبێت. مرۆڤ زۆر جار دەبێژێت کە گریکەکان نەبوون بە خاوەنــی ئایینێکی کارەکتــەر خۆرهەڵاتی، چونکە ئەوان توێژی کاهینانیــان نەبوو، بەڵام ئەمە لە بنەڕەتــدا دانانی ئەنجامە بە هۆکار. ئاخر کاهین دۆگم دروســت ناکات، ئــەو تەنیا دۆگمەکان دوای دانانیــان وەردەگرێــت. جگە لەمە گەلانی خۆرهەڵاتیش لە قۆناغە ســەرەتاییەکانی گۆڕاندا خاوەنی کاهیــن نەبوون لەو مەغزایەدا کە ئێمە لێرەدا لێیدەدوێین. گریکیا بەدوور مایەوە لەو گۆڕانە، نەک لەبەر ئەوەی کاهینی نەبووبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی خاوەنی فێرگەگەلی زانستی بوو.

ئایینــی نوێ (ئاخر لە روانگەیەکەوە نوێ بوو، جا گەرچی لە روانگەیەکی دیکەوە بەقەد خودی مرۆڤایەتی کۆن بوو) لەتەک دامەزراندنی کۆمەڵە ئۆرفییەکاندا گەیشــت بە لوتکەی گۆڕانەکەی. تا ئەو رادەیەی دیدمان بڕ بکات، دەبینین کە ئاتیکا نیشــتمانی سەرچاوەییان بوو. ئەو کۆمەڵانە زۆر خێرا تەنینەوە، بەتایبەتی لە باشــووری ئیتالیا و سیسیلیا، جگە لەمە رێکخراوەی ئەوتۆ بوون کە خزمەتی کولتی دیۆنیسۆســیان دەکرد، بەڵام دوو مۆرکی تەواو تایبەتییان هەبوو کە بۆ هێلێنەکان تــەواو نوێ بوون: ئــەوان ئۆتۆرێتییە ئایینییەکــەی خۆیانیان دەگەڕاندەوە بۆ سروشــێک، ئەوان هەروەها وەک کۆمەڵەی تایبەتی رێکخرابوون. هۆنراوەکان کە تیۆلۆژییەکەی ئەوانیان لە خۆ دەگرت، بە هۆنراوەی ئۆرفیوس دادەنران — ئۆرفیوس کە دابەزی بوو بۆ هادێس و لەبەر ئەم هۆیە دەیتوانی دەروونی ئازادکراو لە لەش بەنێو مەترسیی ئەوتۆدا ببات کە لە ئەوجیهان هەڕەشەیان لێدەکرد».

پاشان بەرنێت هاوشێوەییەکی سووڕهێنەر لە نێوان ئیمانی ئۆرفی و ئەو ئیمانەدا دیاری دەکات کە لە هەمان ســەردەمدا لە هیندســتان ســەروەر بوو. ئەو بێگومان لەو بڕوایەدایە کە ناشێت هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ئەو دوو ئیمانەدا هەبووبێت. بەرنێت پاشــان روو دەکاتە واتای سەرچاوەیی وشــەی «ئۆرگیی» (Orgie) کــە ئۆرفییەکان لە مەغزای ســاکرامێنتدا بەکاریان دەهێنا. ئۆرگیی دەبــوو دەروونی کەســی ئیمانــدار پاکژ بکاتەوە و دەرفــەت بۆ دەروون بڕەخســێنێت تاوەکو لە سووڕی زایینەوەکان رزگاری ببێت. ئۆرفیەکان، بە پێچەوانەی کاهینەکانی کولتە ئۆلەمپییەکانەوە، رێکخراوگەلیــان دامەزرانــد، کە ئێمە دەتوانین وەک کلێســە دیارییان بکەیــن، واتا وەک کۆمەڵەی ئایینیی ئەوتۆ کە دەشــیا تێیدا هەموو یەکێک بەدەر لە ســومعەی هۆزەکەی یان رەگەزەکەی تەنیا بەڕێــی فێرکاریی نهێنییــەوە وەربگیرێت. مرۆڤ لەژێــر کاریگەریی ئەو کۆمەڵانــەدا بینیی: ئەو دەتوانێت بژی گەر لە لایەن فەلسەفەیەکەوە رابەرییبکرێت.

## پەراوێزەکان:

١-ئەریتمێتیک و کەمێکی جیۆمەتری لە لای میســـرییەکان و بابلییەکان هەبوون، بەڵام لە شێوەی رێسای پراکتیکی و سادەدا. نوێکردنەوەیەکی گریکیانە لەم بوارەدا ئەوە بوو، کە ئەوان سەلماندنی دێدوکتیڤیان لەسەر بناغەی گریمانەی گشتی هێنایە ئاراوە.

٢-ئەو برایەکی هاوتەمەن (وەک دووانە) یان مێردێکی هەبوو کە بریتی بوو لە «جەنابە سەروەری ئاژەڵان»، بەڵام ئەم مێردە کەمتر بەواتایە. لە ســـەردەمێکی درەنگتردا ئەرتێمیس بە «مەزنە دایک»ی ئاســـیای بچووک دانرا.

٣- نموونەیەک: «گیمل» کە سێیەم پیتی ئەفلبێی حیبرییە، واتای «کێمڵ» (حوشتر) دەگەیەنێت. هێما پێگونجاوەکەی بریتییە لە داڕشتنی حوشترێک کە کراوە بە پێکهاتەیەکی بەکارهێنانی خەتەکە.

4-Gilbert Murray: Five Stages of Greek Religion, S. 67

٥-مرۆڤ پەیوەســـت بە زەردەشـــتەوە زۆر بەهێـــز پاپەندی مەزەنەیە. هەندێک کەس ئـــەو دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی نزیکەی ١٠٠٠ی پ.ز. بڕوانە:

Cambridge Ancient History, Band IV, S. 207

6-Übersetzt von Herm. Diels. (Anm. d. deutschen Übersetzers

٧- سەرەنجامی سەرکەوتنی سپارتا بەسەر ئەسینادا ئەوە بوو، کە فارسەکان سەرجەم رۆخی ئاسیای بچووکیان سەندەوە (داگیرکردەوە)؛ پەیمانی ئاشتیی ئانتالکیداس (٣٨٦/٣٨٧ پ.ز.) مافی فارسەکانی بەسەر ئەم بەشەدا راستاند. ئەو ناوچانە نزیکەی پەنجا ساڵ دوای ئەم پەیمانە خرانە سەر دەوڵەتەکەی ئەلێکساندەر.

8-J. E. Harrison, Prolegomena to the Study of Greek Religion, S. 651

9-Vergl. Rose, Primitive Greece, S. 65 ff

١٠- مەبەستم لە مەستیی هۆشەکییە نەک ئەو مەستییەی بەڕێی ئەلکوهولەوە هێنراوەتە گۆڕێ.

11-Beloch, Griechische Geschichte, Band I, S. 434

١٢- بەڵام ناتوانم سوورمانی خۆم بە کتێبەکانی کۆرنفۆرد لەبارەی دیالۆگەکانی پلاتۆن بشارمەوە.

## فەرهەنگۆک

ئارکیۆلۆژی: زانستی پاشماوەی کولتوورە دێرینەکان

بلۆند: (شقراء)

بەڕبەڕ: بێکولتوور، دواکەوتوو لە رووی ژیارییەوە.

پانتیۆن: تێمپلێک (پیرۆزگەیەک) کە تێیدا بتی هەموو خوداکان کۆدەکرانەوە.

پرۆگنۆز: راگەیاندنی گۆڕانی ئایندەیی.

پریمیتیڤ: سەرەتایی لە رووی گەشەی ژیارییەوە.

تراديسیۆن: ئەوەیە کە لە رابوردووەوە گەیەنراوە و سەروەریی هەیە.

تۆرێئادۆر: زۆرانبازی گا.

تیرانیس: دەسەڵاتداریی تاکەکەسێک.

تیۆلۆژی: زانستی خوداناسی.

دێدوکتیڤ: (هەڵهێنجەرانە)، بردنەوەی مەئریفە لە گشتێتییەوە.

دێکادێنت: تێکچوو بەرێی گەییینی کولتوورییەوە، کە نیشانەی داوەشانە؛ دەبێت لە بۆگەنبوونی کۆمەڵایەتی لە واتای دارزاندا جیا بکرێتەوە، چونکە مەرج نییە لە گەییویی کولتووریدا بۆگەنی کردبێت.

دێسپۆتی: دەسەڵاتدارییەکی تاکرەو و هەوەسئاسای بەزەبر.

دێمۆکراتی: دەســـەڵاتداریی گەل. جیاوازە لە دێمۆکراتی لە واتای مۆدێرندا کە تێیدا پارتی سیاسی هاڤرکێی گەیشتن بە دەسەڵات دەکەن.

ساکرامێنت: کردارێکی ئایینی لە پێناوی وەرگرتنی بەزەیی خودادا.

سپۆنتان: (عەفەوی).

ڤۆکال: بزوێن

کاست: توێژی کۆمەڵایەتیی داخراو

کۆنسۆنانت: نەبزوێن

کۆنسەڤاتیڤیزم: هەیەپارێزی.

کولت: پەیرەوکردنی ئایینی (شەعیرە).

کەنیبالیزم: مرۆڤخۆری.

مێتۆدیزم: بزووتنەوەیەکی ئایینیی ئینجیلی بوو کە ســـەدەی هەژدەیەم لە ئەنگلیکانیزمەوە ســـەریهەڵدا، مۆرکە کرۆکییەکانی بریتی بوون لە راهێنانی تایبەتیی ئایینی و کاری بەواتای سۆسیال.

مێنادەکان: ناوی ژنە حاڵلێهاتووەکانە لە ئایینی دیۆنیسۆسدا.

میستیک: رێبازێکی هۆشەکی-ئایینی نهێنیخوازە، بۆ نموونە سۆفیزم لە ئیسلامدا.

میستیسیزم: میستیکگەرایی.

میستێریوم: سروتە ئایینییە پڕنهێنییەکان لە گریکیای ئەنتیکەدا.

ئۆرتۆدۆکس: کەسێک کە بەتەواوی لەسەر بنەماکانی ئایینێک (یان ئیدیۆلۆژییەک) بڕوات.

ئۆلومپییەکان: لە کێوی ئۆلومپیۆسەوە هاتووە کە شوێنی ژیانی خوداکان بوو و دەکەوتە باکوری گریکیاوە. کەواتە: خوداکانی ئۆلومپ.

ئۆنتۆلۆژی: بوونناسی.

هادێس: جیهانی مردووان، خودای ژێرجیهان.

ئەریستۆکراتی: دەسەڵاتداریی چەند کەسێکی بەگزادەیی

ئەســـترۆلۆژی: راڤـــەی رووداوەکانـــی نێـــو جیهـــان و قـــەدەری مرۆڤـــان بەرێـــی شـــوێن و پەیوەندیی ئەستێرەکانەوە.

ئیدیۆگرام: دارشتنی گرافیکئاسا.

ئێتیمۆلۆژی: زانستی سەرچاوە و مێژووی وشە.

ئێلیۆزینی: لە ئێلیۆزیسەوە هاتووە کە ناوچەیەک بوو لە نزیکی ئەسیناوە. ئێلیۆزینییەکان ئاهەنگێک بوو بۆ ئابرووی دێمێتەری مێخودای بەپیتی.

## سەرچاوە:

Bertrand Russell. Philosophie des Abendlandes. Köln 2002

# ڕۆشنگەری: یەکێتی یان فرەیی؟

ري پۆرتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

یەکێک لەو بەهایانەی بیریارانی ڕۆشـــنگەری زیاد لە هەموو شـــتێک نرخیان بۆ دائەنا تیورەی گەردون نیشتیمانی (cosmopolitanism) بوو. ئەوان بڕوایان وابوو کە عەقڵ بەشێوەیەکی یەکسان ســـەرجەم جیهانی خستۆتە ژێر تیشکی خۆیەوە . لێرەوە بڕوایان بە پێوەرێکی هەمەکی دادپەروەری هەبوو کە بەهۆی یاســـایەکی سروشـــتیەوە (normative natural law) دیاری ئەکرا. سەرەڕای ئەمە بە بڕوای ئەوان تەنها یەک سروشتی یەکسانی مرۆیی بونی هەیەو هەموو خەڵکی دنیا لە «چینەوە تا پیرۆ» بەشـــێوەیەکی سەرەکی خاوەن خەسڵەتو دروشـــمی یەکسانن. لەبەرئەوە یەکێ لەو ژانرە ئەدەبیانەی بیریارانی ڕۆشـــنگەری حەزیان لێئەکرد ئەوە بوو لە زمانی «مرۆڤناســـێکی» بێگانەوە (بۆ نمونە حەکیمێکی ئێرانی، کەسایەتی گێرەوەی «نامە ئێرانیەکان»ی مۆنتیسیکۆ) خراپەکاریو گەوجایەتی نەک مرۆڤی ئەوروپی، بەڵکو گەوجایەتی مرۆڤی بەشـــێوەیەکی گشـــتی لەچوارچێوەی تەنزدا دەربڕێ.

فەیلەسوفانی ڕۆشـــنگەری گاڵتەیان بە ناســـیۆنالیزمی کورتبینانەو سەرجەم شێوازەکانی تری پێشـــداوەریە تەسکبینانە لادێی ئاســـاکان ئەکرد. ئەوان خەڵکانی جیهانی بوون و ئارەزوی ئەوەیان ئەکرد خۆیان نەک وەک هاوڵاتیانی فەرەنســـا، ســـکۆتلەندا یان ســـوید، بەڵکو ســـەر بە کۆماری نێونەتەوەیی زانستو ئەدەب بزانن. لێرەوە بیریارانی ئەم سەردەمە بەچاوی ئافرینکردنەوە تەماشای ئەنتەرناســـیۆنالیزمی فەیلەسوفانی ڕەواقی سەردەمی دێرینو شارستانیەتی هاوبەشیان ئەکرد کە لە ســـەردەمی ئیمپڕاتۆری ڕۆمدا نەتەوەکانی دانیشتوی کەناری دەریای سپی ناوەڕاستی یەکخستبوو. لەمانەش تێپەڕێت زمانی لاتین هێشـــتا وەک زمانی هاوبەشی لەنێوان ئەهلی زانستو زانیندا سودی

لـێ وەرئەگیرا. ئەگەر زمانی لاتینیش لە سـەدەی هەژدەدا هێواش هێواش گرنگی خۆی لەدەسـت ئـەدا، زمانێکی مامناوەندە (lingun franca)ی ئەنتەرناسیۆنالیسـتی تر، واتە فەرەنسـی جێگەی ئەگرتەوە.


جون لوک

فردریکی گەورە یان ڤۆلتێر و کاترینی گەورە لەگەڵ دیدرۆدا بە زمانی فەرەنسی بۆ یەک شتیان ئەنوسـی، ئیدوارد گیبینیش یەکەم کتێبی خۆی بە زمانی فەرەنسـی بڵاوکردەوە. لەم مەسەلەیەدا خاڵێکی ئالۆز هەیە. زمانی فەرەنسـا وەک زمانی گشـتی بەکارهێنانێکی وەک زمانی سـبرانتۆی هەیە. بەڵام بۆ زۆرێک بڵاوبونەوەی و باڵادەسـتی زمانی فەرەنسـی لەم سـەردەمەدا بەمانای ئەو راستیە بوو کە بیریارانی فەرەنسی بەشێک بوون لە پێشرەوانی رۆشـنگەری. ئەو مێژوونوسانەش کە ئاماژەیان بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزمی رۆشنگەری کـردووە، لـە هەمانکاتدا ئـەو گریمانەیەیان بە بەڵگەنەویسـت وەرگرتـووە کـە پێشـکەوتنی رۆشنگەری لە فەرەنسا بۆ بڵاوبونەوەی تیشکەکەی لە هەمـوو ناوچەکانی تری ئەوروپادا گرنگیەکی چارەنوسسازی هەبووە. بۆ نمونە مارسک هەر لەم ئاراستەیەدا رایدەگەیەنێت کە «رۆشنگەری لە پلەی یەکەمدا دیاردەیەکی فەرەنسی بوە». هەرکەس جێگەیەک لە پاریس دورتر بێت، لە تاریکیەکی قوڵتردا غەرق ئەبێت.

بەڵام یەکسانکردنی دانە بەدانەی رۆشنگەری «راستەقینە» لەگەڵ چالاکیە فکری و کلتوریەکانی فەرەنسـا، هەڵەی جدیتر بەدوای خۆیدا دێنێت. یەکەم زادگای سـەرەکی بزوتنەوەی رۆشـنگەری بەهیچ شـێوەیەک فەرەنسا نەبووە. بەر لە دەرکەوتنی کەسـانی مەزنی وەک مۆنتیسیکۆ و ڤۆلتێر، بزوتنەوەیەکی رۆشنگەری رادیکال لە دەرەوەی سنورەکانی فەرەنسا و بەتایبەتی لە کۆماری هۆڵەندا لەسەدەی هەڤدەهەمدا لە جۆشو خرۆشدا بوو. لێرەوە پێویستە سەیری خودی سەرچاوەی رۆشنگەری لە فەرەنسا بکەین.

خاڵێکی تر ئەوەیە ئەگەرچی رۆشنبیرانی بەرجەستە لە سەرتاسەری ئەوروپادا تیورەی جیهانبینی کۆمسـمۆپۆلیتیان بە تەواوی قەبوڵکردبوو، بەڵام لە هەمانکاتدا بەقوڵی سـەرقاڵی سیاسەتەکان و مەسـەلە نەتەوەیی‌و ناوچەییەکانی خۆیان بوون و ئەبوو بۆ بەرخوردکردن لەگەڵ مەسەلەکانی هەر ناوچەیەک، ئەولەویاتی تایبەتی ئەو ناوچەیەیان لەبەرچاو بگرن. لێرەوە قەبوڵکردنی ئەو گریمانەیەی کە سەرقاڵی سەرەکی فەیلەسوفانی رۆشنگەری فەرەنسی وەک بەگژاچونەوەی خراپی و ناشرینیەکانی

مەزهەبی کاسـۆلیک، ئیمتیازاتی دەرەبەگایەتی، سانسـۆر و پێداویستی رونکردنەوەو پەرەسەندنی فەلسـەفەی ماتریالیستی، خۆبەخۆ سـەرقاڵی فکری زوربەی بیریارانی ئەم سەردەمە لە ناپۆلیەوە تا ئۆپسـالاو لە بێرمێنگهامەوە تا سنت پترزبۆرگیش بووە، وێنەیەکی یەکجار شێواوی رۆشنگەری لەبەرامبەرماندا دائەنێت. راسـتیەکەی ئەوەیە کە رۆشنبیرانی هەر ناوچەیەک سەرقاڵی مەسەلەکانی کۆمەڵگاو ناوچەی خۆیان بوونو هەوڵیان ئەدا بۆ ئەم مەسـەلانە رێگەچارەی «رۆشنگەرانە» لەناو بەها کلتوریەکانی خۆیاندا بدۆزنەوە.

بیریارانی هۆڵەندی مەسەلەکانی رۆشنگەریان بەرلەوەی لە بنەڕەتدا کەسانی تر ئەم مەسەلانەیان ئەزمون کردبێت، چارەسـەر کردبوو. هەروەک شـاما (schama) جەختی لێکردووە کۆماری هۆڵەندا لەسەدەی حەڤدەدا وڵاتێکی تاقانە (generis sui) بوو. سەرەتا ئیسپانیەکان و پاشان فەرەنسیەکان هەوڵیاندا بە هێزی سەربازی ئەم وڵاتە لە نەخشەی جیهان بسرنەوە. نە ئیسپانیەکانو نە فەرەنسیەکان نەیانتوانی کۆماری یەکگرتوی هوڵەندا تێکبشکێنن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەپێی گەواهی مێژوو و زانینی کلاسیکی، کۆمەڵێکی سەرسوڕهێنەری وەک هوڵەندا نەیئەتوانی هیچ شانسێکی بۆ مانەوە وەک وڵاتێـک هەبێـت. لەم وڵاتەدا گروپە ئەتنـی و مەزهەبە جیاوازەکان نەک هەر پرۆتسـتانت و کاسـۆلیکەکان بەڵکو یەهودیەکان و موسوڵمانەکانیش بەوپەڕی ئارامیەوە پێکەوە ئەژیان. کۆماری هۆڵەندا زۆرتر بونیادێکی سیاسـی پەیوەندیخوازی (political hybrid) بوو کە لە لایەکەوە شـانی دادابووە سـەر کۆمارێکی دۆگمایی کە لە دۆخی رماندا بوو، لە لایەکی دیشەوە بە دەزگای شارەوانی (stadholder) خۆیەوە تەنها لاسـایکردنەوەیەکی روکەشی رژێمی پاسایی بوو. هوڵەندا زیاتر لەوەی لەژێر دەسەڵاتی ئەرستۆکراتە سەربازیەکاندا بوبێت کە پایەو پۆستی خۆیان بە میرات بۆ ماوەتەوە، لەژێر دەسەڵاتی سیاسەتمەدارانی شاریدا بوو کە سامانیان نەک لە موڵکداری زەویەوە، بەڵکو لەڕێی بازرگانیەوە بەدەسـت دەهێنا. ئەم وڵاتە بەمانای کلاسـیکیش «کۆمـاری» نەبوو، چونکە بەپێی حیکمەتی سیاسـی دێرین سیسـتەمی کۆماری ئەبێت هاوکات لەگـەڵ فەزیلەتەکانی ژیاندا، هانی باوەڕهێنان یان قەناعەت پێکردن بـدات و ئەخلاقیاتی «تەجەمولی» رەد بکاتەوە. بەڵام بۆرژوازیە شارنشینەکانی هوڵەندا بە پێچەوانەی ئەم بنەمایەوە، بێئەندازە چێژیان لە سامانی گەورەی خۆیان وەرئەگرت.

لەبەر ئەمە کۆماری هوڵەندا لەدیدی زۆر کەسەوە دیاردەیەکی بێ مانا بوو و هیچ کەس بەدروستی نەیئەزانی ئەبێت چی لەگەڵدا بکرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەپێچەوانەی هەموو چاوەڕوانیەکانەوە هوڵەندا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەڤدەدا بوو بە وڵاتێکی زۆر سەرکەوتوو و پێشکەوتوو. بەمشێوەیە بوو بە نمونەی سـەقامگیری دروشمەکانی رۆشـنگەری کە بووە بە شتێکی واقعی: رزگار بوون لە سـتەمکاری، فرەیی و لێکبوردنی مەزهەبی، خوشـگوزەرانیو سیاسەتی (بەرێژە) ئاشتیخوازانەی دەرەکی. کۆماری هوڵەندا بە وەرگرتنی پەنابەرانی سیاسـی، بە بەرهەمی زانسـتیو بە چاپخانەی مۆدێرن و پێشکەوتووی خۆی، نمونەیەکی خوازراوی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ئابوری پێشکەش ئەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا ئەزمونی درەوشـــاوەی هوڵەندا لە سەدەی حەڤدەدا روبەروی تەقدیر و ستایشـــێکی زۆر نەبۆوە. هیچ یەک لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری بە جدی بیری لەوە نەئەکردەوە کە فەرەنسا، پرۆس یان روسیا ئەتوانێت یـــان ئەبێت پەیـــڕەوی لـــە مۆدێلی سیاسی هوڵەندا بکات. فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەرستۆکرات، سوکایەتیان بـــە هوڵەندیەکان وەک کاســـبکارانی پیســـوپۆخڵ و پارەپەرســـت ئەکرد. بەهەمانشێوەی کە ســـوکایەتیان بە یەهودیـــەکان ئەکـــرد. لەبەرئەوە ئەم مەســـەلەیە هیچ توشی سەرسوڕمانی نەکـــردن کـــە لە ســـەدەی هـــەژدەدا دەســـتکەوتە کلتوریەکانـــی کۆماری هۆڵەندا، هاوشـــانی دەســـەڵاتگرتنە دەستی ئۆلیگارشـــی دارایی کە لەژێر دەســـەڵاتی بانکدارانـــی دەوڵەمەندو بازرگانـــە نێونەتەوەییـــەکان بـــوو، هێواش هێـــواش لەناوچـــوو. هوڵەندا لە ناوەڕاستی ســـەدەی هەژدەدا چیدی پشکێکی ســـەربەخۆی لە بەرهەمهێنانی بەرهەمە زانستیو فەلسەفیەکاندا نەبوو، تەنها وەک ناوەندی سەرەکی پیشەسازی چاپو بڵاوکردنەوەی کتێب، بایەخی رابردووی خۆی پاراستبوو.




بەڵام ناکرێت ئەزمونی تاکانەی بەریتانیا لەم بوارەدا بە ســـادەیی رەت بکرێتەوە. ئەم مەسەلەیە ئەبێت قەبوڵبکرێت کە ئینگلتەرا لە ســـەدەی هەژدەدا نەیتوانیبوو وەک فەرەنسا، کۆمەڵێکی مەزن لە رۆشـــنبیرانی سەرەڕۆ و بەرجەستە دروستبکات. رۆشنبیرانێک کە نەخشەدانەری سەرجەم تیورە رادیکالەکان بوو لە بواری سیاسەت، بیرکردنەوەی ئازاد و وتوێژی تیوری لەبارەی مەسەلە ئەخلاقیو جنســـیەکانەوە. بەڵام ئەم مەســـەلەیە لەبەر تاریکبینی ئینگلتەرا لە ســـەردەمی جۆرجی یەکەمو دوهەمدا نەبوو. بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە لەبەرئەوە بوو کە ئینگلتەرا لە دامێنی سەرەتای سەدەی هەژدەدا ســـەرقاڵی ئەنجامدانی چاکسازی بوو لە بواری سیاسەت، مەزهەب و ئازادیە فەردیەکان، کە بیریارانی رادیکالی فەرەنســـا سەرتاسەری سەدەی هەژدە خوازیاری بەئەنجامگەیاندنی بونو دواجار لەم مەسەلەیەشدا هیچ سەرکەوتوو نەبوون.

خەڵکی ئینگلتەرا پاش ئەنجامدانی «شۆڕشی درەوشاوە» لە ساڵی ١٦٨٨دا توانیبویان حکومەتی دەستوری و نوێنەرایەتی پەرلەمانی، ئازادی فەردی، لێبکوردن و ئاسانگیری واقعی، ئەگەرچی نەک

لێکبوردنـــی مەزهەبی کامڵ، ئـــازادی را دەربڕینو ئازادی رۆژنامەگەری دابمەزرێنن. فەیلەســـوفانی وەک جۆن لۆک نەخشـــەیەکی وردیان بۆ کۆمەڵگایەکی رۆشـــنگەر رێکخســـتبوو: رژێمێکی لیبراڵ لەســـەر بناغەی مافی فەردی و یاسای سروشتی، لەپێشبونی پایەی خەڵک پێش پایەی فەرمانڕەوا، مەســـیحیەتێکی عەقلانـــی، بەپیرۆزدانانی مافی موڵکایەتی لە چوارچێوەی سیاســـەتێکی ئابوری لیبراڵدا، بڕوابوون بە توانای پەروەردە بۆ دروســـتکردنی گۆڕانی کۆمەڵایەتیو دواجار ئاراســـتەیەکی ســـەرەرۆیانەی ئەزمونگەریانە ســـەبارەت بە پێشـــکەوتنی زانین و بڕوابوون بـــە توانای مرۆڤ بۆ گۆڕانکاری و پەرەسەندن لە رێگەی ئەزمونەوە.

مەسەلەی سەرەکی کە رۆشنبیرانی ئینگلیزی لە سەدەی هەژدەدا روبەروی بووبونەوە پێداویستی رەخنە لە رژێمی کۆن یان داڕشتنی نەخشەو بەرنامەیەک نەبوو بۆ رژێمێکی نوێ، بەڵکو چالاککردنی سیســـتەمی سیاســـی ریفۆرمکراوی وڵات بوو. ئەمە خۆی ئەزمونێکی سەرەرۆیانە بوو، ئایا ئەوەندە رادەی ئازادیـــە فەردیەکان ئەیتوانی لەگەڵ ســـەقامگیری سیاســـیو کۆمەڵایەتیـــدا بگونجێت؟ یان حکومەتی ســـنورداری دەستوری بەناچار ئەڕوخاو ئەبووە هۆی دروســـتبونی ئاژاوە یان حکومەتی رەها؟. رۆشـــنبیرانی ئینگلیزی بە شـــێوەیەکی بەرفـــراوان و بۆ رێگری لەم پێشـــهاتە، کاریگەری میکانیزمەکانی کۆنترۆڵ، هاوســـەنگکەریان لە حکومەتێکی دەســـتوری تێکەڵاودا ئەسەلماند. ئەم میکانیزمانە کە مۆنتیسیکۆیان بە توندی خستبووە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، پاشتر لەناو دەستوری ئەمەریکادا دانران. لەهەمانکاتدا (بەپێی تێگەیشتنی هیوم) ئەم مەسەلەیە خاوەن گرنگی تایبەتی خۆی بوو کە دروشمســـازیو سیاسەتی حیزبیەکان ئەبێت بەهۆی ئەو شورایانەوە چاکبکرێت کە لە خەڵکی بە ئەزمونو پسپۆرەوە دروستکراوە.

مەسەلەیەکی تر کە گرنگیەکی کەمتری نەبوو ئەوە بوو کە ئایا کەڵەکەکردنی داراییە شەخسیەکان (ئەمە سەردەمی ئیمپراتۆری و شۆڕشـــی پیشەسازی بوو)، لەگەڵ یەکێتی کۆمەڵایەتیدا ئەگونجا؟ یا زیادبوونی ســـامانی شەخســـی بناغەکانی ئازادی ئەلەرزێنی، چینە کۆمەڵایەتیەکان لە بەرامبەر یەک و دوژمنی یەکدا دائەنێت و ئەبێتە هۆی گەندەڵی حکومەتی دەستوری؟ ئەمانە ئەو مەترسیانە بوون کە ئایدۆلۆژیا کلاســـیکیەکانی «کۆماریەت» (commonwcahh) روبەروی بونەوە؟ وەک چۆن لە ســـەرەتاکانی سەدەی هەژدەدا برنارد مندویل بە پێشکەشکردنی پارادۆکسە هوشیارانەکەی خۆی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو مەســـەلانەی سەرەوە رێگەیەکی خۆشبینانەی پێشکەشکردبوو، جارێکی تر لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا بە یارمەتی سیستەمەکانی ئابوری سیاسی، رێگەیەکی خوشبینانەی تر دەرکەوت. بەپێی ئەم تێگەیشتنە خۆشبینانەیە زیادبوونی سامانی شەخسی بەشێوەیەکی پێویست ئەبێتە هۆی زیادبوونی سامانی نەتەوەیی و خوشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست ئەبێتـــە هۆی بەهێزبونی پەتەکانـــی پەیوەندی نێوان تاکەکان و ئەمەش بەســـەرەی خۆی یەکێتی کۆمەڵایەتی پتەوتر ئەکات و ئەبێتە رێگر لەبەردەم درزە چینایەتیەکاندا.

لەبەرامبەردا بیریارانی ئەخلاقخواز مەترســـیەکی ئەهێنایە پێشـــێ کە ناویان ئەنا «تاکبـاوەڕی موڵکایەتی خواز» (possessive individualism) (بەدەستهێنانی سودی شەخسی وەک ئامانج). ئەوان

بڕوایان وابوو كە ئەم ئاراستەیە ئەبێتە هۆی «دۆخی هەلپەرستی»، دۆخێک كە ئەبێتە هۆی داڕزانی كۆمەڵایەتیو نامۆبونی مرۆڤ لە مرۆڤ. بەڵام بیریارانی بەرجەستەی بەریتانیایی لە ئەدیسۆنەوە و ستیلی نوسەرانی بڵاوكراوەی «تەماشاكار» (The Spectator) لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەوە تا مامۆستایانی سكۆتلەندی وەک جان میلار و دۆگلاد ستیوارت لە كۆتاییەكانی سەردەمی رۆشنگەریدا، دیدی تەواو ناكۆک بەیەكیان هەبوو. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان پێشكەوتنی ئابوری كۆمەڵگایەكی مەسرەفكەر دروستئەكات كە عادەتو رەفتاری خەڵكی دەپاڵێوێت، ئاشتیو ئارامی بەرپا ئەكات، هەستەكان ناسک ئەكاتەوە و مرۆڤەكان بە زنجیرە نادیارەكانی سەواو مامەڵە بە یەكەوە ئەبەستێتەوە . ئەگەر سیستەمی سەرمایەداری بە دروستی دەرک بكرێت، دەرئەكەوێت ئەم سیستەمە نەک هەر نابێتە هۆی لێكترازانی كۆمەڵایەتی، بەڵكو بە پێچەوانەوە بەشەكانی كۆمەڵگا بەشێوەیەكی پتەوتر بەیەكەوە گرێئەدات. لێرەوە رۆشنبیرانی بەرجەستەی بەریتانیایی زیاتر لەوەی خەریكی داڕشتنی بەرنامەی ئەبستراكت بن، سەرقاڵی چارەسەری مەسەلە تایبەتی و عەمەلیەكان بوون.


ڤۆلتێر

ئەم مەسەلەیە پێش هەمویان بۆ ئەو رۆشنبیر و نوسەرە بەرجەستانە راستە كە روداوی رۆشنگەریان لە سكۆتلەندا دروستكرد. سكۆتلەندا لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەدا لەروی ئابوریەوە ناوچەیەكی بەرێژە دواكەوتوو بوو. بەپێی بڵاوكراوەی «یەكێتی» (١٧٠٧) پەرلەمانی سەربەخۆی سكۆتلەندا هەڵوەشایەوە . سەرنەكەوتنی یاكۆبیتیسم (jacobitism) بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەو لاوازبونی زیاتری وڵات. بیریارانی مەزنی سكۆتلەندا وەک دیڤید هیوم و ئادام سمیس لە كاردانەوە بەرامبەر بەم بارودۆخە لەرووی بێ تواناییەوە نەئەگەڕانەوە بۆ شكۆ و مەزنێتی رابردوو، یان نەخشەی یۆتۆپیان بۆ سەربەخۆی سكۆتلەندا نەئەكێشا. ئەوان تێدەگەیشتن ئایندەی سكۆتلەندا پەیوەستە بە مۆدێرنكردنی خێرای كۆمەڵایەتیو پیشەسازیكردنی ئابوریەوە . شێكردنەوە نوێو وردەكانی ئەوان بۆ پێشمەرجە كۆمەڵایەتیەكانی سیستەمی سەرمایەداری و یاسا ئابوریەكانی بازرگانی، دەستكەوتی گەورەن كە بلیمەتی عەمەلی رۆشنگەرانی سكۆتلەندا دروستیكردووە .

ئەگەر رۆشـــنبیرانی کیشـــوەری ئەوروپا هەســـتی جۆراوجـــۆر و تێکەڵو پێکەڵیـــان لەبارەی دەســـتکەوتەکانی رۆشـــنگەری هۆڵەندا هەبوو، ئەوا هیـــچ دودڵیەکیان بەرامبەر دەســـتکەوتەکانی بەریتانیا نەبوو. «ئینگلیز پەرســـتی» کە سەرتاســـەری ئەوروپای گرتبۆوە، بە بڵاوبونەوەی نامە فەلســـەفیەکانی (١٧٣٣) ڤۆڵتێر زیاتر بڵاوبۆوە. ئەم بەرهەمە ستایشـــێکی زۆری ئازادی سیاسی، لێکبوردنو ئاسانگیری مەزهەبی، پێشکەوتنی ئابوری، مۆدێرنەی کلتوریو دەستکەوتە زانستیەکانی (بەر لە هەمویان دۆزینەوەکانی نیوتن)ی ئەکرد. داهێنانە کلتوریەکانی ئینگلیز لە رۆمانی رۆبینسۆن کرۆزۆی بەرهەمی دۆفۆ بەدواوە لە بوارەکانی تریشـــدا بەشـــێوەیەکی فراوان لاسایی کرایەوە. ڤۆڵتێر لە ســـەفەری خۆیدا بـــۆ ئینگلتەرا ئایندەی ئەوروپا لەوێ دەبینی و ئەم ئایندەیەشـــی بە عەمەلی ئەزانی.

حکومەتی ئینگلتەرا خاوەن دەســـتورێکی میانڕەو بوو کە بەردەوام دەربار ئەبوو لە هاوکاریەکی ئالۆزدا بێت لەگەڵ هەردوو ئەنجومەندا. زۆرێک لە بیریاران بڕوایان وابوو کە سنوردارکردنی حکومەتی ناوەندی بەمشـــێوەیە، بەشـــە ئابوریو کلتوریەکانی کۆمەڵگای مەدەنی (هونەرمەندان، بازرگانان، پیشـــەوەران، مامۆســـتایان) هان ئەدات کە بە باشـــترین شێوەی مومکین بە شـــێوەیەکی خۆبەخۆ پەرەبسێنن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گواستنەوەی ئەم سیتسەمە بۆ شوێنەکانی تر زۆر بە ئەستەم مومکین بوو.

لەمەش تێپەڕێ لە زۆرێک لە شازادەنشـــینەکانو پاشایە ئەڵمانیەکاندا کە لە رۆژهەڵاتی روباری ئالپ بوون هێشـــتا ئەرســـتۆکراتە فیودالەکان لەسەر تەختی دەســـەڵات بوون. ئابوری دێهاتی لەم ناوچانـــەدا دواکەوتوو و لاواز بوو، ئاســـتی خوێندەواری زۆر لە خـــوارەوە بوو و ژمارەی تەکنۆکراتو کارخانەدارەکان بە پشـــتگیریەک کە بتوانن لەناو دەرونی سیســـتەمی بالادەستەوە، گۆڕانی ئابوری بنەڕەتی دروســـتبکەن، کەم بوو. لێرەوە لە زۆرێک لە ناوچەکانی کیشـــوەری ئەوروپا، دۆزینەوەی شێوە جیاوازەکان بۆ پەرەسەندنی رۆشنگەری پێویست بوو، شێوەیەک کە بۆ پێشخستنی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی نە وەک ئینگلتەرا پشت بە میکانیزمەکانی بازاڕو داهێنانە فەردیەکان ببەستێو نە وەک فەڕەنســـاش پەلاماری سەرجەم هەلومەرجی بالادەست (status quomonolithic) بدات. بەپێچەوانەوە رۆشـــنبیران ئەبێت یارمەتی لە دەزگا سیاســـیو کۆمەڵایەتیە هەبوەکان وەربگرن و لەم رەوتەدا ئەو دەزگایانەیان ریفۆرم ئەکرد.

کەنیســـەی کاســـۆلیکی رۆم لە باشـــوری ئەڵمانیاو لەو هەرێمانەشـــدا کە زنجیرەی هابسبۆرگ فەرمانـــڕەوا بـــوو، بەرنامەو نەخشـــەی ریفۆرمی تایبەتی خۆی بەرەو پێشـــەوە ئەبـــرد. بەپێی ئەم نەخشـــەیە کەنیسەی کاســـۆلیک هەوڵی دا باوەڕێکی ئاشـــتیخوازانەتر بڵاوبکاتەوە کە جیاواز بێت لە بنەما دۆگماییەکانی روداوی دژە بە ریفۆرمســـازی (counter-Reformation). لەو شوێنانەدا کە پرۆتســـتانیزم باو بوو واتە ئەڵمانیا، سکاندیناڤی، سویس و سکۆتلەندا زانکۆکان وەک ئامرازێک بۆ خزمەتی رەوتی کامڵبونی روداوی رۆشـــنبیری کاریان ئەکرد و مامۆستایان بە راشکاوی بەرگریان لە مەســـیحیەتی عەقڵباوەڕ ئەکرد. ئەم زانکۆیانە نەخشەگەلێکیان بۆ نوێکردنەوەی ئابوری و ریفۆرمی

ڕێکخستنی ئیداری دائەڕشت و بە گەرمیەوە هەوڵیان بۆ بەدیهاتنی دروشمە زانستیەکان ئەدا. زۆرێک لەوان لە لێکۆڵینەوە فەرمیەکانی خۆیاندا لەبارەی ســەرچاوە سروشتیە نەتەوەییەکان چالاک بوون. ئەگەر گیبۆن بڕوای وابوو کە مامۆســتایانی زانکۆی ئۆکســفۆرد لە مەی خواردنەوەدا غەرق بوون‌و ڤۆڵتێر سەرزەنشــتی زانکۆی ســۆربۆنی ئەکرد لەبەر ســەختگیریان لە لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا، جێگەکانی تری وەک ئۆپســالا (سوید)، لاهەو گوتینگون (ئەڵمانیا)ش هەبون کە لە زانکۆکانیاندا سەرەتای داهێنانی سەرسوڕهێنەری ژیانی ئەکادیمی لەسەدەی نۆزدەدا لێئەدرا.

دواجــار ئەبێت ئاماژە بۆ ناوەندە دەربارییەکان بکەین کە خوازیاری حکومەتی ڕۆشــنگەر بوون. ئەو پاشــایانەی بە «ستەمکاری ڕۆشنگەر» بەناوبانگ بوون واتە فردریکی گەورە، کاترینی گەورەو رەنگە ماریاتریزا و بێ هیچ گومانێک کوڕەکەی بەناوی جۆزیفی دوهەم، لە پێداویســتی ئەنجامدانی ریفۆرمــی کۆمەلایەتی گەیشــتبوون/ گەرچی ئەمە تەنها لەبەر ئەوە بوو ئەیانویســت باری دارایی دەوڵــەت باش ببێت‌و مەکینەی جەنگی خۆیان مۆدێــرن بکەنەوە . ئەوان پەروەردەیان بلاوئەکردەوە، سیســتەمی باجیان ریفۆرم ئەکرد، هانی بازرگانیان ئەدا، گومرگــە ناوخۆیەکانیان لائەبردو زنجیرە پلەیەکــی بەڕێوەبەرایەتیان دروســتکرد کە بەپێــی ئەو بتوانن بەڕێوبەرایەتیەکــی تەواو لۆژیکی، بەرهەمهێن‌و ڕێکخراو دروســت بکەن. «زانســتی بەڕێوەبەرایەتــی» (cameralwissenschaft) کە بەهۆی یاساناســانی وەک یۆســتیەوە داڕێژرا و بەهۆی پیاوانی دەوڵەتی وەک کۆنت کاونیتیســەوە بەکارهێنرا، زانســتی سیاسەتی عەمەلیان دروست ئەکرد کە فەرمانڕەوایانی ستەمکاری ئەوروپا بە مەبەستی دروستکردنی «دەوڵەتی ڕێکخراوی پۆلیسی» دایانڕشتبوو(پۆلیس لێرەدا بەمانا باوەکەی لە ســەدەی هــەژدەدا بەکارهێنراوە، واتــە «دەزگای بەڕێوەبەرایەتی» نەک بەمانــا هاوواتەکەی لە سەردەمی هاوچەرخدا «فاشیست»).

خوێندزانان، ئەکادیمیەکان‌و ڕۆشــنبیرانی بەڕێوەبەرایەتی لە بەشــی ئەڵمانی زمانی خۆرهەلاتی ئەوروپا چونە پاڵ ئەو ڕوداوە ڕۆشــنگەریە بیرۆکراتیەی لە «ســەرەوە» دەستی پێکردبوو و بەرەو پێشــەوە دەڕۆیشت. ئەرەســتۆکراتە پێشــکەوتوخوازەکان مۆدێرنەکردنی جوتیاریان لە موڵکەکانی خۆیاندا بەشێوەیەکی ئەزمونی دەستپێکردبوو وە لە ناوچەی وەک بوهیمیا چەندان ئەنجومەنیان بۆ بلاوکردنەوەی زانست و بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا دروستکردبوو. لە شارەکانی سەرتاسەری ئەوروپادا لە کۆپنهاگنەوە بیگرە تا میلان ناوەندی تازە دروســتکراوی خوێندنەوەیەک دروســتبوو کە لەگەڵ خواردنەوەی قاوەدا کە بەتازەیی گشتگیر بوو بوو، گوێیان لە وتارگەلێک لەبارەی مێژوو و فەلسەفەو ئاســۆی ئایندەی مرۆڤەوە ئەگرت. لەمجۆرە ناوەندانەدا کە خەڵکی لە کارایی و بەرزتر بوونی کلتور و ئادابی عاقلانە گەیشتبوو، فێری کۆمەڵێک زانینی سودمەند بوو بوو، سەلیقە و هەستی هونەری خۆیان ناسک ئەکرد، مەسەلەگەلێک کە بۆ بلاوکردنەوەی ئەدیسۆن و ستیل لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەدا لە بلاوکراوەی تەماشاگەر (The spectator) هەوڵی زۆریان دا.

چالاکیەکانی ڕۆشــنگەری لــە وڵاتەکانی ئەوروپای ناوەندی لەناو بونیادە سیاســیە هەبوەکاندا رووی ئەدا. بیریارانی ڕۆشــنگەری لەم وڵاتانەدا بە پێچەوانەی فەیلەســوفانی فەڕەنســیەوە ئەرکی

سەرەکی خۆیان بە هێرشکردن بۆ کەنیسە و دەوڵەت و هێنانەئارای دروشمە رادیکاڵەکان بۆ ئازادیە سیاســـیەکان نەئەزانی. لە دیدی فەیلەسوفانی فەرەنســـیەوە ئەمجۆرە ستراتیژیانە روکەشو سادە و ســـاوێلکانە و لە هەمووی گرنگتر لە پێشـــەوە مەحکوم بە شکســـت بوو. گەرچی لەم قۆناغەدا هێشـــتا جۆرێک کۆنزەرڤاتیڤی سیاسی باڵادەســـت بوو، بەڵام ئەم حاڵەتە نەئەبووە هۆی لاوازبوونی رەهەنـــدی وروژێنەری بیرەکانی رۆشـــنگەری لەم وڵاتانەدا. چینە خوێنـــدەوارەکان لەم وڵاتانەدا بە هاوکاری بڵاوکراوەکان، رۆژنامەکان، کتێبخانەو ئەنجومەنە ئەدەبیە تازەکان کە لە گوشـــە و کەناردا دروســـت ئەبوون، شـــێوەو ئادابی ژیانی مۆدێرنی خۆیان ئەخستە بەر باس و لەم رێگەیەوە ئەگەری گۆڕانکاریەکانی ئایندەیان دەرەخسان.

لایەنگرانـــی رۆشـــنگەری لە بەریتانیـــا تارادەیەکی زۆر رێکەوتنی ١٦٨٨یـــان قەبوڵکرد بوو، وە بەرگریان لیئەکرد. ئەوان هەوڵی خۆیان تەرخان کردبوو بۆ پەرەســـەندنی کۆمەڵگا لەرێگەی گۆڕانی لەســـەرخۆی ئابوری و چاککردنو پێشـــکەوتنی هەلومەرجی فەردی. لە کۆلۆنەکانی ئینگلتەرادا لە ئەمەریکای باکور رۆشـــنگەری بوو بوو بـــە زاراوەی تایبەتی شۆڕشـــگێڕانو بونیادنەرانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەر لە ســـەرەتای دامەزراندنی کۆمـــارەوە توانایەکی دەگمەنیان هەبوو بۆ دروستکردنی سیاسەتێکی رۆشنگەرانە.

بیریارانی رۆشـــنگەری لە ئەوروپای ناوەڕاســـتدا رێگەی خۆیان لەگەڵ رێگەی پیاوانی دەوڵەتدا بەیەک شـــت ئەزانیو ئەوانیان بە نوێنەرانو جێبەجێکارانی پێشـــکەوتنی هاوســـەنگ و رێکخراوی کۆمەڵایەتـــی ئەزانـــی. هەلومەرج و پەیکەربەندی بیرەکانی رۆشـــنگەری بەر لە هەموو شـــتێک لە فەرەنسا ناجێگیر و گۆڕاو بوو.

فەیلەسوفانی رۆشنگەری فەرەنسی بەپێچەوانەی هاوبیرانی ئینگلیزی خۆیانەوە تەنها ئەیانتوانی لە هەلومەرجی پاشایەتی فەرەنسا نیگەران بن. ئەم پاشایەتیە دواکەوتوو، سەرکوتکەر و لە شانۆی نێونەتەوەییدا ناســـەرکەتوو و بێ بایەخ بوو. ئەوان بە پێچەوانەی زۆرێک لە بیریارانی رۆشـــنگەری ئەڵمانی، هەســـتی وەفاداریان بۆ دەوڵەت نەبوو، جگە لـــە چەند ئاوارتنێک وەک تۆرگۆ، دەوڵەتیش هیچ دەسەڵاتو پلەیەکی سیاسی پێ نەئەبەخشین.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێت لەوەی کە گوترا ئەو دەرئەنجامی هەڵەیە وەربگرین کە فەیلەسوفانی بەرجەســـتەی رۆشنگەری لە فەرەنسادا رۆشنبیرانی نائومێدو لەخۆ نامۆ یان کەسانێکی هیچ بوون کە لە گۆشـــەی خۆیاندا برســـێتیان ئەچەشت یان دەسبەســـەرکەرانی یاساشکێن بوون کە بەناچار رویان کردبووە ژیانی ژێرزەمینی و نهێنی و هیچیان نەبوو تا لەدەســـتی بدەن. راســـتیەکەی تەواو پێچەوانـــەی ئەمە بوو، زۆرێک لـــەوان لەهەمویان زیاتر ڤۆڵتێر، زۆر دەوڵەمەنـــد بوون و ناوبانگی زۆریـــان هەبوو، وەک یاســـادانەرێکی نافەرمی و جێگر، وەک دەوڵەتێک لـــە مەنفادا (quasi-exile) جێگەی ســـتایش بوون. لویی پانزەهەمو لویی شـــانزەهەم بەشێوەیەکی مەزاجی جاروبار گوێیان لە قســـەکانیان ئەگرن و هەندێکجاریش هێرشیان ئەکردنە سەر، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی فەرامۆشیان کردبوون، وەک چۆن فیزۆکراتەکانیان (پێشـــەنگانی تیورەی ئابوری ئازاد) فەرامۆش کردبوو. لەبری

ئەمە چینە خوێندەوار، مۆدێرنو عاقڵەکان کتێبەکانیان ئەکڕین و ناوبانگیان بۆ دروســـت ئەکردن. هێزی فەیلەسوفانی رۆشنگەری فەڕەنسا (ناوبانگیان ئەبووە هۆی ئەوەی لەبیر نەچنەوە) و هەروەها لاوازیان هەر ئەگەڕایەوە بۆ ئەم خاڵە.

لە هەر وڵاتێکدا پەیوەندیەکی تایبەت لەنێوان ئەرستۆکراتو رۆحانیەکان (چینی یەکەمو دوهەمی کۆمەڵایەتی) لەلایەکو خەڵک (چینی ســێهەم) و لایەنگرانی رۆشــنگەری (بیریاران و تیورەسازان، واتە چینی چوارەم) لە لایەکی ترەوە دروست بوو بوو. لە وڵاتەکانی ئەوروپای ناوەڕاستو خۆرهەڵاتو تەنانەت لە دۆک نشــینەکانی بچوکی ئیتاڵیاو پورتوگالدا کــە حکومەتی رەهایان هەبوو، دەرگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی جدی و چارەنوسساز بەهۆی لایەنگرانی رۆشنگەریەوە دروست نەبوو. ئاراستەی لایەنگرانی رۆشنگەری لەم ناوچانەدا پەیوەستبوون بوو بە رژێمی هەبوو وە قەبوڵکردنی باڵادەستی ئەم رژێمە بوو.

لە ئینگلتەرادا بە پێچەوانەوە دەرگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەستی پێکرد، بەڵام هیچکات هێندە توند نەبوو کە شێوەیەکی چارەنوسساز وەربگرێت، چونکە دەوڵەت ئازادی رادەربڕینی قەبوڵکردبوو، وە هەلومەرجێکی بەرێژە گونجاوی بۆ دروســـتبون و پەرەسەندنی کۆمەڵگای مەدەنی و گەشەکردنی ئابوری رەخســـاندبوو. نوســـەرانی ســـەربەخۆ، خاوەن پێشەســـازیەکان، رەخنەگرانو بانگەشەکەرە سیاســـیەکان بە هەرەشـــەیەکی واقعی بۆ دەوڵەت دانەئەنران. رۆشنبیرانو هونەرمەندانی ئینگلیزی زۆرجار دژی شـــاو دەوڵەت قســـەیان ئەکرد، بەڵام شوناســـی خۆیان بە قوڵی لەگەڵ نەتەوایەتیاندا بەیەک شت ئەزانیو زۆرجار بەشێوەیەکی زیادەڕەویانە نیشتیمانپەروەر بوون.

لەم ناوەدا فەڕەنسا ئاوارتە بوو؟ کۆمەڵگای فەڕەنسا ئەوەندە مۆدێرن بوو کە بیریاران و رۆشنبیرانی خاوەن نفوزی هەبێت کە بڕوایان بە هێزی خۆیان هەبوو، نەبەستراوبونەوە بە پارێزگاری دەربارەوە، و پێویستیان بە پلەکانی کەنیسە یان پلە و پایەی زانکۆیی نەبوو. بەڵام بێگومان بیریارانی فەڕەنسی لەوە ئەترســـان لە لایەن پلەکانـــی دەوڵەتەوە چاودێری بکرێن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا ناتوانرێ بگوترێت کە رۆشـــنگەری بووە هۆی دروستبونی شۆڕشـــی گەورەی فەڕەنسا. بەڵام ئەم بزوتنەوەیە بێگومان یارمەتی دروستبونی هەلومەرجێکی دا کە تیایدا ئەگەری وەفاداری ئایدۆلۆژیانە بۆ رژێمی کۆن، بەشێوەیەکی هەمیشەیی و کامڵ لەناوچوو.

## سەرچاوە:

وەرگێڕانی فەسڵی شەشەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە

*ری پورتر: مقدمەای بر روشنگری. ترجمە: سعید مقدم. تهران، اختران ١٣٧٨.



# هەست و نەست
# Ego and Id

**زیگمۆند فرۆید**
**لە فارسییەوە: هادی محەمەدی**

## ١. دەروونی وشیار و ناوشیار

تیۆری سەرەکی دەروونشیکاری، زەین بە دوو کەرت دابەش دەکات: بەشی وشیار و بەشی ناوشیار. دەروونشیکاری بەپێی ئەم تیۆرییە رەوتەکانی پاتۆلۆژیکی ژیانی دەروونی مرۆڤ راڤە دەکات، ئەو رەوتانە کە هەم بە زۆری روودەدەن و هەم گرنگن. ئەم دابەشکارییە جێگای ئەم رەوتانە لە قاڵبی زانستدا دیاری دەکات. بە وتەیەکی تر، دەروونشیکاری ناتوانێ سروشت و ناوەرۆکی زەین لە دەروونی وشیاردا دیاری بکات، بەڵام بەناچار وشیاری بە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی زەین دەزانێ کە رەنگە سەرەڕای خەسڵەتەکانی تر، بوونی هەبێ یان نەبێ.

ئەگەر پێم وابوایە کە هەموو هۆگرانی دەروونناسی ئەم کتێبە دەخوێننەوە، پێم سەیر نەبوو کە هەندێ لە خوێنەران تەنیا پاش چەند لاپەڕە تووڕی بدەن، چونکە لێرەدا یەکەمین تێزی کۆنی دەروونشیکاری دێتەئاراوە. بۆ زۆربەی ئەو کەسانە کە فەلسەفەیان خوێندووە، وێناکردنی پرسێکی زەینی ناوشیارانە، هێندە دوور لە راستییە کە لە رووی لۆژیکییەوە بە ئاسانی رەتی دەکەنەوە. بە رای من هۆی ئەم شتە ئەوەیە کە ئەم کەسانە هەرگیز دوو دیاردەی خەوی دەسکرد (hypnosis) و خەون (dream) یان شرۆڤە نەکردوە. بێجگە لە هێماکانی پاتۆلۆژیک، ئەم دوو دیاردەش قەبووڵکردنی دیدگای من وەک پێویستی دەردەخەن. دیدگای ئەم کەسانە لەمەڕ دەروونناسی ناتوانێ دوو پرسی خەون و هیپنۆتیزم راڤە بکات.

"وشیارانەبون" لە پلەی یەکەمدا چەمکێکی تەواو راڤەییە و بەپێی راستەوخۆترین و حەتمیترین جۆری وشیاری پێکدێ. ئەزموونەکان پیشان دەدەن کە توخمێکی زەینی (بۆ وێنە دیمەنێک) زۆر جار

بۆ ماوەیەکی درێژ لە بەشی وشیاردا نامێنێتەوە. بەپێچەوانەوە، سروشتی حاڵەتی وشیارانە کاتییە. بە وتەیەکی تر، وێنایەک کە ئێستا وشیارانەیە، ساتێک دواتر ناوشیارانەیە، هەرچەند رەنگە لە دۆخێکی تردا بە ئاسانی جارێکی تر وشیارانە بێتەوە. بەڵام نازانین ئەم وێنایە لەم ماوەیەدا لە چ دۆخێک دا بووە. دەکرێ بڵێین ئەم وێنا لەم نێوەدا "شاراوە" (latent) بووە، یانی هەموو ساتێک توانیویە بێتە زەینی وشیارەوە. یان ئەگەر بڵێین ئەو وێنایە ناوشیارانە بووە، دیسان بە دروستی راڤەمان کردووە. لێرەدا "ناوشیارانە" یانی "شاراوە"، یانی "دەکرێ وشیار ببێتەوە". بێگومان بیرمەندان دژایەتی دەکەن و دەڵێن بۆ ئەم مەبەستە "ناوشیارانە" چەمکێکی شیاو نییە، چوونکە نابێ لە کاتی شاراوەییدا ئەم وێنایە بە توخمێکی زەینی بزانین...

بەڵام ئێستا بە لەبەر چاوگرتنی هەندێ ئەزموون کە دینامیکی زەینی لەواندا رۆڵی هەیە، لە رێگایەکی دیکەوە چەمکی ناوشیار راڤە دەکەین. ئێمە تێگەیشتووین — یان بە وتەیەک بەناچار ئەم پرسەمان قەبووڵ کردووە- کە چەندین پرۆسەی زەینی یان وێنای ئێجگار بەهێز هەن (لەم قۆناغەدا بۆ یەکەم جار هۆکاری رێژەیی یان ئابووری دێتەئاراوە) کە دەتوانێ لە ژیانی دەروونی مرۆڤدا کاریگەرییەک لە چەشنی کاریگەری وێنا ئاساییەکان بەدیبێنێ (رەنگە هەندێ لەم کاریگەرییانە وەک وێنایەکی وشیارانە دەرکەون)، هەرچەند خودی ئەم وێنایانە رەهەندی وشیارانە بەخۆوە ناگرن. لێرەدا پێویست نییە باسەکانی پێشوو دووپات بکەینەوە، تەنیا دەڵێین دەروونشیکاری لەم قۆناغەدا ئەم بابەتە راڤە دەکا و دەڵێ هۆی ئەوە کە ئەم وێنایانە وشیارانە نابنەوە، دژایەتی هێزێکی تایبەتە کە ئەگەر نەبوایە، رەنگە ئەو وێنایانە بهاتنایەتە وشیارییەوە و ئەوجار دەردەکەوت کە جیاوازی ئەوان لەگەڵ توخمە تەواو زەینییەکان ئێجگار کەمە. میتۆدی دەروونشیکاری رێگایەکی بۆ لابردنی ئەم هێزە دژبەرە و وشیارکردنەوەی وێناکان دۆزیوەتەوە و بەمجۆرە رەوایی خۆی سەلماندووە. تا کاتێ ئەم وێنایانە لە دۆخی ناوشیاردان، چەمکی چەپاندن یان "سەرکوت" لەمەڕ ئەوان بەکار دێنین، ئەو هێزەش کە سەرکوتی داهێناوە و بەرێوەی دەبات بە چەمکی "بەرەنگاری" پێناسەی دەکەین.

بەمجۆرە چەمکی ناوشیار لە تیۆری سەرکوت وەردەگرین. بەڕای ئێمە پرسی سەرکوتکراو، پێش نمونە (prototype) ی ناوشیارە. ئەڵبەت دوو جۆر ناوشیارمان هەیە: یەکەم، ناوشیاری نادیار کە [بە ئاسانی] وشیار دەبێتەوە، دووهەم، ناوشیاری سەرکوتکراو کە لە خۆڕا و بە ئاسانی وشیار نابێتەوە. ئەم روانگەیە لەمەڕ چالاکی زەین، لەسەر شێوازی راڤەکردنی زەین و ئەو چەمکانەی کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاری دێنین، کاریگەری هەیە. ناوشیاری نادیار کە تەنیا بە مانای راڤەیی ناوشیارە نە بە مانای چالاکانە (دینامیک)، بە "نیوەوشیار" پێناسە دەکەین و چەمکی "ناوشیار" تەنیا بۆ پرسی سەرکوتکراو بەکار دێنین کە لەرووی دینامیزمەوە ناوشیار بێت. بەمجۆرە ئێستا سێ چەمکمان هەیە کە بریتین لە: وشیار، نیوەوشیار، ناوشیار. ئەم چەمکانە ئیتر تەنیا بە مانای راڤەیی بەکار نایەن. رەنگە نیوەوشیار بەرێژە لە بەشی وشیار نزیکترە نە ناوشیار، لەبەر ئەوە کە ناوشیارمان بە خاوەن خەسڵەتی زەینی زانی، بەدڵنیاییەوە دەبێ نیوەوشیاری نادیار بە شتێکی زەینی بزانین. بەڵام ئەی بۆ لەگەڵ بیرمەندان هاودەنگ نەبین نیوەوشیار و ناوشیار لە زەینی وشیار جیا نەکەینەوە؟ لەم کاتەدا بیرمەندان پێشنیارمان

دەکەن کە نیوەوشیار و ناوشیار وەک دوو جۆر یان دوو قۆناغی "دەروون ئاسا"(psychoid) پێناسە بکەین تا بە تەبایی بگەین. بەڵام باسکردنی ئەم بابەتە، کێشەی زۆر دروست دەکا و تاقە هەقیقەتی گرنگ (ئەوە کە ئەم دوو جۆرە "دەروون ئاسا" خەسڵەتی زەینییان هەیە) کەم بایەخ دەکات. ئەم پرسە دیدگایەکی دۆگم بەهێز دەکات کە بەر لە ناسینی بەشی ناوشیار برەوی هەبوو.

تا کاتێ لەبیرمان بێ کە لە رووی راڤەییەوە دوو جۆر ناوشیار، بەڵام لە رووی دینامیزمەوە تەنیا یەک جۆر ناوشیارمان هەیە، دەتوانین بە ئاسانی سێ چەمکی وشیار و نیوەوشیار و ناوشیار بەکار بێنین. جار و بار بە مەبەستی شیکردنەوەی ئەم بابەتە، دەتوانین جیاوازی ناوبراو پشتگوێ بخەین، بەڵام هەندێ جار حەتمەن دەبێ ئەم جیاوازییە لەبەرچاو بگرین. هاوکات، کەم تا زۆر لەگەڵ ئەم ئاڵۆزییەی بەشی ناوشیار راهاتوین و کێشەی بۆمان ساز نەکردووە. پێم وانییە بتوانین لەم ئاڵۆزییە چاوپۆشی بکەین. جیاوازی نێوان بەشی وشیار و ناوشیار، پێوەندی بە تێگەیشتنەوە هەیە کە دەبێ وەڵامی "ئا" یان "نا" بێت. کاری تێگەیشتن بە تەنیایی ئەم شتە روون ناکاتەوە کە بۆچی فڵان شت دەرک دەکرێت یان دەرک ناکرێت. کەس نابێ لەم شتە سکاڵا بکات، چونکە خودی ئەم دیاردە، هۆکاری ئەکتیڤ بە شێوەی ئاڵۆز دەردەخات.[1]

بەڵام لە درێژەی رەوتی دەروونشیکاریدا دەرکەوت کە تەنانەت ئەم جیاوازییانەش شیاو نین و بۆ مەبەستی پراکتیکی ناتەواون. ئەم پرسە بە چەندین شێوەی جیاواز دەرکەوتووە، بەتایبەت بەمشێوەیە: وتمان هەر تاکێک خاوەن سیستەمێکی تۆکمەیە کە لە چەندین پرۆسەی زەینی پێکهاتووە و ئەم شتەمان بە "خود/هەست" (ego) ی تاک پێناسە کرد. دەروونی وشیار بەم "خود"ەوە بەستراوە. خود شێوازەکانی بزاوتن (motility) — یانی رەوتی هەیەجان بۆ دەرەوە- کونترۆڵ دەکات؛ "خود" ئۆرگانێکی زەینییە کە بەسەر هەموو پرۆسەکانی پێکهێنەری خۆیدا چاودێری دەکا و شەوانە دەخەوێ، بەڵام تەنانەت لە خەویشدا خەونەکان سانسۆر دەکات. "خود" بەشێک لە خواستەکان پەسیڤ و بێ کاریگەر و سەرکوت دەکا و لە زەین دەریان دەکات. کاتێ دەروونشیکاری، ئەم خواستە دەرکراوانە لەگەڵ "خود" تووشی ناکۆکی دەبن، کەوابوو دەبێ بەرەنگاری "خود" لەئاست خواستە سەرکوتکراوەکان بسڕینەوە. لە کاتی دەروونشیکاریدا تێدەگەین کە کاتێ دەمانەوێ نەخۆش هەندێ کاری تایبەت بکات، لەگەڵ دژواری بەرەورووو دەبێ. بە وتەیەکی تر، وتەکانی (تەداعی) نەخۆش کاتی نزیکبوونەوە لە خواستە سەرکوتکراوەکان، دەپچڕێت. لەم کاتەدا دەڵێین بەرەنگاری بەسەر ئەودا زاڵ بووە، بەڵام ئەو بەتەواوی لەم شتە بێ خەبەرە و تەنانەت ئەگەر بەهۆی هەستە ناخۆشەکانی، بەرەنگاری هەست پێبکات، دیسانیش نازانێ هۆی ئەم بەرەنگارییە چییە و لە کوێوە دێ، بەڵام چونکە ئەم بەرەنگارییە بەرهەم و پەیوەست بە "خود"ی ئەوە، لەگەڵ دۆخێکی پێشبینیی نەکراو بەرەو روو دەبین. ئێمە لە "خود" دا شتێکمان دیوەتەوە کە ئەویش ناوشیارە و رێک وەک خواستە سەرکوتکراوەکان رۆڵ دەگێڕێ، یانی سەرەڕای ئەوە کە لە دەروونی وشیاردا جێگەی نییە، بەڵام کاریگەری زۆرە و بۆ ئەوە کە بێتە دەروونی وشیارەوە، دەبێ کارێکی تایبەتی پێ بکەین. بەپێی دیدگای دەروونشیکاری، ئاکامی ئەم داهێنانە ئەوەیە کە ئەگەر تەنیا بەشێوەی ئاسایی شیکاری بکەین و بۆ وێنە بمانەوێ پیشانی بدەین کە جۆرەکانی دەروونژاکاوی

بەرهەمی ململانێی نێوان دەروونی وشیار و ناوشیارن، لەگەڵ دنیایەک ئاڵۆزی و وشیاری بەرەو روو دەبین. ناچارین ئانتی تێز (antithesis)ێکی دیکە دابنێین کە زادەی دیدگای ئێمەیە، ئانتی تێزێک کە لە نێوان "خود"ی تۆکمە و خواستە سەرکوتکراو و دەرکراوەکانیدایە.

ئەڵبەت ئەم داهێنانە چەندین ئاکامی گرنگی بۆ چەمکی دەروونی ناوشیار هەیە. تۆژینەوەیەکی کارا رێنوێنی کردین تا لە روانگەی خۆماندا یەکەمین رێفۆرم ئەنجام بدەین و دید و بۆچوونمان دەربارەی پێکهاتەی زەین، بە دووهەم رێفۆرمی گەیاندین. ئێستا دەزانین کە دەروونی ناوشیار و خواستە سەرکوتکراوەکان یەک شت نین. کەم تا زۆر ئەم خاڵە بە دروست دەزانین کە هەر شتێ سەرکوت بکرێ لە دەروونی ناوشیاردا جێگیر دەبێ؛ بەڵام هەموو ئەو شتانە کە لە دەروونی ناوشیاردا جێگیر بوون، سەرکوتکراو نین. بەشێک لە "خود" دەتوانێ ناوشیار بێت و بێگومان هەر واشە، بەڵام کەس نازانێ کە ئەم بەشە چەندە گرنگە. ئەم بەشە لە دەروونی ناوشیار کە بەشێکە لە "خود"، هەر هەمان دەروونی نیوەوشیاری شاراوە نییە، چونکە ئەگەر وا بێت، تا نەیەتە دەروونی وشیارەوە ئەکتیڤ نابێ و پرۆسەی وشیارکردنەوەی لەگەڵ وەها دژوارییەکی بەرین بەرەو روو نابێت. هەرکات تێدەگەین بەناچار دەبێ وایدابنێین کە سێهەمین دەروونی ناوشیار لە ئارادایە کە سەرکوت نەکراوە، دەبێ قەبووڵ بکەین کە خەسڵەتی ناوشیارانەبوون بە شێنەیی گرنگی خۆی دەدۆڕێنێ. بەمجۆرە، ناوشیارانەبوون وەک خەسڵەتێک دەردەکەوێ کە دەتوانێ مانای زۆری هەبێ. بەڵام بەپێچەوانەی ویستی خۆمان ناتوانین ئەم خەسڵەتە بە بنەمای چەندین نەتیجەی بەرفراوان و حەتمی بزانین. سەرەڕای ئەمەش، نابێ ئەم خەسڵەتە پشتگوێ بخەین، چونکە پرۆسە زەینییەکان چ وشیارانە یان ناوشیارانە بن، سەرئەنجام لە تاریکی دەروونناسی قووڵدا رێنوێنیمان دەکەن.

## ٢. "خود" و "نەست"

تۆژینەوەی پاتۆلۆژیک بە زۆری سەرنجی ئێمەی بەرەو خواستە سەرکوتکراوەکان راکێشاوە. ئێستا کە دەزانین "خود" دەتوانێ بە مانای راستەقینە ناوشیار بێت، دەمانەوێ زانیاری زیاترمان لێ هەبێ. تا ئێستا تاقە رێنوێنی ئێمە لە تۆژینەوەکانماندا خەسڵەتی جیاکەرەوەی وشیاری لە ناوشیاری بووە و ئێستا دەزانین کە ئەم پرسە دەتوانێ زۆر ئاڵۆز بێت.

ئێستا هەموو زانستی ئێمە بە دەروونی وشیارەوە بەستراوە. تەنانەت دەتوانین بە وشیار کردنەوەی دەروونی ناوشیار بیناسین. بەڵام پەلە مەکەن، مەبەست لە "وشیارکردنەوەی شتێک" چییە؟ ئەم کارە چۆن هەموار دەبێت؟

ئێستا ئیتر دەزانین کە لەم بوارەدا دەبێ لە کوێوە دەست پێبکەین. وتمان کە دەروونی وشیار، رووبەری دەرەوەی سیستەمی زەین پێکدێنێ. بە وتەیەکی تر، ئێمە بەشی وشیارمان وەک کارکردێک لەگەڵ سیستەمێک پێوەند داوە کە لە رووی شوێنەوە، یەکەم دیاردەیە کە دنیای دەرەوە لەگەڵی بەرەو روو دەبێ. کاتێ دەڵێین شوێن، تەنیا رەهەندی کارکردیمان مەبەست نییە، بەڵکوو لەم بابەتەوە هەروەها چەمکی ئاناتۆمیکمان مەبەستە. لە تۆژینەوەکانماندا دەبێ رووبەری دەرەکی وەک خاڵی

دەسپێک حساب بکەین.

هەموو هەستەکان کە لە دەرەوە و ناوەوە وەردەگیرێن، سەرەتا لە دەروونی وشیاردان. بەڵام ئایا ئەم پرسە پرۆسەی دەروونی کە دەکرێ — بەگشتی- بە پرۆسەی ئەندێشە پێناسەی بکەین، دەگرێتەوە؟ ئەم پرۆسە ئاڵوگۆڕی هێزی زەین پیشان دەدات کە لە کاتێ گۆڕانیدا بۆ پراکتیک لە بەشی ناوەوەی سیستمی زەیندا روودەدات. ئایا بزاڤی ئەم خواستانە کە دەروونی وشیار پێکدێنێ، بەرەو رووبەری دەرەوەیە؟ یان دەروونی وشیار بەرەو دنیای دەرەوە دەڕوات؟ ئەم پرسە یەکێ لەو کێشانەیە کە کاتێ روودەدات کە بەشێوەی جدی بیری شوێنی یان تۆپۆگرافیک (topographic) ی ژیانی دەروونی راڤە دەکەین. هەر کام لەم دوو ئەگەرە ئیمکانی نییە. کەوابوو دەبێ رێگەی سێهەم هەبێ.

پێشتر لە شوێنێکی تردا وتوومە کە جیاوازی گرنگی نێوان دەروونی ناوشیار و نیوەوشیار ئەوەیە کە بەشی ناوشیار مەیل و خواستە نادیارەکان دەگرێتەوە، بەڵام بەشی نیوەوشیار لەگەڵ وشەنوێنی (word-presentation) پێوەندی هەیە. ئەم یەکەم هەوڵە بۆ دەرخستنی خەسڵەتەکانی دوو سیستمی نیوەوشیار و ناوشیارە کە پشت بە پێوەندی ئەم دوانە لەگەڵ دەروونی وشیار نابەستێ. کەوابوو، پرسیاری "چۆن شتێک دێتە نێو دەروونی وشیار؟" دەتوانین بەشێوەیەکی شیاوتر بەمجۆرە گەڵاڵە بکەین: "چۆن شتێک دێتە نێو دەروونی نیوەوشیار؟"؛ وەڵام بەمجۆرەیە: "لە رێگەی هاتنە نێو دەروونی وشیار و بەهۆی وشەنوێنییەکانی."

ئەم وشەنوێنییە پاشماوەی ئەو بیرەوەرییانەیە کە سەردەمێک بەشێک لە تێگەیشتنی ئێمە بوون و وەک هەر پاشماوەیەکی بیرەوەری(mnemic residues) ، دەتوانێ جارێکی تر بێتە نێو دەروونی وشیارەوە. پێش ئەوەی زیاتر باسی چۆنیەتی وشەنوێنی بکەین، ئەم پرسە لەبەرچاومان وەک داهێنانێکی نوێ دەردەکەوێ کە تەنیا ئەو شتەی سەردەمێک دەرکێکی وشیارانە بووە دەتوانێ بێتەوە دەروونی وشیارەوە و، هەموو ئەو شتانە (بێجگە لە هەستەکان)کە لە دەروون و بەهۆی وشیاربوونەوە بەرهەم دێن دەبێ خۆیان بۆ دەرکی دەرەکی بگۆڕن: ئەم پرسە لە رێگەی نیشانەکانی بیرگە (memory traces) وە هەموار دەبێت.

پاشماوەکانی بیرەوەری بەمجۆرە لەبەر چاو دەگرین کە سیستمێکە لەپاڵ سیستمی تێگەیشتنی-وشیاردا تا وزەی دەروونی[٢] پاشماوەکان بتوانێ بە ئاسانی لە دەروونەوە بێتە نێو سیستمی تێگەیشتنی- وشیار. لێرەدا بەخێرایی بیر لە خەیاڵات (hallucinations) و ئەو راستییە دەکەینەوە کە هەمیشە دەتوانین رۆشنترین بیرەوەری لە خەیاڵ و تێگەیشتنی دەرەکی جیابکەینەوە. بەڵام بەخێرایی ئەم بیرە دێتە نێو مێشکمان کە کاتێ هەر بیرەوەرییەک زیندوو دەبێتەوە، وزەی دەروونی لە سیستمی بیرگەدا دەمێنێتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە خەیاڵ — کە لە تێگەیشتن جیاناکرێتەوە- رەنگە کاتێ دروست ببێت کە وزەی دەروونی نە تەنیا لە نیشانەی بیرگەوە بەرەو تێگەیشتن پەرەدەستێنێ، بەڵکوو بەتەواوی لەودا جێگیر دەبێ.

پاشماوەکانی گوتاری (verbal residues) بە زۆری لە هەستی بیستیارییەوە سەرچاوە دەگرن، کەوابوو دەتوانین بڵێین سیستمی نیوەوشیار، سەرچاوەیەکی حسی تایبەتی هەیە. ئامێرە دیدارییەکانی

وشەنوێنی، گرنگی پلە دوویان هەیە و (لە رێگەی خوێندنەوە پێکدێن) و رەنگە هەر لە سەرەتادا پشتگوێ بخرێن. هەر ئەم شتە سەبارەت بە وێنە بزاڤییەکانی (motor images) وشەکانیش — کە بۆ ئەو کەسانەی کەڕ و لاڵ نین وەک هێمای یارمەتیدەر رۆڵ دەگێڕن- راستە. سەرەڕای ئەمەش، وشەیەکی پاشماوەی بیرەوەری، وشەیەکە کە پێشتر بیستراوە.

نابێ بۆ سادەکردنەوەی ئەم پرسە گرنگی پاشماوەکانی بیرەوەری دیداری لەبیر بکەین، یان ئەگەری وشیاربوونەوەی رەوتی ئەندێشە لە رێگەی گەڕانەوە بۆ پاشماوە دیدارییەکان رەت بکەینەوە. تۆژینەوەی خەون و خەیاڵ (fantasy) بەپێی تۆژینەوەکانی ڤارێندانک، تایبەتمەندی بیرکردنەوەی دیداریمان بۆ راڤە دەکاو تێدەگەین کە ئەو شتانەی بەپێی ئەم جۆرە بیرکردنەوە دێنە دەروونی وشیارەوە، تەنیا بابەتی ئاشکرای ئەندێشەن. هەروەها پێوەندی توخمە جیاوازەکانی ئەم بابەتە، کە فۆرمی ئەندێشە دیاری دەکات، ناتوانێ هێمای دیداری بەخۆوە بگرێت. کەوابوو، بیرکردنەوە بەپێی وێنەکان، تەنیا شێوازێکی ناتەواوی وشیاربوونەوەیە. شێوازی بیرکردنەوەی دیداری لە بەراورد لەگەڵ بیرکردنەوەی بیستیاری، لە پرۆسە ناوشیارەکان نزیکترە و بێگومان هەم لە رووی گەشەی تاک (ontogenetically) و هەم لە رووی گەشەی رەگەز (philogenetically) ەوە کۆنترە.

بۆ درێژەدان بە باسەکەمان دەبێ وایدابنێین کە ئەگەر شتێک لە دەروونی ناوشیاردا بێت، لەم رێگەوە دێتە نێو دەروونی نیوەوشیار، کەوابوو ئەی ئەو شتەی کە سەرکوت کراوە چۆن دێتە دەروونی نیوەوشیارەوە؟ بەهۆی دەروونشیکاری. بەمپێیە، دەروونی وشیار ناگۆڕدرێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە، دەروونی ناوشیاریش وشیار نابێتەوە.

پێوەندی دەرکی دەرەکی لەگەڵ "خود" تەواو ئاشکرایە، بەڵام پێویستە پێوەندی دەرکی دەروونی لەگەڵ "خود" بە جیا راڤە بکەین. جارێکی تر ئەم گومانە دێتە ئاراوە کە ئایا بەڕاستی دەتوانین تێکڕای دەروونی وشیار بە سیستمێکی رواڵەتی تێگەیشتنی — وشیارانە بزانین؟

تێگەیشتنی دەروونی دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ هەست بە چەندین پرۆسە بکات کە لە چەندین شێوازی هەرە جیاوازدا و هەروەها لە قووڵترین قوژبنی سیستمی زەیندا بەدی بێن. زانیاری زۆر کەممان دەربارەی ئەم هەستانە هەیە. ئەو هەستانەی کە پێوەندییان بە لەزەت و نەبوونی لەزەتەوە هەیە، رەنگە باشترین نموونەی ئەم هەستانە بن. ئەم هەستانە کۆنتر و بنەماییتر لەو تێگەیشتنانەن کە لە دەرەوە سەرچاوە دەگرن، یان تەنانەت لە کاتی خەوتنی دەروونی وشیاریشدا روودەدەن. لە وتارێکی تردا روانگەی خۆم لەمەڕ گرنگی ئابووری زێدەتری ئەم هەستانە و هۆکاری بان دەروونناسانەی ئەم پرسە باس کردووە. ئەم هەستانە وەک تێگەیشتنی دەرەکی، فرەشوێنی (moltilocular) ن؛ بە وتەیەکی تر، رەنگە ئەم هەستانە هاوکات لە چەندین شوێنی جیاوازەوە سەرچاوە بگرن و هەر بەمهۆیە خاوەن چەندین تایبەتمەندی جیاواز و تەنانەت دژوار بن.

ئەو هەستانەی کە لەزەت بەخشن خاوەن سروشتی بزوێنەرانە نین، بەڵام ئەو هەستانە کە لەزەت بەخش نین ئێجگار بزوێنەرن و بەرەو گۆڕان و دامرکان دەڕۆن. بەم بۆنەوەیە کە ئەو هەستانەی لەزەتخواز نین، گەشە بە وزەی دەروونی دەدەن، بەڵام هەستە لەزەت بەخشەکان وزەی دەروونی کەم

دەكەنەوە. دەكرێ ئەو شتەی كە دێتە دەروونی وشیارەوە بە لەزەت ناودێر بكەین و، لە بەرانبەردا "شتی" چۆنی و چەندی نێو رەوتی رووداوەكانی زەین بە نالەزەت بزانین. كەوابوو گرنگ ئەمەیە كە ئایا ئەم "شتە" دەتوانێ لە شوێنی خۆیدا وشیار بێتەوە، یان دەبێ بێتە نێو سیستمی وشیارەوە. بەپێی ئەزموونی كلینیكی، سەرەتا دەبێ ئەم گواستنەوەیە رووبدات. ئەم ئەزموونانە پیشانی دەدەن كە ئەم "شتە" وەك بزوێنەر (impulse)ێكی سەركوتكراو رۆڵ دەگێڕێ، یانی دەتوانێ وزەیەكی بزۆز وەگەڕ بخات بۆ ئەوە كە "خود" هەست بەم وزە سنووربەزێنە بكات. كاتێ لەئاست ئەم وزەیە بەرەنگاری دروست ببێ و لە دژكردەوە- دامركاندا وەستانێك روو بدات، لەپڕ ئەو "شتە" دێتە دەروونی وشیارەوە و چێژێكیش نابەخشێ. راست وەك ئەو كێشانە كە لە پێویستی جەستەیی سەرچاوە دەگرن، ژان كە لەنێوان دەركی دەرەكی و دەروونیدایە، تەنانەت ئەو كاتەش كە لە دنیای دەرەوە سەرچاوە دەگرێ وەك دەركی دەروونی رۆڵ دەگێڕێ و دەشتوانێ بە ناوشیاری بمێنێتەوە. كەوابوو ئەمەش دروستە كە هەستەكانیش تەنیا بە گەیشتن بە سیستمی وشیار رەهەندی وشیارانە بەخۆوە دەگرن. ئەگەر ئەم رێگەیە بەسترا بێت، وەك هەست دەرناكەون، هەرچەند ئەو "شتە" كە لە درێژەی هەڵچووندا لەگەڵ هەستەكان جووت دەبێ وەها خەسڵەتێكی هەیە كە وادەنوێنێ ئەوانە وەك هەست دەركەوتوون. كەوابوو بەكورتی دەتوانین باسی "هەستە ناوشیارەكان" بكەین و لەگەڵ وێنا ناوشیارەكان بەراوردیان بكەین كە ئەڵبەت بەراوردێكی رەوایە. لە راستیدا جیاوازی ئەم دوانە ئەمەیە: ئاڵقەكانی پێوەندی وێنا ناوشیارەكان دەبێ بەر لە گەیشتنی وێناكان بە دەروونی وشیار بەدیبێن، بەڵام هەستەكان كە خۆیان سەربەخۆ دەگوازرێنەوە پێویستیان بەم ئاڵقانە نییە. بە وتەیەكی تر، جیاوازی نێوان دەروونی وشیار و دەروونی نیوەوشیار، بۆ هەستەكان بێ مانایە؛ دەروونی نیوەوشیار لێرەدا بەكار نابرێ و هەستەكان یان لە دەروونی وشیاردان یان لە دەروونی ناوشیاردان. تەنانەت ئەو كاتەش كە هەستەكان لەگەڵ وشەنوێنی لە پێوەندیدان، بە هۆی ئەم پێوەندییە وشیار نابنەوە، بەڵكوو راستەوخۆ دەچنە دەروونی وشیارەوە.

ئێستە دەوری وشەنوێنی بەتەواوی رۆشن دەبێتەوە. پرۆسەی دەروونی ئەندێشە بەهۆی وشەنوێنی وەك دەرك و تێگەیشتن دەردەكەون. ئەم پرسە وەك سەلماندنی تێزێكە كە بەپێی ئەو ئێپیستمە، یەكسەر لە دنیای دەرەوە بەرهەم دێت. كاتێ كە وزەی لەرادەبەدەری دەروونی پرۆسەی ئەندێشە ئازاد دەبێت، ئەندێشە دەرك دەكرێت — وەك بڵێی لە دەرەوە بەرهەم هاتووە- لە ئاكامدا بە شتێكی هەقیقی دەزانرێ.

ئێستا كە پێوەندی تێگەیشتنی بێروونی و دەروونی و سیستمی رواڵەتی تێگەیشتنی- وشیارمان روون كردەوە، دەتوانین رای خۆمان لەمەڕ "خود" باس بكەین. هەروەك دەزانین، "خود" لە سیستمی تێگەیشتن كە كاكڵی ئەو پێكدێنێ و هەروەها لە دەروونی نیوەوشیارەوە كە لە كەنار پاشماوەكانی بیرەوەریدایە دەست پێدەكات. بەڵام هەروەك دیمان، "خود" ناوشیاریش دەگرێتەوە.

پێم وایە بە پێڕەوكردن لە دیدگای گیورگ گرادێك دەتوانین بە چەندین ئاكامی سودبەخش بگەین. گرادێك كە هەمیشە دەڵێ ئەوەی ئێمە بە "خود" پێناسەی دەكەین، لە ژیاندا دەوری پەسیڤ دەگێڕێ و هێزە نەناسراو و ركێف نەكراوەكان بەسەر ژیانی ئێمەدا زاڵن. هەموو ئێمە وەها تێگەیشتنێكمان

هەبووە و دەبێ لە پێکهاتەی زانستدا جێگایەک بۆ داهێنانی گرادێک ببینینەوە. من پێشنیار دەکەم بۆ لەبەر چاوگرتنی ئەم داهێنانە، ئەو شتەی لە سیستمی تێگەیشتنەوە دەست پێدەکا و سەرەتا لە دەروونی نیوەوشیاردایە بە "خود" ناودێر بکەین و بە پێرەوی لە گرادێک بەشی دیکەی زەین کە "خود" لەودا پەرەدەستێنێ و بەجۆرێک دەور دەبینێ کە گوایا ناوشیارە، بە نەست (id) پێناسە بکەین.

بەزوویی دەبینین کە ئایا دەتوانین لەم روانگەوە بۆ شیکاری [پرۆسەکانی زەین] سود وەرگرین یان نا. ئێستا تاک وەک "نەست"ێکی دەروونی نادیار و ناوشیار لەبەرچاو دەگرین کە "خود" لە بان ئەو راوەستاوە و سیستمی تێگەیشتن لە ناخی ئەو پێکدێت. ئەگەر بمانەوێ ئەم پرسە بە وێنە پیشان بدەین، دەتوانین بێژین کە "خود" هەموو "نەست" ناگرێتەوە، بەڵکوو تەنیا بەشێکی لەبەر دەگرێت کە سیستمی تێگەیشتن، توێژی سەرەوەی "خود" پێکدێنێ. "خود" بە شێوەی رۆشن لە "نەست" جیا نابێتەوە، بەڵکوو بەشی ژێرەوەی لە "نەست"دا تێکەڵ بووە.

بەڵام خواستە سەرکوتکراوەکانیش لە "نەست"دا تێکەڵ دەبن و تەنیا بەشێک لە "نەست" پێکدێنن. ئەم خواستانە تەنیا بەهۆی سەرکوت بەتەواوی لە "خود" جیا دەبنەوە و بەهۆی "نەست" لەگەڵ "خود" پێوەندی دەگرن. بەخێرایی تێدەگەین کە هەموو ئەو سنوورانە کە بە سودوەرگرتن لە پاتۆلۆژی دیاریمان کردووە، تەنیا توێژەکانی سەرووی سیستمی زەین دیاری دەکەن و ئێمەش تەنیا ئەم توێژانە دەناسین. دەکرێ باسەکەمان بەشێوەی دیاگرامی خوارەوە پیشان بدەین، ئەڵبەت بانگەشەی ئەوە ناکەین کە ئەم وێنەیە رۆڵێکی تایبەت دەگێڕێ، بەڵکوو تەنیا مەبەستمان ئەوەیە کە باسەکەمان روون ببێتەوە.




رەنگە بتوانین بێژین کە "خود"، "کڵاوی بیستیاری" لەسەردایە، بەڵام ئاناتۆمی مێشک دەری دەخات کە ئەم کڵاوەی لە لایەکی سەری ناوە یانی بە وتەیەک "کڵاو لارە".

بە ئاسانی دەتوانین تێبگەین کە "خود" ئەو بەشە لە "نەست" پێکدێنێ کە لە ژێر کاریگەری دنیای دەرەوەدا بەهۆی سیستمی تێگەیشتنی — وشیار کۆنترۆڵ ناکرێ و بە وتەیەک، جیاوازی رواڵەت یا توێژی سەروو surface-differentiation)) پەرەدەستێنێ. هەروەها "خود" دەیەوێ کاریگەری دنیای دەرەوە بەسەر "نەست" و خواستەکانی "نەست"دا بسەپێنێ و تێدەکۆشێ لەجیاتی یاسای لەزەت، کە

دەسەڵاتی بەسەر "نەست"دا هەیە، "یاسای واقیع" جێگیر بکات. تێگەیشتن بۆ "خود"، وەک رۆڵی غەریزە بۆ "نەست" وایە. بەپێچەوانەی "نەست" کە مەیل و خواستەکانی مرۆڤ لەبەر دەگرێت، دەکرێ "خود" بە هێمای ئەقڵی سالم بزانین...

گرنگی رۆڵی "خود" لە وێوە دەردەکەوێ کە زیاتر هەڵوێست و بزاڤەکانی مرۆڤ کونترۆڵ دەکات. کەوابوو پێوەندی "خود" لەگەڵ "نەست" وەک پیاوێکی ئەسپ سوارە کە دەبێ هێزی زێدەتری ئەسپ رکێف بکات، بەم جیاوازییەوە کە سوار بە هێزی خۆی ئەسپ کونترۆڵ دەکات، بەڵام "خود" بەو هێزەی کە بە قەرز وەریگرتووە ئەم کارە دەکات. رەنگە بتوانین بەم بەراوردە باسەکەمان زیاتر روون بکەینەوە. ئەگەر بڕیار بێت سوار لە ئەسپەکەی جیا نەبێتەوە، ناچار دەبێ حەزی ئەسپەکە لەبەرچاو بگرێ و بە ویستی ئەسپ بئاژوێنێ؛ هەروەها "خود"یش بەپێی عادەت، بەجۆرێک مل بۆ ویستی "نەست" کەچ دەکات هەر دەڵێی ویستی خۆیە.

وادیارە لە پێکاتنی "خود" و جیاوازی ئەو لەگەڵ "نەست" دا، بێجگە لە سیستمی تێگەیشتن، هۆکارێکی دیکە رۆڵ دەگێڕێ. جەستەی مرۆڤ (بەتایبەت رووی دەرەوەی))، جێگایەکە کە هەستە بێروونی و دەرەکییەکان لەو سەرچاوە دەگرن. جەستە وەک هەر شتێکی تر دەبینرێ، بەڵام لەمس کردنی، دوو جۆر هەست دەخولقێنێ کە رەنگە یەکێکیان هەستی ناخ بێت. دەروون — فیزیۆلۆژی (psycho-physiology) حاڵەتەکانی جەستەی مرۆڤ لە نێوان بارودۆخی دنیای هەستەکاندا، بەوردی دەرک و شرۆڤە دەکات. وادیارە کە ژان و ئازاریش لەم پرۆسەیەدا رۆڵێکی هەیە و رەنگە شێوازی هەست کردن بە ئەندامەکانمان لە کاتی نەخۆشی ژانوایدا، مۆدێلێک بێت کە چۆن هەست بە جەستەی خۆمان دەکەین.

"خود" لە پلەی یەکەمدا لە [هەستی] جەستە سەرچاوە دەگرێ. "خود" تەنیا تایبەت نییە بە رووی دەرەوەی [جەستە]، بەڵکو هێمای رووی دەرەوەی [جەستە]یە. ئەگەر بمانەوێ بەراوردێکی ئاناتۆمیک بەکار بێنین، دەتوانین وەک ئاناتۆمیستەکان "خود" بە "باوەقۆرەتێکی نێو توێژ" (homunculus cortical) بزانین کە لەنێو توێژێکدا بەرئاوەژوو جێگیر بووە و لنگ و قووچ وەستاوە و بەرەو دوا دەڕوانێ، وەک دەزانین، دەڤەری بێژیاری (speech-area) لە لای چەپ هەڵکەوتووە.

پێوەندی "خود" و دەروونی وشیار بەزۆری راڤە کراوە، بەڵام هێشتا لەم بابەتەوە زۆر خاڵی هەیە کە دەبێ لێرەدا شرۆڤەی بکەین. لەبەرئەوەی راهاتووین کە پێوەری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی خۆمان لە هەموو شوێنێک بەکار بێنین، پێمان سەیر نییە گەر ببیستین کە هەستەکانی خوارەوە لە دەروونی ناوشیاردا رۆڵ دەگێڕن. هەروەها، پێمان وایە کە بە هەر رادە کارکردێکی زەینی لە پێوەرەکانی ئێمەدا رۆڵی زۆر بگێڕێ، بە هەمان شێوە ئاسانتر دێتە دەروونی وشیارەوە. بەڵام ئەزموونی دەروونشیکاری ئێمە، لەم بابەتەوە دڵخۆشمان ناکات. لەلایەکەوە، هەندێ بەڵگە بەدەستەوەن کە دەڵێن کاری فکری دژوار و وردبینانە کە زیاتر پێویستی بە شەونخوونی و قووڵبوونەوە هەیە، هەم لە بەشی نیوەوشیار و هەم بەدەر لە دەروونی وشیار بەئەنجام دەگات. لەم بابەتەوە هێندە نموونەی رۆشنمان هەیە کە حاشایان لێناکرێ. رەنگە کاری فکری لەم چەشنە لە کاتی خەودا روودات، بۆ وێنە کەسێک هەر کە

لە خەو هەڵدەستێ تێدەگات کە رێگا چارەی پرسێکی ئاڵۆزی ماتماتیکی دیوەتەوە کە رۆژی پێشوو زۆر ماندووی کردووە.[٣]

بێجگە لەمە دیاردەیەکی تر هەیە کە ئێجگار سەرسوڕهێنەرترە. لە شیکارییەکاندا تێدەگەین کە لە هەندێ کەسدا، ویژدان و توانای خۆنرخاندن (یانی چالاکی ئێجگار پلە بەرزی زەینی)، ڕەهەندی ناوشیارانەی هەیە و بەشێوەی ناوشیارانە چەندین ئاکامی هەرە گرنگی لێدەکەوێتەوە. بەمهۆیە، لە زۆر نمونەی جیاجیادا بەرەنگاری نەخۆش لە کاتی شیکاریدا بە ناوشیار دەمێنێتەوە. بەڵام ئەم داهێنانە نوێیە کە ناچارمان دەکات تا باسی "هەست بە تاوانباری ناوشیارانە" بکەین–سەرەڕای ئەوە کە لەم بابەتەوە دیدێکی رەخنەگرانەمان هەیە- زۆر زیاتر لە داهێنانی پێشوو تووشی سەرسوڕمانمان دەکا و لەگەڵ پرسێکی نوێ بەرەو روومان دەکات، بەتایبەت ئەو کاتە کە تێدەگەین لە زۆرێک لەو کەسانەدا کە گیرۆدەی نەخۆشی دەروونژاکاوین، هەست بە تاوانباری ناوشیارانە، رۆڵی ئابووری گرنگ دەگێڕێ و لە هەمبەر چاکبوونەوەی نەخۆشدا دژوارترین لەمپەر پێکدێنێ. ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ پێوەرەکانمان، دەبێ بێژین نە تەنیا نزمترین ئاستی "خود"، بەڵکوو رەنگە بانترین ئاستەکانیشی ناوشیارانە بن. گوایا بەمجۆرە بەڵگەیەک بەدەست دێنین کە ئەم بۆچوونەمان لەمەڕ "خود" دەسەلمێنێ: "خود" بەر لە هەر شتێ لەگەڵ [هەستی] جەستە پێوەندی هەیە.

## ٣. "خود" و "بان خود" (خودی ئایدیال)

ئەگەر "خود" تەنیا بەشێک لە نەست بوایە و بە سیستمی تێگەیشتن رکێف بکرایە، یانی ئەگەر "خود" ئاوێنەی دنیای واقێع بوایە، بابەتی تۆژینەوەکەمان سادەتر دەبوو. بەڵام ئەم پرسە زۆر لەم شتانە ئاڵۆزترە.

لە شوێنێکی تر وتوومە کە کام ئیدە هانی داین تا ئاستێک لە "خود" بە "خودی ئایدیال" (super-ego)یان "بان خود" (ego-ideal)پێناسە بکەین.[٤] ئەم ئیدە هێشتا برەوی هەیە.[٥] پێوەندی سستی ئەم بەشە لە "خود" لەگەڵ دەروونی وشیار، بابەتێکی تازەیە کە پێویستە راڤەی بکەین.

لێرەدا دەبێ بواری باسەکەمان نەختێ بەرین بکەینەوە. ئێمە توانیمان نەخۆشی ژاناوی خەمۆکی قووڵ (melancholia) بەم تیۆرییە راڤە بکەین کە [لەو کەسانەدا کە گیرۆدەی ئەم نەخۆشییەن] بابەتی حەز (object) کە لەنێو چووبوو، سەرلەنوێ لە "خود"دا پێکهاتووە؛ بە وتەیەکی تر، وزەی دەروونی لە بابەتی حەزدا[٦] جێگەی خۆی بە یەکبوونی کەسێتی (identification) داوە.[٧] ئەڵبەت لەو کاتەدا گرنگی هەمەلایەنەی ئەم پرسەمان دەرک نەکردبوو و نەماندەزانێ ڕەهەندی گشتی و ڕەهەندی تیپیکی چەندەیە. لەو کاتەوە تا ئێستا تێگەیشتووین کە ئەم جۆرە جێگیر کردنانە رۆڵێکی گرنگی لە دیاریکردنی فۆرمی "خود" و ئەو شتە کە بە "ئاکاری" خود ناودێری دەکەین، هەیە.

بێگومان لە سەرەتادا، یانی لە قۆناغی سەرەتایی زارکیدا[٨]، ناتوانین وزەی دەروونی بابەتی حەز و یەکبوونی کەسێتی لێک جیابکەینەوە. تەنیا دەتوانین وایدانین کە لە قۆناغەکانی دواتردا، وزەی دەروونی بابەتی حەز لە "نەست"ەوە سەرچاوە دەگرێ و "نەست"یش مەیل و خواستی ئێرۆتیک بە یەکێ

لە پێویستییەکانی خۆی دەزانێ. "خود" کە لە سەرەتادا لاوازە، وزەی دەروونی بابەتی حەز دەرک دەکا و بە دوو شێواز کاردانەوە پیشان دەدات: یان مل بۆ ئەم وزەیە کەچ دەکات، یان ئەم خواستانە سەرکوت دەکاو [لە دەروونی ناوشیاریان دەچەپێنێ] و، بەمجۆرە لە خۆی دووریان دەخاتەوە.[٩]

کاتێ کەسێ ناچار دەکرێت تا لە بابەتی خواستی سێکسی خۆی دەست هەڵگرێ، زۆر جار "خود"ی تووشی گۆڕان دەبێت. بۆ راڤەکردنی ئەم پرسە تەنیا دەتوانین بێژین کە بابەتی خواستەکان لە "خود"دا جێگیر دەبێ (وەک ئەو شتەی کە لە خەمۆکیدا روو دەدات). ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە سروشتی ئەم جێگیربوونە بە وردی روون بکەینەوە. رەنگە "خود" لە رێگەی ئەم ناخهاوێژییەوە[١٠] (کە جۆرێک گەڕانەوە[١١]یە بۆ مێتۆدی قۆناغی ئۆراڵی)، ئاسانتر بتوانێ دەست لە بابەتی حەزەکانی هەڵگرێ. رەنگە تەنیا لە رێگەی ئەم یەکبوونی کەسێتییەوەیە کە نەست دەتوانێ لە بابەتی خواستەکانی دەست هەڵگرێ. بەهەرحاڵ، ئەم پرۆسە -بەتایبەت لە قۆناغی سەرەتایی گەشەی دەروونداـ چەندین جار روو دەدات و کەوابوو دەتوانین وایدانێین کە ئاکاری "خود" لە پاشماوەکانی وزەی دەروونی بابەتەکانی حەز کە وەلانراون، سەرچاوە دەگرێ و پێوەندی بە پێشینەی هەڵبژاردنی ئوبژەکانەوە[١٢] هەیە. ئەڵبەت سەرەتا دەبێ ئەم شتە قەبووڵ بکەین کە توانای بەرەنگاری کەسانی جیاواز یەکسان نییە و ئەوە کە مرۆڤ کاریگەری پێشووی هەڵبژاردنی ئوبژەکانی ئێرۆتیکی چەندە سەرکوت یان قەبوڵ بکات، دیسان پێوەندی بە توانای بەرەنگاری مرۆڤەوە هەیە. وادیارە ئەو ژنانە کە چەندین ئەزموونی ئاشقانەیان هەبووە، پاشماوەی وزەی دەروونی بابەتی حەزەکانیان بەئاسانی لە خەسڵەتەکانی کەسێتی خۆیاندا دەبیننەوە. هەروەها دەبێ هەندێ نمونە لەبەر چاو بگرین کە هەر دوو پرۆسەکە (وزەی دەروونی بابەتی حەزەکان و یەکبوونی کەسێتی) هاوکات روو دەدەن، یانی ئەو کاتە کە گۆڕانی کەسێتی بەر لە دەست هەڵگرتن لە بابەتی حەزەکان روو دەدات. لەم کاتانەدا، گۆڕانی کەسێتی پاش بڕانی پێوەندی لەگەڵ ئوبژە هەروا وەک خۆی بەهێز دەمێنێتەوە و، بە وتەیەک ئەو پێوەندییە دەپارێزێ.

لە روانگەیەکی دیکەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم ئاڵوگۆڕەی "خود" کە بەهۆی بژاردنی ئوبژەی عشقی روو دەدات، مێتۆدێکە کە "خود" دەتوانێ لە رێگەی ئەوەوە بەسەر "نەست"دا زاڵ ببێت و پێوەندی خۆی لەگەڵ نەست پەرە پێبدات. ئەڵبەت "خود" بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ناچار دەبێت تا رادەیەکی زۆر ئەزموونەکانی "نەست" قەبووڵ بکات. کاتێ کە "خود" خەسڵەتەکانی ئوبژە وەردەگرێ، وەک ئوبژە خۆشەویست (love-object) بەسەر "نەست"دا دەسەپێ و بە وتنی ئەم دوو رستە: "بڕوانە، تۆش دەتوانی منت خۆش بووێ؛ من زۆر لە ئوبژەی حەزەکانت دەچم"، تێدەکۆشێ تا زیانی "نەست" قەرەبوو بکاتەوە.

گۆڕانی وزەی عشقی چەقبەستوو لەسەر ئوبژە[١٣] بۆ وزەی عشقی خۆشەیدا (narcissistic libido)، بەرۆشنی هێمای دەست هەڵگرتن لە مەبەستی سێکسییە و جۆرێک «sublimation»ە.[١٤] بەڵام لێردا پرسیارێک دێتە ئاراوە کە دەبێ بەوردی شرۆڤەی بکەین: ئایا سابڵیمەیشن هەمیشە بەمجۆرە روودەدات؟ بە وتەیەکی تر، ئایا سابڵیمەیشن هەمیشە بەهۆی "خود" روو دەدات؟ "خود" کە سەرەتا وزەی عشقی چەقبەستوو لەسەر ئوبژەی سێکسی وەک وزەی سێکسی خۆشەیدا لێدەکات، رەنگە دواتر

ئامانجێکی تری بۆ دیاری بکات.[١٥] ناچارین دواتر ئەم پرسە راڤە بکەین کە ئایا ئاڵوگۆڕی غەریزی دیکە هەر لەم ئاڵووێرەوە سەرچاوە دەگرن، بۆ نموونە ئایا ئەو غەریزە جۆراوجۆرانە کە تێکەڵبوون، جیا ناکاتەوە.

لێرەدا دەبێ نەختێ گرنگی زیاتر بە یەکبوونی "خود" لەگەڵ ئوبژە بدەین، هەرچەند ئەم پرسە لە باسەکە دوورمان دەخاتەوە. ئەگەر رێژەی ئەم یەکبوونانە لەڕادەبەدەر زیاد بن و بە سەروەری ئەوان بگات، لەڕادەبەدەر بەهێز بن و لە دژی یەکتر بن، رەنگە زەبر لە دەروون بدەن. رەنگە ئەم زەبرە بەهۆی ئەم یەکبوونە جیاوازانە کە بەهۆی بەرەنگاری لێک جیا دەبنەوە، "خود" تووشی شێوان بکات. رەنگە رازی "کەسێتی چەندلایەنە"[١٦] ئەم شتە بێت کە یەکبوونە جیاوازەکان بە نۆرە بەسەر دەروونی وشیاردا زاڵ دەبن. تەنانەت کاتێ کە دۆخەکە تا ئەم ئاستە ئاڵۆز نەبووبێت، پرسی ناکۆکی نێوان یەکبوونە جیاوازەکان کە "خود" بەسەر ئەواندا دابەش دەکرێت وەک خۆی ماوەتەوە، ناکۆکییەک کە سەرەڕای ئەم شتانە، ناکرێ بە نەخۆش ئاسا پێناسەی بکەین.

بەڵام بەدەر لە توانای دواتری کەسێتی بۆ بەرەنگاری لە ئاست کاریگەری وزەی دەروونی ئوبژەکان، کە مرۆڤ دەستی لێ هەڵگرتوون، یەکەم یەکبوون کە لە قۆناغی منداڵیدا روودەدات، کاریگەری گشتگیر و درێژماوەی دەبێت. ئەم پرسە سەرلەنوێ سەرنجمان بۆ سەرچاوەی "خودی ئایدیال" رادەکێشێ، چونکە لەودیو ئەم شتەوە، یەکەمین و گرنگترین یەکبوونی کەسێتی خود (یەکبوون لەگەڵ باوک لە منداڵیدا) شاراوە ماوەتەوە.[١٧] وادیارە یەکبوونی کەسێتی منداڵ لەگەڵ باوکی سەرەتا ئاکامی وزەی دەروونی ئوبژە نییە، بەڵکوو جۆرێک یەکبوونی راستەوخۆ و خێرایە و بەر لە هەر جۆرە وزەی دەروونی ئوبژە، روو دەدات. بەڵام وادیارە هەڵبژاردنی ئوبژە لە درێژەی یەکەم قۆناغی گەشەی سێکسیدا کە لەگەڵ دایک و باوک پێوەندی هەیە، ئەم چەشنە یەکبوونە پێکدێنێ و بەمجۆرە یەکبوونی سەرەتایی بەهێز دەکات.

سەرەڕای ئەمەش، ئەم بابەتە بەگشتی هێندە ئاڵۆزە کە پێویستە بە درێژی راڤەی بکەین. هۆی ئاڵۆزی ئەم پرسە دوو شتە: سێ لایەنە بوونی دۆخی ئۆدیپ و دوورەگەزی بوونی سروشتی هەر تاکێک.

دەتوانین دۆخی منداڵی کوڕ بەمجۆرە راڤە بکەین. منداڵی کوڕ لە سەرەتای ژیانیدا، وزەی دەروونی خۆی بۆ دایکی — وەک ئوبژەی حەزەکانی — تەرخان دەکات. ئەم وزە دەروونییە سەرەتا پێوەندی بە سینگی دایکەوە هەیە و یەکەم نموونەی هەڵبژاردنی ئوبژەیە بەپێی مۆدێلی داڵدەخوازانە.[١٨] منداڵی کوڕ کەسێتی خۆی لەگەڵ کەسێتی باوکی یەک دەخات و لەگەڵی رێک دەکەوێ. تا ماوەیەک ئەم دوو پێوەندییە بەشێوەی هاوتەریب درێژەی دەبێ، تا ئەوەی کە خواستی سێکسی کوڕ بۆ دایکی زیاتر دەبێ و باوکی بە لەمپەری خۆی و دایکی دەزانێ. گرێی ئۆدیپ لەم دۆخەوە سەرچاوە دەگرێ. لەمەو دوا، یەکبوونی کەسێتی لەگەڵ باوک، لایەنێکی قیناوی بەخۆوە دەگرێ و کوڕ ئارەزوو دەکا باوکی نەمێنێ تا ئەو بتوانێ جێگەی بگرێتەوە و لەگەڵ دایکی جووت بێت. لەم کاتە بەولاوە، پێوەندی کوڕ لەگەڵ باوکی دوالیستی[١٩] دەبێتەوە، وەک بڵێی دوالیزم کە لە هەمان سەرەتاوە لە سروشتی یەکبوونی کوڕ

لەگەڵ باوکیدا هەبووە، ئێستا ئاشکرا دەبێت. ناوەرۆکی گرێی ئۆدیپی سادە و پۆزەتیڤ لە منداڵی کوڕدا بریتییە لە روانگەی دوالیستی بۆ باوک و پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ دایک وەک بابەتی حەزەکان.

گرێی ئۆدیپ کاتێ لەنێو دەچێ کە منداڵی کوڕ بتوانێ لە وزەی دەروونی خۆی بۆ دایکی وەک بابەتی حەزەکانی دەست هەڵگرێ. بەڵام کوڕ دەتوانێ دوو کار بکات: یان کەسێتی خۆی لەگەڵ کەسێتی دایکی یەک بخات، یان یەکبوونی خۆی لەگەڵ باوکی بەهێز بکات. ئەگەر بژاردەی دووهەم بە شتێکی ئاساییتر بزانین، کارێکی دادوەرانە دەکەین، چونکە بەمجۆرە پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ دایک تا رادەیەک دەپارێزرێ. بەمجۆرە لەنێوچوونی گرێی ئۆدیپ، نێرێتی لە کەسێتی کوڕدا بەهێز دەکات. لە بەرانبەردا، رەنگە ئاکامی روانگەی ئۆدیپی لە منداڵی کچدا یەکبوونی کەسێتی ئەو لەگەڵ دایکی بەهێز بکا و، ئەم شتە کەسێتی ژنانە لەودا بەهێز بکات.

[بە سەرنجدان لەو شتانەی باسمان کرد] ئەم یەکبوونانە نەختێ نائاسایی دەنوێنێ، چونکە ئەو ئوبژەیە کە منداڵ دەستی لێ هەڵدەگرێ ناهێنێتە نێو "خود". بەڵام دەتوانێ پێچەوانەی ئەمەش رووبدات کە زیاتر لە کچاندا دەبینرێ و کەمتر لە کوڕاندا. دەروونشیکاری لە زۆر نموونەدا پیشان دەدات کە منداڵی کچ پاش ئەوەی کە بەناچار لە باوکی وەک ئوبژەی خۆشەویستی دەست هەڵدەگرێ، نێرێتی لەودا بەرجەستە دەبێ و لەجیاتی یەکبوون لەگەڵ دایکی، کەسێتی خۆی لەگەڵ باوکی یەک دەخات. ئەڵبەت ئەم پرسە پەیوەست بە وزەی نێرێتی لە سروشتی ئەودایە (بەدەر لەوە کە رەهەندی سەرەکی نێرێتی لە سروشتی ئەودا چی بێت).

کەوابوو وادەنوێنێ کە لە هەر دوو رەگەزدا، توانای دوو حەزی سێکسی ژنانە و پیاوانە ئەم شتە دیاری دەکات کە ئایا ئاکامی دۆخی ئۆدیپی، یەکبوون لەگەڵ دایک بێت یان لەگەڵ باوک. دوالیزمی سێکسی بەمجۆرە لە ئاڵوگۆڕەکانی دواتری گرێی ئۆدیپدا دەوری دەبێت. شێوازی دیکەی کارتگەری دوالیزمی سێکسی لە گرێی ئۆدیپدا گرنگی زیاتری هەیە، چونکە ئەو هەستەمان لا دروست دەبێ کە گرێی ئۆدیپی سادە، باوترین شێوازی ئەم دوالیزمە نییە، بەڵکوو زیاتر فۆرمێکی سادە کراو و نمونەیەک لەم پرسە دەردەخات کە ئەڵبەت بۆ مەبەستی زانستی شیاوە. تۆژینەوەی وردتر فۆرمی کامڵتری گرێی ئۆدیپ دەردەخات کە دوو لایەنی هەیە (لایەنی پۆزەتیڤ و لایەنی نێگەتیڤ) و بەرهەمی دوالیزمێکی سێکسییە کە هەر لە سەرەتاوە لە منداڵدا هەیە. بە وتەیەکی تر، منداڵی کوڕ بێجگە لەوە کە روانگەیەکی دوالیستی بۆ باوک و دیدێکی خۆشەویستی بۆ دایک هەیە، بەڵکوو هاوکات وەک منداڵێکی کچ رەفتار دەکات، یانی بە دیدی خۆشەویستی و ژنانەوە سەیری باوکی دەکا و رۆژ لە دوای رۆژ بەخیلی بە دایکی دەبا و دژایەتی دەکات. بەمجۆرە دوالیزمی سێکسی پرسەکە ئاڵۆز دەکا و چۆنیەتی یەکەم هەڵبژاردن و یەکبوون تاریک و تەماوی دەکات. رەنگە بتوانین سەرچاوەی دوالیزمی رەفتاری منداڵ لەگەڵ دایک و باوکی بەهۆی سروشتی دوو رەگەزی بوون بزانین، نە یەکبوونی منداڵ لەگەڵ دایک و باوکی و هەستی رکەبەرایەتی.

بە رای من شیاوتر ئەوەیە کە پێمان وابێ هەموو خەڵک و بەتایبەت دەروونناساکاوان، بە قووڵی گیرۆدەی گرێی ئۆدیپن. ئەزموونی دەروونشیکاری پیشان دەدات کە لە هەندێ بابەتدا یەکێ لەم لایەنانە

بزر دەبێ و تەنیا شوێنەوارێکی لێدەمێنێتەوە کە بە دژواری دەناسرێتەوە. کەوابوو ئاکامی ئەم پرسە، هەودایەکە کە لە لایەکەوە بە گرێی ئۆدیپی پۆزەتیڤ و شیاو دەگاو لەو لاوە بە گرێی ئۆدیپی نێگەتیڤ و هاورەگەزخواز[٢٠] دەگات، لە نێوەراستیشدا، فۆرمی کامڵی گرێی ئۆدیپ دەبینین کە یەکێ لە لایەنەکانی بەسەر ئەودا زاڵ بووە. بە لەنێوچوونی گرێی ئۆدیپ، ئەو چوار رەوتە کە پێکیدێنن بەجۆرێک تێکەڵ دەبن کە هەم یەکبوون لەگەڵ باوک هەموار دەکەن، هەم یەکبوون لەگەڵ دایک. یەکبون لەگەڵ باوک، پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ دایک (کە لە گرێی ئۆدیپی پۆزەتیڤدا بەدیدێت) دەپارێزێ و هاوکات جێگەی پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ باوک (کە لە پێوەندی هموسێکسواڵدا بەدیدێت) دەگرێتەوە. پێچەوانەی ئەم شتە لەمەڕ یەکبوون لەگەڵ دایک روو دەدات. رێژەی یەکبوون لەگەڵ باوک یان لەگەڵ دایک لە هەر تاکێکدا، دەسەڵاتی یەکێ لە دوو سروشتی ژنانە یان پیاوانە لەودا راڤە دەکات.

بەپێی ئەوەی وترا، ئاکامی گشتی ئەو قۆناغە سێکسییە کە لە ژێر دەسەڵاتی گرێی ئۆدیپ دایە، هەندێ شوێنەواری لە "خود" دا دەمێنێتەوە کە فۆرمی لێکبەستراوی هەر دوو پرۆسەی یەکبوون دەگرێتەوە. رێکخستنی "خود" بەم شێوەیە، جێگای تایبەتی ئەو دەپارێزێ و وەک "خودی ئایدیال" یان "بان خود" لەئاست بەشەکانی تری "خود" جێگیری دەکات.

سەرەڕای ئەمەش، "بان خود" تەنیا پاشماوەی هەڵبژاردنی ئوبژەی سەرەتایی "ئەست" نییە، بەڵکوو هێمای کاردانەوەیەکی ئاوەژووی[٢١] بەهێزە لەدژی ئەو هەڵبژاردنانە. ئەم پەندە کە "تۆ دەبێ بەمجۆرە (وەک باوکت) هەڵس و کەوت بکەی"، پێوەندی "بان خود" لەگەڵ "خود" بەرۆشنی پیشان دەدات. ئەم پەندە ئاواش دێت: "تۆ نابێ بەمجۆرە (وەک باوکت) بیت؛ یانی نابێ هەر کارێک ئەو دەیکات تۆش بیکەی. هەندێ شت مافی تایبەتی ئەوە." ئەم رەهەندە دوالیستییەی "خودی ئایدیال" لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە "خودی ئایدیال" ئەرکی سەرکوتی گرێی ئودیپی لە ئەستۆ بووە و لە راستیدا خۆی بە هۆی ئەم کارە شۆڕشگێڕانە دروست بووە. ئەڵبەت دەبێ ئەم راستییە بزانین کە سەرکوت کردنی گرێی ئۆدیپ کارێکی ئاسان نییە. منداڵ باوک و دایکی خۆی و، بەتایبەت باوکی بە لەمپەرێک دەزانێ کە نایەڵێ خواستی ئۆدیپی بەدیبێت، هەر بەمهۆیە "خود"ی ئەو بە مەبەستی سەرکوت کردنی گرێی ئۆدیپ، هاوتای ئەم لەمپەرە لە دەروونیدا دروست دەکا تا بەمجۆرە خۆی بەهێز بکات. "خود" بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە یارمەتی لە باوک وەرگرت و ئەمەش کارێکی ئێجگار گرنگ و حەیاتی بوو. "بان خود" ئاکاری باوک دەپارێزێ، بەڵام بە هەر رادە گرێی ئۆدیپ بەهێزتر بێ و هەرچەندە زووتر (بەهۆی دەسەڵات، پەروەردەی دینی، خوێندن و خوێندنەوە) لەئاست سەرکوت تەسلیم بێت، بەهەمان رادە دەسەڵاتی دواتری "بان خود" لەسەر "خود" (بەشێوەی ویژدان یان هەستی بە تاوانباری ناوشیارانە) سەختتر دەبێت. دواتر باسی ئەم پرسە دەکەم کە "بان خود" وەها دەسەڵاتێکی زەختاوی لە کوێوە دێنێ و بەسەر "خود"دا دەیسەپێنێ. مەبەستم سەرچاوەی ناوەرۆکی وەسواسی "بان خود"ە کە بەشێوەی بێشەرت و مەرج فەرمان دەدا و بە تاک دەڵێ ئەم کارە مەکە و ئەو کارە بکە.

ئەگەر جارێکی تر سەرچاوەی "بان خود" بەوجۆرە کە باسکرا راڤە بکەین، تێدەگەین کە دوو هۆکاری هەرە گرنگ لە پێکهاتنیدا رۆڵیان هەبووە: یەکەم هۆکاری بایۆلۆژیکی، دووهەم پێشینەی تاک (یانی

قۆناغی درێژی لاوازی و پێویستی منداڵ بە دایک و باوکی و، هەروەها گرێی ئۆدیپی منداڵ کە- هەروەک پیشانمان دا- سەرکوتکردنی، وەستانێک لە قۆناغی شاراوەی[٢٢] گەشەی وزەی سێکسیدا پێکدێنێ، کەوابوو پێشینەی تاک پێوەندی بە سەرەتای دوودەورەیی ژیانی سێکسی تاکەوە هەیە). بەپێی تیۆرییەکی دەروونشیکارانە، ئەم دیاردەیە کە وادیارە تایبەت بە مرۆڤە، زادەی گەشەی فەرهەنگییە و بەرهەمی دەورەی وەستانی چالاکی سێکسییە. بەمجۆرە تێدەگەین کە جیاوازی نێوان "خود" و "بان خود" لەخۆڕا نییە، بەڵکوو نیشانەی گرنگترین تایبەتمەندی گەشەی تاک و رەگەزی مرۆڤە. لە راستیدا کاریگەریی هەمیشەیی دایک و باوک لەسەر منداڵ، درێژە بەم جیاوازییە و سەرچاوەکانی دەدات.

بە هۆی ئەوە کە دەروونشیکاری رەهەندی بەرز و ئەخلاقی و بان تاکی سروشتی مرۆڤ لەبەرچاو ناگرێ، هەردەم لەگەڵ رەخنە و سەرزەنشت بەرەو روو دەبێتەوە. ئەم رەخنەیە- چ لە رووی مێژوویی و چ لە رووی مێتۆدۆلۆژیکەوە- ناڕەوایە. یەکەم، چونکە ئێمە دەسپێکی سەرکوتمان لەگەڵ خواستی ئەخلاقی و ئستاتیکی "خود" پێوەند داوە و؛ دووهەم، ئێمە بەگشتی تێنەگەیشتووین کە تۆژینەوەی دەروونشیکارانە نایەوێ وەک سیستمێکی فەلسەفی، پێکهاتەیەکی تیۆریکی ئامادە و هەمەلایەنە بخولقێنێ، بەڵکوو ناچارە بە شیکاری دیاردە شیاو و ناشیاوەکان، هەنگاو بە هەنگاو ئاڵۆزییەکانی زەین راڤە بکات. تا کاتێ کە ناچار بووین خواستە سەرکوت کراوەکانی ژیانی زەینی راڤە بکەین، پێویست نەبوو گرنگی بە پێگەی رەهەندی باڵای مرۆڤ بدەین. بەڵام ئێستا کە دەمانەوێ "خود" شرۆڤە بکەین، دەتوانین بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە رووی ئەخلاقییەوە حەپەساون و بە ناڕەزایەتی پێمان دەڵێن کە مرۆڤ خاوەن سروشتێکی باڵایە، بێژین: "قسەی ئێوە تەواو راستە و سروشتی باڵا هەر لێرەدایە، لە 'خودی ئایدیاڵ' یان 'بان خود' دایە کە هێمای پێوەندی مرۆڤە لەگەڵ دایک و باوک. مرۆڤ لە سەرەتای منداڵیدا ئەم سروشتە بەرزە دەناسێ؛ ستایشی دەکا و لێی دەترسێ؛ بەڵام دواتر لە دەروونی خۆیدا تێکەڵی دەکات."

کەوابوو "خودی ئایدیاڵ" میراتداری گرێی ئۆدیپە و -هەر بەمجۆرە- هێمای بەهێزترین پاڵنەرەکان و گرنگترین ئاڵوگۆڕی حەزی سێکسی "نەست"ە. "خود" بە پێکهێنانی "خودی ئایدیاڵ" بەسەر گرێی ئۆدیپدا سەرکەوتووە و هاوکات لە ئاست "نەست" تەسلیم بووە. لە راستیدا "خود" هێمای دنیای دەرەوە (راستییەکان)ە، بەڵام "بان خود" بەرهەمی دنیای ناوەوە ("نەست")ە. بەمجۆرە تێدەگەین کە ململانێی "خود" و ئایدیاڵ سەرئەنجام رەنگدانەوەی کێشمەکێشی ئۆبژکتیڤیتە و سوبژکتیڤیتەیە، یان بەرهەمی کێشمەکێشی دنیای دەروون و بێروونی مرۆڤە.

بە پێکهاتنی "ئایدیاڵ"، "خود" لە ئاست ئەو شتانە کە بایۆلۆژی و ئاڵوگۆڕی رەگەزی مرۆڤ لە "نەست"دا بەدیدێنن، زاڵ دەبێ و وەک تاکێک خۆی لەگەڵ ئایدیاڵ تاقی دەکاتەوە. "خودی ئایدیاڵ" بەهۆی شێوازی پێکهاتنی، زیاترین پێوەندی لەگەڵ ئەزموونەکانی هەر تاکێک بەپێی گەشەی رەگەز (یانی لەگەڵ میراتی کۆنی مرۆڤ) هەیە. پێکهاتنی "خودی ئایدیاڵ" دەبێتە هۆی ئەوەی تا نزمترین بەشی ژیانی زەینی مرۆڤ بە ئاستێک هەڵبدات کە بەپێی پێوەرەکانمان، وەک بەرزترین بەشی زەینی مرۆڤ حساب بکرێت. سەرەڕای ئەمەش، کۆشش بۆ روونکردنەوەی "خودی ئایدیاڵ" تەنانەت بەو شێوەیە

کە پێشتر جێگەی "خود"مان دیاری کرد، یان راڤەکردنی بەپێی ئەو بەراوردانەی کە بۆ روونکردنەوەی "خود" و "نەست" کردمان، کارێکی بێهوودەیە.

دەتوانین بەئاسانی بیسەلمێنین کە "خودی ئایدیال" وەڵامی هەموو چاوەڕوانییەکانی ئێمە لەمەڕ سروشتی بەرزی مرۆڤ ناداتەوە. لە راستیدا "خودی ئایدیال" کە جێگەی خواستی منداڵ بۆ باوکی دەگرێتەوە، نوتفەی دروست بوونی هەموو دینەکانی تێدایە. کاتێ کە تاک بۆ داوەری کردن لەمەڕ خۆی بەم ئاکامە دەگات کە "خود" نەیتوانیوە ئامانجەکەی بەدیبێنێ، هەستی دینی خۆنەویستی دروست دەبێ- ئەو هەستە کە ئیمانداران لە کاتی هیجراندا هانای بۆ دەبەن. لە قۆناغەکانی دواتری گەشەی منداڵدا، مامۆستایان و دەسەڵاتداران رۆڵی باوک دەگێڕن. دەستوورەکانی ئەوان لە "خودی ئایدیال"دا وەک خۆی دەمێنێتەوە و وەک ویژدان هەردەم لەڕووی ئەخلاقییەوە تاک کونترۆڵ دەکەن. ناکۆکی نێوان خواستەکانی ویژدان و کردەوەی "خود" هەستی تاوانباری لای مرۆڤ دروست دەکات. هەستی کۆمەڵایەتی تاک، پێوەندی بە یەکبوونی ئەو لەگەڵ تاکەکانی تری کۆمەڵگەوە هەیە و بەپێی بوونی "خودی ئایدیالی" هاوبەش پێکدێت.

بنەما سەرەکییەکانی رەهەندی باڵای مرۆڤ (دین و ئەخلاق و هەستی کۆمەڵایەتی)[٢٣]، سەرەتا یەک شت بوون. وەک لە کتێبی تەوتەم و تابودا باسم کردووە، ئەم بنەمایانە لە گەشەی رەگەزی مرۆڤدا بەهۆی گرێی باوک بەرهەم هاتوون: دین و کۆت و بەندە ئەخلاقییەکانی بەهۆی پرۆسەی کونترۆڵی گرێی ئۆدیپ پێکهات و، هەستی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەر کردنی رکەبەرایەتی نێوان نەوەی لاوی ئەو سەردەمە سازکرا. وادیارە کە رەگەزی نێر لە وەرگرتنی هەموو ئەم ئەزموونانەدا پێشەنگ بووە و ئەزموونەکان دواتر لە رێگەی ژنێتیکی دوولایەنەوە بە ژنان گەیشتووە. تەنانەت هەستی کۆمەڵایەتی ئەمرۆش لە تاکدا بەشێوەی جۆرێک سەرخان پێکدێت کە پاڵنەرەکانی رکەبەرایەتی و بەخیلی لەگەڵ خۆشک و براکان، ژێرخانی ئەو پێکدێنێ. لەبەرئەوەی تاک ناتوانێ ئەم هەستە رقاوییە لە خۆیدا بمرێنێ، لەگەڵ نەیاری پێشووی یەک دەگرێ. تۆژینەوەی هەندێ بابەتی هاوڕەگەزخوازی ئەم گومانە دەسەلمێنێ کە لێرەشدا یەکبوون، جێگەی ئوبژەیەکی خۆشەویست دەگرێتەوە کە جێگەی روانگەی هێرشبەرانە و دوژمنکارانەی گرتۆتەوە.[٢٤]

ئەڵبەت کاتێ باسی گەشەی رەگەزی مرۆڤ دەکەین هەندێ پرسی نوێ دێتەئاراوە کە هەر کەسێک دەیەوێ خۆی لێ بپارێزێ. بەڵام دەبێ ئەم پرسانە شرۆڤە بکەین و نەترسین لەوە کە رەنگە تێیدا سەر نەکەوین. پرسەکە ئەمەیە: ئایا "خود"ی مرۆڤی سەرەتایی لە یەکەم رۆژەکانی ژیانیدا، دین و ئەخلاقی لە گرێی ئۆدیپ وەرگرت، یان لە"نەست"ی مرۆڤی سەرەتایی؟ ئەگەر "خود"ی مرۆڤ ئەم کارەی کرد، ئەی بۆ تەنیا "خود" بە میراتداری ئەم ئاکامانە نازانین؟ ئەگەر "نەست"ی مرۆڤ ئەم کارەی کرد، چۆن ئەم پرسە لەگەڵ ئاکاری "نەست" سازگار دەبێ؟ یان ئەوە کە لە سەردەمی سەرەتاییدا "خود" و "بان خود" و "نەست" هەر یەک شتن؟ یان رەنگە دەبێ راستگۆیانە بێژین کە بۆچوونی ئێمە لەمەڕ پرۆسەکانی "خود" بەگشتی یارمەتی تێگەیشتنی گەشەی رەگەزی مرۆڤ ناکاو بۆ ئەم مەبەستە بەکار نایەت؟

باشترە سەرەتا سادەترین پرسیار وەڵام بدەینەوە. نە تەنیا لە مرۆڤی سەرەتاییدا، بەڵکوو تەنانەت

لە هەندێ بوونەوەری سادەتریشدا دەتوانین جیاوازی "خود" و "نەست" بەدیبکەین، چونکە ئەم جیاوازییە نیشانەی حەتمی کاریگەری دنیای دەرەوەیە. بەپێی تیۆری ئێمە، لەراستیدا "بان خود" لەو ئەزموونانەوە پێکهات کە تەوتەم پەرەستییان لێکەوتەوە. کەوابوو بە سادەیی تێدەگەین کە ئەم پرسیارە: ئایا "خود" ئەم ئاکامانەی وەرگرتووە یان "نەست"، یارمەتیمان نادات. بە هەندێ قووڵبوونەوە لەم پرسە لەناکاو تێدەگەین کە "نەست" تەنیا لە رێگەی "خود"ەوە دەتوانێ ئاڵوگۆڕی دنیای دەرەوە ئەزموون بکات، "خود" بۆ "نەست" هێمای دنیای دەرەوەیە. سەرەرای ئەمەش، ناتوانین بێژین کە "خود" راستەوخۆ شتەکانی وەرگرتووە. لێرەدایە کە درزی نێوان تاک و رەگەز دەردەکەوێ. هەروەها نابێ جیاوازی نێوان "خود" و "نەست" بە حەتمی بزانین، یان نابێ لەبیرمان بچێ کە "خود" بەشێکە لە "نەست" کە بەشێوەیەکی تایبەت لەو جیا بۆتەوە. سەرەتا وادەنوێنێ کە ئەزموونەکانی "خود" لە پرۆسەی ژنێتیکیدا لەناو چووە، بەڵام پاش ئەوە کە زۆر کەس لە چەندین نەوەی یەک لە دوای یەکدا ئەم ئەزموونانە بەشێوەی بەهێز و پەیتا پەیتا دووپات بکەنەوە، ئەوجار ئەم ئەزموونانە دەبنە ئەزموونی "نەست" و کاریگەرییان بەهۆی ژنێتیک دەمێنێتەوە. بەمجۆرە، پاشماوەکانی چەندین "خود"ی بێ ئەژمار لە "نەست" دا- کە دەتوانێ بەهۆی ژنێتیک بگوێزرێتەوە- جێگیر دەبن و کاتێ کە "خود"، لە "نەست" "بان خود" بۆ خۆی دەخولقێنێ، رەنگە تەنیا چەند شکڵێک لە "خود"ەکانی پێشوو بژێنێتەوە و وزەی نوێیان پێدەبەخشێ.

شێوەی پێکهاتنی "بان خود" هۆکاری ئەم پرسە روون دەکاتەوە کە چۆن کێشمەکێشی سەرەتایی "خود" لەگەڵ وزەی دەروونی "نەست"، لە ململانێ لەگەڵ جێگرەکەی ("بان خود") درێژەی دەبێ. ئەگەر "خود" بەشێوەی شیاو بەسەر گرێی ئۆدیپدا سەرنەکەوێ، وزەی زۆری دەروونی ئەم گرێیە کە لە "نەست" سەرچاوە دەگرێ، سەرلەنوێ لە کاردانەوەی پێچەوانەی "خودی ئایدیال"دا دەست پێدەکات. پێوەندی زۆری نێوان ئایدیال و پاڵنەرە ناوشیارەکانی نەست، روونی دەکاتەوە کە بۆچی خودی ئایدیال تا رادەیەکی زۆر دەتوانێ لە دەروونی ناوشیاردا بمێنێتەوە، بەڵام "خود" ناتوانێ. ئەو خەباتەی کە سەردەمێک لە قووڵترین توێکانی زەیندا درێژەی هەبوو و بە سابڵیمەیشن و یەکبوونی خێرا کۆتایی نەهات، ئێستا لە بوارێکی بەرزتردا درێژەی هەیە.

## پەراوێزەکان:

١ دەکرێ ئەم بابەتە لەگەڵ ئەم وتارەم «یاداشتێک لەمەڕ دەروونی ناوشیار لە دەروونشیکاری دا» (١٩١٢) بەراورد بکەین. پێویستە لێرەدا هەندێ پرسی نوێ راڤە بکەین کە لە نرخاندنی دەروونی ناوشیاردا هاتوونەتە ئاراوە. هەندێ لە توێژەران کە حاشا لە دەروونشیکاری ناکەن بەڵام ئەوەندەش گرنگی پێنادەن، رێگایەکیان بۆ ئەم کێشەیە بینیوەتەوە کە کەس حاشای لێناکات. بە پێی ئەم رێگایە دەکرێ لە دەروونی وشیاردا چەندین ئاستی هەرە جیاواز دیاری بکەین. راست وەک چۆن هەندێ لە پرۆسەکان خاوەن رەهەندی تەواو وشیارانەن، بە هەمان شێوە هەندێ پرۆسە دەبینین کە رەهەندی وشیارانەیان ئێجگار کز و نادیارە. ئەم توێژەرانە دەڵێن دەروونشیکاران بەهۆی لایەنی کزی ئەم پرۆسانە، دەیانەوێ بە ناوی ناشیاوی «ناوشیار» ناودێریان بکەن.

بەڵام بەپێچەوانەوە ئەم پرۆسانە وشیارانەن و «لە دەروونی وشیار» دان، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەکرێ ڕەهەندی وشیارانەیان ڕاڤە بکەین.

ئێمەش لە درێژەی ئەم باسەدا لەسەر ئەم پرسە پێدادەگرین. ناتوانین بە ڕاشکاوانە ئاستەکانی دەروونی وشیار دیاری بکەین. بەهای ئەم شتە زیاتر لەم جۆرە تێزانە نییە: «ڕووناکی چەندین ئاستی جیاوازی هەیە، لە پرشنگدارترین نوور تا کزترین تروسکە؛ کەوابوو تاریکی قەت بوونی نییە»؛ یان «ژیان چەندین ئاستی جیاوازی هەیە، کەوابوو دیاردەیەک بە ناوی مەرگ بوونی نییە.» ڕەنگە ئەم تێزانە لە ڕەهەندێکی تایبەتەوە خاوەن مانا بن، بەڵام لە پراکتیکدا بەکار نایەن و ئەم شتە کاتێک ڕوون دەبێتەوە کە بمانەوێ لەو دوو تێزە ئاکامێکی تایبەت وەربگرین: «کەوابوو پێویستمان بە ڕووناکی نییە»، یان «کەوابوو هەموو گیانداران نەمرن.» هەروەها ئەگەر «ئەو شتانەی شاراوەن» وەک بەشێک لە «شتە وشیارەکان» بزانین، تەنیا دەرکی ڕۆشنی خۆمان لەمەڕ زەین خەوشدار دەکەین. بە هەر حاڵ، بە ڕای من دەروونی ناوشیاری نەناسراو، ئێجگار بێ ماناترە لە پرسی زەینی دەروونی ناوشیار. سەرئەنجام ئەو کۆششە کە دەیەوێ شتە نادیار و شتە ناوشیارانەکان وەک یەک بزانێ، دۆخی ئەکتیڤ لەبەر چاو ناگرێ، دۆخێک کە لە پێکهاتنی دەروونشیکاریدا گرنگی بەرچاوی هەیە؛ ئەم کۆششە دوو ڕاستی گرنگ پشتگوێ دەخات: یەکەم ئەوە کە گرنگیدان بە وەها پرسێکی نادیار، کارێکی ئێجگار دژوارە و پێویستی بە هەوڵی فراوان هەیە و؛ دووهەم ئەوە کە پاش ئەنجامدانی ئەم کارە، دەروونی وشیار ئیتر ئەو ئەندێشە کە پێشتر شاراوە بووە دەرک ناکات، بەڵکوو زۆر جار لەگەڵ خۆی بە نامۆ و ناکۆکی دەزانێ و بەخێرایی سەرکوتی دەکات. کەوابوو، هانا بردن لە دەروونی ناوشیارەوە بۆ ئەو شتانەی کە بە دەگمەن ئاشکرا و شاراوەن، بەرهەمی تێزێکە کە ناسنامەی زەین و دەروونی وشیار بە شتێکی کونکرێت و حەتمی دەزانێ.

٢. فرۆید زاراوەی "وزەی دەروونی" (cathexis) بۆ ئاماژە کردن بەو وزە زەینییە بەکار دێنێ کە بە ڕای ئەو، لەسەر پاشماوەکانی بیرگەی (memory traces) ئەندێشە بڵاو دەبێتەوە و دەتوانێ کەم و زۆر بێت و شوێنی خۆی بگۆڕێ و خاڵی ببێ. بە وتەیەکی سادەتر، «وزەی دەروونی» بریتییە لە هۆگری، سەرنجدان یان حەزی عاتفی بە ئەندێشە، پراکتیک، شت یان کەسێکی تایبەت.

٣. بەپێی ڕوانگەی فرۆید، خواستە سەرکوتکراوەکانی مرۆڤ لە خەوندا بەجۆرێکی تر دەردەکەون تا مرۆڤ تووشی فۆبیا (ترس و سام) نەبێت. فرۆید چەمکی "ڕۆڵی خەون" (dream work) هەر بەم مانایە بەکار دەبات.

4. Cf ‘On Narcissism: an introduction’ (1914), and Group psychology and the Analysis of the Ego (1921).

٥. پێم وایە هەڵەی من ئەوە بووە کە ڕۆڵی «تاقیکردنەوەی ڕاستییەکان» (reality-testing) م لەگەڵ "بان خود" پێوەند داوە. دەبێ ئەم خاڵە ڕاست بکەینەوە. ئەگەر "تاقیکردنەوەی ڕاستییەکان" بەهۆی "بان خود" ئەنجام درابا، ئەم پرسە بەتەواوی لەگەڵ "خود" و جیهانی هەستەکان سازگار بوو. هەروەها پێشتر هەندێ شتم لەمەڕ "کاکڵی خود" باسکردووە کە هەرگیز بەشێوەی هەمەلایەنە دامنەڕشت و پێویستیان بە ساغکردنەوە هەیە، چونکە دەکرێ سیستمی تێگەیشتن — وشیار بە تەنیایی بە کاکڵی "خود" بزانین.

٦. چەقبەستنی وزەی سێکسی (libido) لە شتێک یان کەسێکی تردا، لە دەروونشیکاریدا بە «وزەی دەروونی بابەتی حەزەکان» (object-cathexis) پێناسە دەکرێت.

7. ‘Mourning and Melancholia’ (1917)

٨. فرۆید "قۆناغی زارکی" (oral phass) بە یەکەم قۆناغی پێنج دەورەی گەشەی دەروونی منداڵ دەزانێ. لەم قۆناغەدا کە لە سەرەتای لەدایک بوونەوە دەست پێدەکا و تا هەژدە مانگی درێژە دەکێشێ، وزەی سێکسی لە زاردا کۆدەبێتەوە. بە رای فرۆید، «قۆناغی زارکی» لە دوو دەورەی «پەسیڤ» و «هێرشبەرانە» (Aggressive) پێکدێت: لە دەورەی "پەسیڤ" دا کە لە رۆژی یەکەمەوە دەست پێدەکاو تا هەشت مانگان درێژەی دەبێ، منداڵ بەشێوەی پەسیڤ لە سینگی دایکی شیر دەنۆشێ؛ لە قۆناغگی "هێرشبەرانە"دا کە لە هەشت مانگانەوە دەست پێدەکاو تا هەژدە مانگە درێژە دەکێشێ، بەشێنەیی هەستی سەربەخۆیی لە منداڵدا دروست دەبێ و بۆ دەربڕینی تووڕەیی و ناڕەزایەتی خۆی، گاز لە مەمکی دایکی دەگرێ.

٩. خەڵکانی سەردەمی کۆن لەسەر ئەم بڕوایە بوون کە تایبەتمەندییەکانی حەیوانی کە لە خۆراکدا دەخورێن، هەندێ لایەنی مرۆڤەکان پێکدێنن و بەمپێیە، خواردنی هەندێ ئاژەڵیان قەدەغە دەکرد. ئەم بابەتە و یەکبوونی کەسێتی لە وزەی دەروونی بابەتی حەزەکان زۆر لێک دەچن. هەروەک هەموان دەزانن، ریشەی مرۆڤخۆری هەر لەم بڕوادایە و دەوری لە بەکارهێنانی جیاجیای خۆراکی تۆتم و عیشای رەبانیدا دەبینرێ. لە راستیدا، ئاکامەکانی ئەم بڕوایە لە زاڵبوونی زارکی بەسەر ئوبژەی حەزەکاندا، دواتر لە هەڵبژاردنی ئوبژەی سێکسیدا دەبینرێ.

١٠. "ناخ هاوێژی" (introjection) بریتییە لە وەرگرتنی دیدگا و باوەڕ و پێوەرە ئەخلاقییەکانی ئەوانیدی (بۆ وێنە دایک و باوک). لە راستیدا، «ناخ هاوێژی» بناغەی «بان خود» (superego) پێکدێنێ.

١١. "گەڕانەوە" (regression) کاتێ روو دەدات کە "خود" ناتوانێ پاڵنەرەکانی هێزی سێکسی بەپێی ئەو شتە کە فرۆید بە "بنەمای راستییەکان" پێناسەی دەکا، کونترۆڵ بکات، بۆیە مرۆڤ روانگە و رەفتارێکی منداڵانە دەگرێتەبەر کە پێوەندی بە قۆناغەکانی پێشووی گەشەی دەروونەوە هەیە.

١٢ . هەڵبژاردنی ئوبژەی سێکسی بە مەبەستی دامرکانی وزەی دەروونی، لە دەروونشیکاریدا بە «هەلبژاردنی ئوبژە» (object-choice) ناودێر دەکرێت.

١٣. فرۆید ئەو بەشە لە وزەی سێکسی کە لەجیاتی چەقبەستن لە "خود"دا، لە ئوبژەی دەرەکی دا چەقدەبەستێ، بە "وزەی سێکسی ئوبژە" (object-libido) ناودێر دەکات.

١٤. "سابلێیمەیشن" (sublimation) یان تەعید یەکێ لە شێوازەکانی مکانیزمی بەرەنگاری دەروونە کە لەودا، تاک بەهۆی ناکامی لەو خواستانەدا کە دەروونی وشیار بە ناشیاوی زانیون، بەشێوەی ناوشیارانە هەر ئەو خواستانە بە جۆرێکی جیاواز بەڵام شیاو بەدیدێنێ.

١٥. ئێستا کە جیاوازی نێوان "هەست" و "نەست" مان دیاری کرد، دەبێ ئەوەش بڵێین کە "نەست" — هەر وەک لە وتاری خۆشەیدایی (١٩١٤) دا ئاماژەم پێکردووە- سەرچاوەی بەرینی وزەی سێکسییە. بەهۆی یەکبوونی کەسێتی کە پێشتر باسم کرد، وزەی سێکسی بەرەو "خود" لوزەو دەبەستێ کە سەرچاوەی "خۆشەیدایی دوهەم" پێکدێنێ. [بە رای فرۆید دوو جۆر خۆشەیدایی هەیە: ١) "خۆشەیدایی سەرەتایی" کە پرۆسەیەکی گونجاوە و لە دوو قۆناغی ئۆراڵی و ئاناڵی گەشەی دەروونی منداڵ دا روو دەدات، یانی ئەو کاتانە کە منداڵ تێدەکۆشێ نیازەکانی جەستەی خۆی (خواردن و گووکردن) دابین بکات؛ ٢) "خۆشەیدایی دووهەمی" کە جۆرێک دەروونژاکاوییە و لە قۆناغەکانی دواتردا بەهۆی پێشگرتن لە وزەی سێکسی و نەگەیشتن بە ئوبژەی خۆشەویست روو دەدات.]

١٦. "کەسێتی فرەلایەنە" (multiple personality) جۆرێک تێکچوونی دەروونییە کە مرۆڤی تووشبوو، بە شێوەی جیا جیا چەندین کەسێتی جیاواز لە خۆی دەردەخات و هەر کام لەم کەسێتییانە لە بوونی کەسێتییەکانی تر بێ ئاگایە.

١٧ . ڕەنگە باشتر ئەوەیە [لەجیاتی «یەکبوون لەگەڵ کەسێتی باوک»] یەکبوون «لەگەڵ دایک و باوک» بەکار بێنین، چوونکە بەر لەوە کە منداڵ ڕەهەندی جیاوازی سێکسی ژن و پیاو (نەبوونی ئەندامی نێرینە) بناسێ، ناتوانێ جیاوازی بەهایی نێوان دایک و باوکی دەرک بکات. لەم دواییەدا لەگەڵ ژنێکی گەنجی هاوسەردار بەرەوڕوو بووم کە بەسەرهاتی دەریدەخست کە کاتێ زانیویە ئەندامی نێرینەی نییە، وایزانیوە تەنیا ژنانی زەبوون لەم ئەندامە بێبەشن و هێشتا پێیوابوو کە دایکی هەیەتی. لەم وتارەدا بۆوەی باسەکە ئاڵۆز نەبێت تەنیا باسی یەکبوونی منداڵ لەگەڵ باوکمان ڕاڤە کرد.

١٨. پشتبەستنی لەڕادەبەدەر بە داکۆکی عاتفی و جەستەیی ئەویدی، لە دەروونشیکاریدا بە «پاڵپشت خوازی» (analysis) ناودێر دەکرێت.

١٩ . فرۆید بوونی هاوکاتی دوو خواست و هەستی ناکۆک لە سەردەمی منداڵیدا کە قۆناغی گرێی ئۆدیپ تێپەر دەکات، بە «دوو ویستی» (ambivalence) پێناسە دەکات.

٢٠ . «گرێی ئۆدیپی هاوڕەگەزخوازانە» (inverted Oedipus complex) بریتییە لە خواستی سێکسی مرۆڤ بە دایک یان باوکی کە هاوڕەگەزی خۆیە.

٢١ . «کاردانەوەی ئاوەژوو» (reaction formation) مکانیزمێکی بەرەنگارییە کە بە مەبەستی کەم کردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ، کۆمەڵێک هەست و خواست سەرکوت دەکا و لەجیاتی ئاوان هەندێ هەست و خواستی جیاواز بەرجەستە دەکات. بە وتەیەکی تر، مرۆڤ دیدگایەک وەردەگرێ کە بەتەواوی لەگەڵ خواستەکانی دەروونی ناوشیاری ناکۆکی هەیە. بۆ نموونە، منداڵێک کە هەستی ڕق و قێزنی لەئاست دایکی سەرکوت کردووە، زۆر نیگەرانی تەندروستی دایکی دەبێت.

٢٢ . فرۆید چەمکی «قۆناغی شاراوە» (latency period) بۆ ئاماژە بە مەودای زەمەنی شەش ساڵان تا دوانزە ساڵانی تەمەنی منداڵان بەکار دێنێ و پێی وایە لە درێژەی ئەم قۆناغەدا، خواستی سێکسی منداڵ دەوەستێ و وزەی سێکسی منداڵ پاشەکەوت دەبێ و بۆ خواستی ناسێکسی بەکار دەبرێ.

٢٣ . لێرەدا زانست و هونەرم لەبەرچاو نەگرتووە.

24 . Cf. Group psychology (1921),  and some neurotic mechanisms in jealousy, paranoia and Homosexuality> (1922).

## سەرچاوە:

گۆڤاری ارغنون ژمارە ٤

# مژدەبەخشی فڕین ڕووەو ئەستێرەکان

نووسینی: کارۆل کریسچن
لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا نووسەرانی ئینگلیز ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆریان چنیەوە، نەک بەتەنها لە وڵاتەکەی خۆیاندا، بەڵکو لە سەرانسەری جیهاندا. بە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی کتێب و ڕۆژنامەکانیان دەخۆێندەوە کە پێشتر هەرگیز بەو ڕادەیە خوێندەواران دڵگەرم نەبوون. لەم سەردەمەدا نووسەرەکان پارەو پاداشتی باشیان دەستکەوت و خەڵکێکی پتر سەرسام بوون بە شاکارەکانیان. بۆ هەر شوێنێک بچوونایە وەک کەسانی ناودار خەڵکی ئاوڕی لێ دەدانەوە و دەناسرانەوە. چەندەها ناوی گەورەو درەوشاوە لەنێو نووسەرانی ئەو سەردەمەدا هەبوون، وەکو تۆماس هاردی، جۆزێف کۆنراد و هێنری جەیمز. دەکرا زۆربەیان بە « پیاوانی خاوەن پەیام» ناوزەد بکرانایە. ئەوەش بەو مانایە دێت کە ئەوان داهێنەر بوون و بە قووڵی ئاگایان لە میراتی ئەدەبی پێش خۆیان بوو، هەر لە لیرک و داستان و سترانەکان تا دەگات بە هونەری هۆنینەوەو نووسین. ئەوان بە زمانەکانی وەک لاتینی و یۆنانی ئاشنا بوون. ئەم شتانەش بۆ خۆیان بابەتی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە بوون بۆ کەسانی ڕۆشنبیر و خوێندەواری ئەو سەردەمە.

بەهەرحاڵ، لەو قۆناغەدا بەتەنها نووسەرێک هەبوو کە شتێکی کەمی سەبارەت بەو بابەتانەی لەسەرەوە باسمان کرد دەزانی. ئەو زاتە سەرگەرمی ئەوە بوو خۆ بەخۆ فێری هەموو شتەکان بێت و زۆریش هەوڵ و تەقەللای دەدا کە دەستی بە زانست و پەروەردەو فیکردا ڕابگات. بابەتی سەرەکی بۆ ئەم دونیای زانست بوو، بەتایبەتیش حەزی بە زیندەوەرزانی هەبوو. ناوی ئەو نووسەرە «هێربرت جۆرج وێڵز» بوو.

«وێڵز» لە ساڵی (١٨٦٦)دا لەدایکبوو، هەر لەوکاتەدا بوو کە دۆزینەوەو داهێنانە زانستییەکان

چەندەها گۆڕانگاری گەورەی لە دونیادا بەرپا کرد. چەندەها ماکینەو ئامێرت لە کێڵگەکان و ناو کارگەکاندا دەبینی. هەڵم بوو بەسەرچاوەی وزەو هێز بۆ پاپۆڕەکان و شەمەندەفەرەکان. هەڵم وایکرد کە ئامێرو دەزگا چەرخەدارەکان بکەونە جووڵەو پێچکەکان بخولێنەوە. خەڵکی خێراترو دوورتر سەفەریان کرد. سوپاس بۆ ئەو هەموو شتە سەرسامکەرەی جیهانی میکانیک کە بوونە مایەی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژیان.

خەڵکیی ڕووی کردە زانست تاوەکو وەڵامی پرسیارەکانی خۆیان دەستبکەوێت، هەروەک چۆن زووتر ڕوویان کردبووە ئایین. لە ئینگلتەرەدا خەڵکێکی کەمتر هەبوون کە بە وەڵامەکانی ئاینی مەسیحی قایل بن. زۆر بوون ئەوانەی بڕوایان وابوو کە زانست لەتوانایدا هەیە وەڵام بە پرسیارەکانیان بداتەوە لەمەڕ سەرەتا و کۆتایی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەمین: هەموو بڕوای خۆیان خستە ناو زانست.

بەڵام ژمارەی ئەو نووسەرانە هێشتا کەم بوون لەو هەموو گۆڕانکارییە گەورانە تێبگەن کە بەڕێوە بوون. زانست توانی لە هەنووکەدا ژیانی مرۆڤ ئاسانتر بکات، دەوڵەمەندتر، زۆر ئاسوودە و خۆشتر. زانست وایکرد نەخۆشەکان چاک ببنەوەو جەنگەکان ببرێنەوە. بەڵام ئەمەیان بەڕاستی چ مانایەکی بۆ ئایندەی مرۆڤ هەبوو؟ لەبەر ئەوەی «ئێچ.جی.وێڵز» وا پەروەردە کرابوو کە وەک زانایەک بیربکاتەوە، بۆیە ئەم ئایندەی مرۆڤی لەبەر رۆشنایی لێکدانەوەو تێگەیشتنە زانستییەکاندا دەبینی. بۆ یەکەمجار کە هەوڵیدا خەیاڵ لە گەشتێک بکاتەوە ڕووەو مانگ یان جەنگێکی نێوان ئەستێرەکان، بەتەنها خەیاڵی بۆ ئەو ڕووداوانە رۆیشت کە لە ڕووی زانستییەوە شیاوبوون. لەبەر ئەوەی زانست هەنگاوی گەورەی نابوو لە هەموو بوارەکاندا، تا دەهات پتر گەشەی دەکرد، بۆیە چاوەڕێ دەکرا دوورتر هەنگاو بنێت. هەر ئەوەش بوو کە وایکرد کتێبەکانی زۆر خۆشەویست بن. لەوە دەچوو بتوانێت دوورتر ببینێت و پێشبینی داهاتوو بکات کە چی تێدا دەقەومێت، ئەم توانی خوێنەرەکانی خۆی لەگەڵ خۆیدا ببات تاوەکو بەشداربن لە بینین و هەستکردن بەو هەموو شتە سەرسامکەرانە.

«وێڵز» کەسێکی ئازا بوو کە توانی ئەو هێزو توانایەی هەبێت خۆی پێبگەیەنێت لەدوای ئەو قۆناغە دژوارو نالەبارەی منداڵی. ئاخر دایک و باوکی وەک خزمەتکار و بەردەست لە ماڵێکی خۆش و خانەدان کە کەوتبووە باشووری»ئینگلتەرە» کاریان دەکرد. لەدوای ئەوەی چەند منداڵێکیان بوو دوکانێکیان بۆ ماوەیەک کردەوە، بەڵام لەوەدا زۆر سەرکەوتوو نەبوون. گەرچی دەیانزانی کە کوڕەکەیان بێ ئەندازە زیرەکە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەندە تێینەدەگەیشتن.

دایکەو باوکە بەتەنها خەونیان ئەوەبوو کە کوڕەکەیان ئیش و کارێکی هەمیشەیی و باشی بە مووچەیەکی بەردەوام دەستبکەوێت.

ئەوکاتەی »بێرتی» تەمەنی بوو بە سیانزدە ساڵ، هەروەک براکانی، ڕەوانەی دوکانێکیان کرد تاوەکو فێری کار و پیشەیەک بێت. بەڵام کوڕیژگە دڵی بە کڕین و فرۆشتن نەدەکرایەوە. لەوکاتەی کە دەبوو سەرگەرمی ئیش و کار بێت، سەری بەسەر کتێبەکاندا شۆڕ دەکردەوە. ئەوەندەی کە هەستی پێدەکرد و دەیبینی کە هیچ یەکێک لە هاوڕێکانی و براکانی هەمان حەز و خولیای ئەمیان

نەبوو، کەسیان بەشداری ئەو خەون و خولیایەی ئەو کوڕیژگە نەبوو. ئەوان بەو کوڕە لاوە پێدەکەنین کە لەو دوکانە شاگرد بوو، هەموو کاتی خۆی بە خوێندنەوەو مشت و مڕ بەسەر دەبرد.

گەرچی ئەم هیچ شتێکی دیکەی لەوە باشتر نەدەزانی، وەلێ گران بوو لەو جۆرە ژیانە ڕابێت وەک شاگرد و بەردەستێک لەو دوکانەدا، هەر بۆیە تا دەهات پتر و پتر نیگەران و دڵتەنگ دەبوو. دواجار لەو دوکانە ڕایکردو چۆوە کن دایکی. ناچار دایکە کارێکی دیکەی بۆ دۆزییەوە، پاشان کارێکی دیکە. بەڵام هەموو جارێک هەمان بەزم ڕووی دەدایەوە. کوڕیژگەکە لەو کارانەدا هیچ سەرکەوتنێکی بەرچاوی نەبوو. ڕقی لەو ئیشانە بوو، هیچ کام لە وەستاکانی بەو هەرزەکارە ئاسوودە نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا دایکەو باوکە مکوڕ و سوور بوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە فێری پیشەو ئاڵووێرێک ببێت. هەردووکیان لەوە دەترسان کە کوڕەکەیان بۆ هەمیشە شکستە باڵ بێت و نوشوستی چارەنووسی بێت.

«وێڵز» یش بۆ خۆی لە نائومێدی و بێبەختی نزیک ببۆوە. بەڵام دواجار، کە تەمەنی گەیشتە حەڤدە، بەختی هەبوو کە لە قوتابخانەیەکدا پۆستێکی دۆزییەوە کە بتوانێت تیایدا هەم خوێندنەکەی خۆی تەواو بکات و هەم وەک مامۆستاش وانە بڵێتەوە بە کچ و کوڕە بچکۆلەکان، بەم پۆستە یارمەتی بژێوی خۆی پەیدا بکات و پۆستەکەش بە «مامۆستای فێرخواز» دەناسرا.

«وێڵز» توانی لەو شوێنەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و باشتر ڕۆژگاری خۆی بەسەر ببات. یەک لەدوای یەک تاقیکردنەوەکانی بڕی تاوەکو توانی کورسییەکی خوێندن لە زانکۆی «لەندەن» مسۆگەر بکات. هەتا لەو قۆناغەشدا ژیانی پڕ بوو لە دژواری و مملانێی کوشندە. پارەیەکی وا زۆری نەبوو کە خۆراکی ڕۆژانەی بەتێری بۆ دابین بکات و تەندروستی ڕووی لە خراپی بوو. ئەو زاتە زۆربەی وەخت نەخۆش بوو، هەندێکجار لە مەرگیش نزیک دەکەوتەوە. زۆربەی ڕۆژەکان تەنها (پێنس) ێک یان دوو پێنسی لە گیرفاندا بوو. گەربێت و برادەرەکانی یارمەتیان نەدایە ئەگەری ئەوە هەبوو لەبرساندا بمرێت.

گەرچی بەلەش و لار لاواز و هەمیشە دەردەداربوو، بەس «وێڵز» ڕوحێکی گەورەو جەربەزەی هەبوو، زەلامێکی سەرسەخت و جیڕ بوو. لەشاری» لەندەن»دا جیهانێکی دیکەی دۆزییەوە کە خەڵکی دڵگەرم و زیندووی تێدا دۆزییەوە لەتەک چەندەها بیر و باوەڕ و ئایدیای تازە کە زۆر زەحمەت بوو لە ڕۆژانی شاگرد بوونی لە دوکانەکاندا خەونی پێوە ببینیبێت. ژمارەیەک لەو دۆستانەی دۆزییەوە کە هەمان حەز و خولیایان هەبوو سەبارەت بە زانست و پێشکەوتنەکانی. هەر دواتر کەوتە داوی خۆشەویستی و زەماوەندی سازکرد، هەر بە وانە وتنەوەو نووسین توانی نانی خۆی و هاوسەرەکەی پەیدا بکات- هەرکارێکی دیکەی دەست بکەوتایە لە پەناوە، سڵی لێنەدەکردەوە.

پاشان وای لێهات تا ڕادەیەکی زۆر کە هەموو کاتی خۆی بۆ نووسین تەرخان بکات، ئەوەشیان هەر بەرێکەوت بوو. بەڵام تەندروستی خراپتر بوو. سنگی بەجۆرێک داڕزابوو کە بەدەم کۆکەوە خوێنی هەڵدەهێنایەوە، ناچار دەبوو پشوویەکی درێژ بخوازێت و کار نەکات. هەر لەو قۆناغەدا بوو کە زانی بەخت و هونەری وا لە نووسینی چیرۆکدایە.

چیرۆکەکانی «وێڵز» زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش بوون و لەپاڵ ئەوەشدا پڕ مانا و پەیام بوون. ئەم گەرەکی بوو گوزارشت لە بیرو بۆچوونەکانی خۆی بکات سەبارەت بە ژیان. ئەم دەیویست چەندەها شت لەم جیهانەدا بگۆڕێت. ئەم نووسەرە وای مەزندە دەکرد کە ئەم جیهانەی تیایدا دەژین خێرا ڕووەو داڕووخان و هەڵدێرێک هەنگاو دەکوتێت. ئەم دەیویست خەڵکی بۆ ئەوە ئامادە بکات کە زانست دەتوانێت چی بکات، بەهەردوو دیودا، چ چاکەو جوانی بێت و چ ناشرینی و وێرانەیی بێت. ئەم بڕوای وابوو کە مەعریفەتێکی زانستیانە، گەر بە ڕاستی و دروستی بەکاربێت، ئەوە کلیلی داهاتوو دەداتە دەست مرۆڤ. ئەم دەیخواست مرۆڤ فێر بکات ژیرانە ئەو زانستە بخاتە گەڕ.


ویلز

لە یەکەمین کتێبی مەزن و ناوداری خۆیدا، «ماکینەی زەمەن»، وێڵز سەبارەت بە گەشتیارێکی نووسی کە بەناو زەمەندا سەفەر دەکات تا دەگاتە (٨٠٢٧٠١). لە کتێبی (مرۆڤێکی نادیار)دا باس لە کەسێکی بێگانە دەکات کە خۆی دەگەیەنێتە گوندێکی ئینگلیزی. لە کتێبی (جەنگی نێوان جیهانەکان)دا باس لە کۆمەڵێک بوونەوەر دەکات کە لە (مەریخ)ەوە دێن و لە ئینگلتەرە دادەبەزن و زۆر خێرا دەبنە فەرمانڕەوا بەسەر هەموو خەڵکی ئەو ناوچەیەوە. دیارە ژیانی ئاسایی لەسەرزەمین نامێنێت. کۆمەڵگای پێشکەوتووی سەدەی بیستەم لەناکاو دادەڕمێت. خەڵکانی ناو نەتەوەیەکی پڕ لە فیز و شکۆدار وایان لێ بەسەر بێت کە کەمەکێ لە ئاژەڵەکان سەرووتربن و بژین، لەناو ئاخنی هەموو ئەو چیرۆکە خەون ئامێزانەدا خەڵکی ڕاستەقینە لەناکاو ڕووبەڕووی چەندەها دۆخ و هەڵوێستی سەیرو نائاسایی دەبنەوە. لە جیهانێکدا کە زۆر خێرا دەگۆڕێت وەک ئەم جیهانەی ئێمە تیایدا دەژین، ئەم جۆرە ڕووداوانە بەسەریەکەوە مەحاڵ نین. ئەگەری ئەوە هەیە ڕوو بدەن. وێڵز هەستی دەکرد کە وا چاکترە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

دیارە نووسەر تابلۆیەکی ترسناکمان پیشان دەدات لەمەڕ ئەوەی کە مرۆڤی زانستخواز چی لێ بەسەر دێت گەر زاڵ نەبێت بەسەر ئەو هێزەدا کە دەستی کەوتووە. لەوە دەچوو پرسیارێکی لەم چەشنە بکات:-

« ئاخۆ ئێمە دڵنیاین لەوەی کە مرۆڤ چاکتر دەبێت گەر هێز و تواناکانی زیاتر بن؟»

چیرۆکەکانی ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە خەڵکانی ناو ساڵانی (٨٠٢٧٠١): مرۆڤە نادیارەکە، مەردوومەکانی هاتوو لە (مەریخ)ەوە نە چاکتر و نە ئاسوودەترن لەو خەڵکانەی ئێمە دەیانناسین. ئەو بوونەوەرانە کاری وا دەکەن کە ئێمە نایتوانین، بەڵام ئەوان لە مرۆڤایەتی بوون شۆراوبوونەوە. ئەوان قوربانیان دابوو بە هەست و نەستی وەک خۆشەویستی، سۆز و بەزەیی بۆ هێز و توانایەکی ماکینە ئاساو سامناک.

وێڵز لەسەر چەندەها بابەت کتێبی جۆراو جۆری نووسی. هەندێک لە باشترین ئەو کتێبانەی دەربارەی کەسانێکی سادە، گێلۆکە، گەنجانێکی پڕ خەون و تەماع وەک خۆی لەوەختی لاوییەتی.

لەدەقی (کیپس) و (مێژووی ئاغای پۆلی)دا کەڵکی لەو ئەزموونە تاڵ و پڕ ئازارەی خۆی بینیبوو کە لەناو جیهانێکدا گەورە ببوو بۆ کەسانی وەک ئەم هەژار گران و کوشندە بوو. بەڵام کارەکتەرەکانی دەبوونە مایەی گریان و پێکەنینی ئێمە. هەروەک کتێبەکانی پێشووتری کە سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، ئەوانەشی کە دواتر نووسیبوونی شایستەی خوێندنەوە بوون و تا ئەمڕۆش هەر وایە. لە کتێبی (ئان ڤێرۆنیکا) سەبارەت بە خۆشەویستی نێوان ژنەکان و پیاوەکان ئەوەندە بە ڕاستگۆیی نووسیبووی لەوەشدا دیسانەوە پەیامێکی جوان و راستەقینەی هەبوو.

وێڵز ویستی ڕێ و رەسمی زەماوەند و هاوسەرگیری لە وڵاتەکەیدا بگۆڕێت و سەربەستییەکی پتر بدات بە کەپڵەکان.

سەرکەوتنی ئەم وەک نووسەرێک- وای کرد کە ناوبانگی بە درێژایی ژیانی لەبرەودابێت و زۆر خێرا ئەم شکۆمەندییەی چنیەوە- بەڵام ئەمەیان بۆ»وێڵز« بەس نەبوو. ئەم دەیویست شێوەو ئاکاری ئەم دونیایە بگۆڕێت. زۆر وتار و کتێبی راستەقینەو پڕ پەیام و ناوەرۆکی لەسەر ئەو جیهانە نووسی کە هەبوو، هەروەها ئەو جیهانەی کەلەوەدایە بێتە کایەوە. ئەم کتێبانە سەرنجی خەڵکێکی زۆری راکێشا. ئەم نووسەرە بوو بەو پەیامبەرەی کە هەرگیز نەوەستا لە هوشیار کردنەوەی نەتەوەکەی خۆی لەمەڕ ( شێوەی ئەو هەموو شتانەی کە بەڕێوەن بێن)، کە ئەوەش ناوی یەکێک لە کتێبەکانی بوو. ئەم پێشبینی زۆر شتی کرد: جەنگەکان و چوونە ناو بۆشاییەکانی ئاسمان، هەر بۆ نموونە. لەو ژیانە دوورو درێژەی خۆیدا تەمەنی گەیشتە نزیکی هەشتاو حەفتا کتێبی نووسی، بە چاوانی خۆی زۆر لە پێشبینییەکانی بینی کە هاتنە دی. کەواتە ئەو ترسە زۆرەی کە هەیبوو لەوەی کە لە گوینە مرۆڤ سەرکەوتوو نەبێت لە بەکارهێنانێکی راست و دروستی ئەو هێز و توانایەی کە زانست پێیبەخشیوە، لەم ڕۆژگارەدا خەڵکێکی زۆر هەن کە لەگەڵ نووسەردا هاوبەشی هەمان ترس و بیمن.

وێڵز پیاوێکی بچکۆلە بوو. کەچی بوو بە یەکێک لە کەسە هەرە مەزنەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە. ئەم پێشبینی هاتنی چاخی چوونە ناو فەزای کرد هەتا بەرلەوەی مرۆڤ فێری فڕین بێت، لەناو ئینگلتەرەیەکی هێمن و بێ مەترسی ڕۆژگاری (١٨٩٨)دا چەند وشەیەکی نووسی کە زۆر تازە دەردەکەون وەک دوا دابەزین لەسەر خاکی مانگدا. ئەم ئەوەشی درکاند کە ئەم ئەستێرەیەی ئێمە مەرج نیە بۆ هەمیشە شوێنێکی بێ مەترسی بێت بۆ ئەو کەسانەی تیایدا دەژین. وێڵز رەسمی سەردەمێکی ترسناکی بۆ ئێمە کێشا کە لەڕێدایە بێت گەر ئێمە گوێ لە ئاگاداری و هەڕەشەکانی نەگرین. زەمەنێکە کە «ڕۆشن و ئاشکرا دیارە کپ و خامۆش، کوشندەو دژوارە، لەژێر کازیوەی دوا بەرەبەیانی ڕۆژێکی فرە مەزندا ...».

## سەرچاوە:


Great people of our Time

Carol Christian Macmillan, 1973

Printed in Hong kong



# دەنگێکی ڕەسەن لە ئیسپانیاوە

## Carlos Ruiz Zafon

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە سوویدییەوە
ئارام کاکەی فەلاح

کارلۆس زافۆن، ڕۆمان نووسی ئیسپانی، لە ٢٥ ی سپتێمبەری ١٩٦٤ دا لە بەرشلۆنە لەدایک بووە. لە باوکێک لە باشووری ئیسپانیا و دایکێکی خەڵکی کاتالان، بەڵام ئەم بە ئیسپانی دەنووسێ، نەک کاتالانیی. لە سەرەتادا لە بواری ڕیکلامدا کاری کردووە. تا بە تەواوی بێتاقەت دەبێ و دەستی لێ هەڵدەگرێ و ڕوودەکاتە مۆسیقا و نووسینی نۆتەی مۆسیقیی. تا لەساڵی ١٩٩٣ دا یەکەم ڕۆمانی خۆی دەنووسێ، کە بۆ گەنجان بووە. تا ئێستا ٦ ڕۆمانی هەیە، چواریان بۆ گەنجانە و دووانی ئەم دووایییەشیان وەک خۆی دەڵێ بۆ گەورەکان. یەکەم ڕۆمانی بە ناوی (ئێل پرینسپێ دێ لا نێبلا)، کە ڕۆمانێکی زۆر سەرکەووتوو بوو، ساڵی ١٩٩٣ نووسی و توانی خەڵاتێکی گرنگی ئیسپانی بەرێتەوە و لەوەوە ناوبانگ وەربگرێت. سێ ڕۆمانی تری هەر بۆ گەنجان نووسی، لە ساڵەکانی ٩٤ و٩٥ و٩٩ دا، ئەمەی ساڵی ١٩٩٩ی ناوی مارییانەیە، بەڵام وەکو ئەوەی یەکەمی پێشوازی لێ نەکرا. ساڵی ١٩٩٤ کە کارلۆس زافۆن سەفەری کرد بۆ لۆس ئەنجلۆس لە ئەمریکا و لە هۆڵیود وەک نووسەری فیلم دەست بەکار بوو. لەو کاتەدا بوو کە دەستی کرد بە نووسینی یەکەم ڕۆمانی خۆی بۆ گەورەکان، بە ناوی سێبەری ڕەشەبا، کە لێرەدا چاوپێکەوتنێکی ئەم نووسەرە تازەیە دەخوێننەوە لە بارەی ئەم ڕۆمانە گرنگەوە. کە ساڵی ٢٠٠١ تەواوی کرد، ساڵی ٢٠٠٤ گەڕایەوە بۆ بەرشلۆنەو ئێستا لەوێ دەژی. ڕۆمانی دووەمیشی بە ناوی ( یاری فریشتە) کە ساڵی ٢٠٠٨ نووسی. من کە ڕۆمانی سێبەری ڕەشەبام بە سویدی خوێندەوە، هێندە بە دونیای ئەم نووسەرە سەرسام بووم، نەمدەتوانی کتێبەکە دابنێم، پێم سەیر بوو نووسەر بتوانێ ئەو هەموو جوانییە لەتەنیا کتێبێکدا کۆبکاتەوە. ئەو هەموو گێڕانەوانە لەناو یەک گێڕانەوەدا، خۆی وتەنی چەند ڕۆمانێکە لەناو ڕۆمانێکدا. چەند ژانرێکە لەناو یەک ژانردا

کۆبۆتەوە. ( دانێل)ی پاڵەوانی ڕۆمانەکە، کە تەمەنی ١١ ساڵانەو لەگەڵ باوکیدا دەژی، چونکە دایکی لەمێژە مردووە. ئەم کوڕە بەیانییەک لەخەو هەڵدەستێت و سەیر دەکات ناتوانێ سیمای دایکی بیر بکەوێتەوە، هەرچەند هەوڵ دەدا ناتوانێ. باوکیشی وەک دیارییەکی جەژنی لەدایک بوون دەیبات بۆ شوێنێکی زۆر سەیر، کە بە گۆڕستانی کتێبە کۆنەکان ناو دەبرێ، لەوێدا ئەم برادەرە بۆی هەیە کتێبێک هەڵبگرێتەوە و هەموو تەمەنی ئاگای لێ بێ نەفەوتێ، ئەویش ڕۆمانێک هەڵدەگرێتەوە بە ناوی سێبەری ڕەشەبا، کە نووسەرێک نووسیوویێتی، کەس نایناسێت، نووسەرەکە ناوی جولیان کاراکسە. ئیدی ژیانی دانێل بە جۆرێک تێکەڵاوی ئەم کتێبە دەبێ و بەجۆرێک دوای چارەنووسی ئەم جولیانەدا دەگەڕێ، کە لە ڕووداوێکی نادیارو پڕ تەم و مژدا دەکوژرێ و دانێل تەواو پێوەی گیرۆدە دەبێ. ئەم ڕۆمانە بە جۆرێک بەلای خۆیدا ڕاتدەکێشێ و بە جۆرێک قووتت دەدا، کە تۆش وەک خوێنەرێک حەز دەکەی بەشداری بکەیت لەگەڕان بە دوای کاراکتەرەکانیدا. ئەم ڕۆمانە لە دوای دۆنکیشۆتەوە، پڕ فرۆشترین ڕۆمانێکە لە مێژووی ئیسپانیادا. ١٥ ملیۆن نووسخەی هەر لەوێ لێ فرۆشراوە، بە ٣٥ زمانی جیاواز وەرگێردراوە و چەندەها خەڵاتی ئەدەبی نێودەوڵەتی وەرگرتووە. کە پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن کە بۆ دەنووسێ، دەڵێ: زۆر جار ئەم پرسیارە لە نووسەران دەکرێ، زۆر جار نووسەر خۆی لە خۆی دەکات، بۆ من دەنووسم؟ بۆ بووم بە نووسەر؟ بۆ نەبووم بە دوکتۆری دان؟ بۆ نەبووم بە پارێزەر؟ بۆ نەبووم بە بازرگانی چەک یان هەچ پیشەیەکی تر؟ من ناتوانم لەجیاتی هەموو نووسەران قسە بکەم، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە، ئەوەیە کە من هیچ هەڵبژاردنێکی ترم نەبوو. هیچ شتێکی تر نازانم. نووسین ئەوەیە کە دەیکەم و ئەوەیە کە خەریکیم. من لەم بواری ئیشەدام تا بگێڕمەوە. من هەمیشە وا بووم. هەمیشە وا دەبم. هەتا کاتێ منداڵیش بووم، هەر حەزم لە گێڕانەوە بوو، حەزم لە ڕێکخستنی حیکایەت بوو، ژیان بە کاراکتەرەکانم ببەخشم. ڕووداو دروست بکەم، ژیان بکەم بە وشە و بیگێڕمەوە. هەموو ئەمەش بگۆڕمەوە بە کەمێک پارە، یان بە زەردەخەنەیەک یان فرمێسکێکی خوێنەر. من دەنووسم تا نانی ژیانم پەیدا بکەم. من دونیا دەکەم بە گێڕانەوە تا خۆم بژێنم. من بۆ گەنجانم زۆر نووسیوە، سیناریۆی فیلمم بۆ گەورەکان زۆر نووسیوە، بەڵام لە هەموویان زیاتر بۆ کەسانێک دەنووسم کە حەزیان لە خوێندنەوەیە، کە قووڵ دەبنەوە لەناو ڕووداوێکدا، من بۆ خۆم نانووسم، بەڵکو بۆ ئەوانی تر دەنووسم، بۆ مرۆڤێک کە بە ڕاستی خوێنەرە. من تەنها نووسەر نیم، بەڵکو خوێنەریشم، بۆیە من دەمەوێ ئەو کتێبانە بنووسم کە حەز بکەم بیانخوێنمەوە. دوا ڕۆمانی ئەم نووسەرە تا ئەم ساتە بە ناوی( یاری فریشتە)، ساڵی ٢٠٠٨ نووسیویەتی، کەمێک لەم ڕۆمانەی تری زەحمەتترە، پاڵەوانی ڕۆمانەکە، نووسەرێکی گەنجە بە ناوی داڤید مارتین، کە لە ڕۆژنامەیەکدا کار دەکات و خانوویەک لە شوێنێکی زۆر سەیردا وەک بوورجێکی بەرز بەکرێ دەگرێ. ژیانی ئەم گەنجە لەناو ئیش و نەخۆشیی شێرپەنجە و دڵدارییەکی ناکامدا دەگوزەرێ، تا ڕۆژێک یەکێکی لێ پەیدا دەبێ و داوایەکی زۆر سەیری لێ دەکات، داوای ئەوەی کتێبێکی بۆ بنووسێت و لە پاداشتی ئەوە پارەیەکی خەیاڵیی پێ دەدا و زۆر شتی تریش، بە جۆرێک کە داڤید زۆر بە ئاسانیی ناتوانێ بڵێ نا. هەتا کتێبەکە زیاتر بخوێنیتەوە، زیاتر لەناو

ئەو پرسیارەدا ون دەبی کە ئایا ئەم پیاوەی ئەم داوا سەیرەی لێ کردووە، فریشتەیە یا شەیتان؟ دەیەوێ یارمەتی بدات یان پاشقولی لێ بگرێت؟ بەو وەڵامە ناگەیت تا دووا لاپەڕە نەخوێنیتەوە، بەڵام تا دەگەیتە ئەوێ بە شوێنی وادا دەتبا کە خۆشت نازانی لە کویایت، پڕ بەدڵ حەز دەکەیت یارمەتی داڤید بدەیت و ناتوانی، بە ناچاری تەنها ئەوەی لە دەست تۆ دێت وەک خوێنەرێک ئەوەیە کە ئەم کتێبە ئەستووورە دانەنێی تا تەواو دەبێ. ئەمەی خوارەوەش ئەو چاوپێکەوتنەیە کە نووسەر و خاوەن پرۆگرامی تایبەتیی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ پاوڵ بلێزارد لەگەڵ کارلۆس زافۆندا ئەنجامی داوە، ئەم پیاوە لە ماوەی چوار ساڵدا لەگەڵ زیاد لە هەزار نووسەردا چاوپێکەوتنی کردووە و کەسێکی هەتا بڵێی شارەزایە لە کارەکەی خۆیدا و یەکێکە لە خوێنەرە جدییەکان، هەروەک خۆی دەڵێ کە ٤٢ ساڵی ویستووە تا توانیوێتی لە کارەکەی خۆیدا سەرکەوتن بەدەست بێنێ.

– لەبارەی ڕۆمانەکەتەوە (سێبەری ڕەشەبا)، بۆچی ٤ کتێبی ویست تا توانیت یەکەم ڕۆمانت بنووسیت؟

* کارلۆس زافۆن: من ماوەی ١٠ ساڵ ڕۆمانم نووسی کە بۆ گەنجان زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام بۆ ئەم ڕۆمانە ویستم شتێکی تایبەت بخوڵقێنم، شتێک هەمیشە دەمویست لەناو یەک کتێبدا کۆیبکەمەوە، ئەوەی من کردم ئەوە بوو کە گرنگ بوو بۆ من هەمووو جوانیی و حەز و ویستیی سەدەی هەژدەی ڕۆماننووسەکان بێنمەوە، هەر لە تۆلستۆیەوە، هەر لە دیکنزەوە، لە ویلکی کۆلێنتسەوە، بەڵام بە جۆرێک هەوڵ بدەم کە جارێکی تر ئەمانە بەو هەمووو توخمی گێڕانەوانەی هەیانە تا سەدەی بیستیش بە ئێمەیان داوە، نەک تەنیا ئەوە بەڵکو ڕێزمانی فیلم، مولتیمێدیا تا جوانیی گشتیی ئەدەب و هەمووو ئەو شتانەی تریش کە لە دەرەوەی ئەدەب هەن تا بۆ چێژی خوێندنەوە حاڵەتێکی چڕتر بخوڵقێنێت، ئیدی بیرکردنەوەکەم ئاوا بوو تا توانیم سێبەری ڕەشەبا دروست بکەم. ئا بەم جۆرە سێبەری ڕەشەبا ڕۆمانێکە لە چەند ڕۆمانێک، گێڕانەوەیەکە پێکهاتووە لە چەندەها گێڕانەوە. گێڕانەوەیەکە پابەندی تەنز، پابەندی نادیاریی، پابەندی مێژوویەکی خۆشەویستی، پابەندی ڕۆمانی مێژوویی، پابەندی زۆر تۆخمی جیاواز، تا توخمێکی تازەم لێ دروست کردووە. وەک تێکەڵییەک کە هەمووو ئەمانەی تیا کۆبۆتەوە.

– بەس ئەوە بە خوێنەر بڵێ کە چی لەم کتێبە چاوەڕوان دەکەن، بە کورتی بۆمان بگێڕەوە؟

* کارلۆس زافۆن: بەسەرهاتەکە لە بەرشلۆنەی ساڵی ١٩٤٥ وە دەست پێ دەکات. کاتێ منداڵێک تەمەنی ١١ ساڵە بەیانییەک لەخەو هەڵدەستێت و سیمای دایکی لەیاد نەماوە. ئەو بەیانییە باوکی، کە کتێب فرۆشێکی کۆن بوو، منداڵەکەی دەبات بۆ شوێنێکی زۆر نهێنی و نادیار، کە وەک گۆڕستانێک وایە بۆ کتێبە ون بووەکان، ئەم شوێنە وەک کتێبخانەیەکی سیحریی لە شوێنێکی کۆنی بەرشلۆنەدا شاردراوەتەوە، وە ئەمەش ئەو شوێنەیە کە ئەو کتێبانەی لەبیرکراون، ئەو تایتڵانەی کە ون بوون لێرەدا حەشاردراون، شتەکەش وایە وەک هاودەمییەکی نهێنی لەو کەسەوە کە ئەو کتێبخانەیە دەبات بەڕێوە بۆ ئەو کەسانەی کتێب دەخوێننەوە، بۆ ئەو کەسانەی ئەم شوێنە دەپارێزن، ئەوەش بەو شێوەیەی کە ئەوەی هاتە ئەم شوێنەوە، بۆی هەیە کتێبێک لەگەڵ خۆیدا

بەرێتە دەرەوە، تا هەموو ژیانی پارێزگاری کتێبەکە بکات تا لەناونەچێ و بیکاتە باشترین هاوڕێی خۆی. دوای ئەوە منداڵەکە کە ناوی (دانێل)ە کتێبێک هەڵدەبژێرێت بە ناونیشانی ( سێبەری ڕەشەبا)، هەر ئەو شەوە کتێبەکە دەخوێنێتەوە و زۆر پێی سەرسام دەبێ. چونکە لە ژیانیدا شتی وا بەهێزی نەخوێندۆتەوە، کاراکتەری وا، ژیانیان، وێنەکان تا ئاستێکی ناکۆتا سەرسامی دەکەن. بۆیە حەز دەکات بزانێت ئەم نووسەرە کێیەو چی بەسەر ئەم کتێبەدا هاتووە. ئەوەشی دەیزانێ ئەوەیە کە نووسەری ئەو کتێبە ناوی( جولیان کاراکس)ە، زۆر نەناسراوە، کەس نازانێ چی بەسەر هاتووە. لەوەش دەچێ هەر لەیەکەم ڕۆژەکانی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا لە بارودۆخێکی زۆر نادیاردا کوژرابێت. ئەوەش تەنها سەرەتایەکە بە گەیشتن بە نادیارییەک، چونکە دەردەکەوێ کەسێکی زۆر تاریک، فیگورێکی زۆر نادیار لەم دونیایەدا ڕادەکات و بەدوای کتێبەکانی جولیان کاراکسدا دەگەڕێ بۆ ئەوەی بیانسووتێنێ و لەناویان ببات، ناوی ئەم کاراکتەرەش ( لان کوبیریت)ە، کە دانێل دەزانێ ئەم ناوە ناوی کەسێکە لە ڕۆمانەکەوە هاتووە و ناوی کەسێکە بۆ شەیتان بەکاردێت، جا لەم خاڵەوە خاڵی دەسپێکە، چیرۆکێکی دوور و درێژ بە کاراکتەری زۆرەوە بۆ ماوەی پێنج دەهە ( ٥٠ ساڵێک) درێژدەبێتەوە، بە جۆرێک ڕێکخراوە، وەک بووکە شووشە ڕووسییەکان کە لەناو یەکدان( بەرووسی ناویان ماترووشکە، وەرگێڕ)، هەر نادیارییەک دەمانباتە سەر نادیارییەکی تر، هەچ نیشانەیەک دەمانباتە سەر کاراکتەرێکی تر، جا ئەم هەموو کلێسا بەرز و گەورانەی وشەو داستان، هەموو ئەم ژیانە، وەک چەند تونێلێکی پێچاوپێچی چوون بەناو یەکدا، تا هەموو نهێنییەکان و ڕووداوەکان ئاشکرا دەبن و لەدواییدا دەبن بە یەک، کاتێ هەموو کتێبەکە سەرلەبەری دەخوێنیتەوە هەروەک سێبەری ڕەشەبایەک، کە هەمان ئەو کتێبەیە ئێمەش دەیخوێنینەوە و دەبێ بە یەک لەگەڵ هەموو نادیارییەکانیدا دەیکاتە ئەزموونێکی میتاخەیاڵیی.

- بێگومان زۆر غەریب نییە کە تا ئێستا ئاوا سەرکەوتوو بووە، تکایە کارلۆس! تێمبگەیەنە بۆچی چوار کتێبی یەکەمت تەنها بۆ گەنجان نووسی و لەم کتێبەشەوە ویستت دەست پێ بکەیت بۆ گەورەکان بنووسیت؟

* کارلۆس زافۆن: لە ڕاستیدا یەکەم ڕۆمانی من، ڕۆمانێکی پڕ نهێنیی و پڕ ڕووداوە، خەڵاتێکی زۆر گرنگی لە ئیسپانیا بردەوە کە بۆ نووسەرە گەنجەکان بوو، هەر لەبەر ئەوەش بووە کتێبێکی زۆر سەرکەوتوو بۆم، کە تا ئێستا وەک شتێ لە زۆربەی قوتابخانەکانی لە ئاستی ئامادەییدا لە ئیسپانیادا دەخوێندرێ، بۆیە لەوێوە هەست دەکەم کە من خۆم یەکەم قوربانی سەرکەوتنەکەی خۆم بووم لە نووسیندا بۆ گەنجان، کە ئەوەش قەت ئەوە نەبوو کە من دەمویست، من قەت نەمدەویست لەو جۆرە ئەدەبە بنووسم، بەڵام لەوەدا سەرکەوتوو بووم و ناوبانگی بۆ پەیدا کردم، بۆیە بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ من وەک وانەیەکی بەسوود وا بوو، کە وای کرد من بتوانم وەک لابوورێک کۆمەڵێک ژانر، کۆمەڵێک تەکنیک لە یەک شتدا کۆبکەمەوە، تا ئامادەی کردم بۆ نووسینی کتێبێک، کە لە هەموو ژیانمدا حەزم کرد بینووسم، لە کۆتایدا بوو بە سێبەری ڕەشەبا. بەو جۆرە دوای دە ساڵ، لە تاقیکردنەوەی نووسینی ڕۆمان بۆ گەنجان، کە وەک وتم سەرکەوتنێک بوو بۆ من، وای کرد

بتوانم زۆر شتی تازە تاقی بکەمەوە، دەتوانم بڵێم لە کۆتایدا هەمووی هاتە ناو سێبەری ڕەشەباوە، کە دەتوانم بەیەکەم ڕۆمانی خۆم لەقەڵەم بدەم، هەرچەندە پێنجەمیشە.

– بێگومان تۆ بە هەستێکی گەرمەوە باسی ڕۆمانەکەت دەکەی، دوو جۆر پاڵپێوەنان هەیە بۆ نووسین، یەکەمیان لەوەوە دەنووسی کە دەیزانی، دووەمیان لەوەوە کە حەزی پێ دەکەی و خۆشت دەوێ. ئەی لەبارەی سێبەری ڕەشەباوە چی دەڵێی؟ ئایا لەوەوە نووسیت کە دەتزانی؟ یان لەوەوە کە خۆشت ویست؟

* کارلۆس زافۆن: وا هەست دەکەم لە هەردووکیانەوە، وا هەست دەکەم کە هەموو نووسەرێک گەر لە دڵەوە بنووسێت، ئەمەش بێگومان لای من تاقە ڕێگایەکی نووسینە. گەر وا نەبێ دەبێتە بێمێشکترین داگیرکردن بۆ دونیا، گەر ئەو شتەی تۆ دەیکەی بە خۆشەویستییەوە نەیکەی، هەست نەکەی کە ئەمە گرنگە بۆ تۆ. من هەست دەکەم کە تۆ کاتێ دەنووسی، هەمیشە لەبارەی خۆتەوە دەنووسی، چونکە هەمیشە دەتەوێ ئەو ژیانەی لە ناختایە و دەبێ بە دوایدا بگەڕێی و ئەزموونی بکەیت و دوایش بەهۆیەوە لەگەڵ خوێنەرەکانتا قسە بکەی، بۆیە بەو شێوەیە، سێبەری ڕەشەبا هەمیشە لە منەوە دێت و لەناو ئەزموونەکانی منەوە دێتە دەرەوە. نەک بە تەنها ئەوە، بەڵکو دیسان لە ئەدەبی جیهانیشەوە هات، لەناو ڕۆمانە گەورەکانەوە، لەناو گێڕانەوە گەورەکانەوە وەک توخمێک لەوان، چونکە رۆمان لەدوا جاردا وەک نامەیەکی دڵدارییی وایە بۆ خوێنەرەکانی، بۆ ڕۆمانە گەورەکان، بۆ حیکایەتە گەورەکان، کە ئەمانە هەموویان بەیەک دەگەیێنێ، چونکە من تەنها نووسەریش نیم، بەڵکو خوێنەریشم، بۆیە من دەمەوێ ئەو کتێبانە بنووسم کە حەز بکەم بیانخوێنمەوە.

– کەواتە ئەم کتێبەت پێزانین و یادکردنەوەیەکی کارلۆس زافۆنە بۆ نووسەرە گەورەکان لە مێژووی خۆتدا، بۆ خوێندنەوەیەکی خۆت بۆ ڕابردوو، پێش ئەوەی دیدارەکە تەواو بکەین، حەز دەکەم پرسیاری ئەوە بکەم کە تۆ بەهرەی تریشت هەیە، ئەویش مۆسیقایە، ئایا ئەم خولیایە لەکوێوە دێ؟

کارلۆس زافۆن: لە ڕاستیدا من چەند ئەدەبم خۆش دەوێ، ئەوەندەش مۆسیقام خۆش دەوێ. وە چەند ساڵێک پێش ئیستا، پێش ئەوەی ببم بە نووسەرو هەموو کاتم بۆ نووسین تەرخان بکەم، وەک مۆسیقارێک کارم دەکرد و هەندێ ئیشیشم بۆ تەلەفزیۆن کرد، هەندێ ئامادەکاری، کەیبوردیشم لێ دەدا، ئەمانە ئێستا وەک شتێ لە ژیانی ڕابردوومدا ون بووە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا من ئیستاش عەشقم بۆ مۆسیقا هەیە، لەو کاتانەی لە کۆمپیوتەرەکەم، لە خوێندنەوەی کتێبەکان، ڕۆمانەکان دوور دەکەومەوە، دەچم هەندێ پارچە مۆسیقا دەنووسم، تەنها بۆ خۆم، تەنها بۆ هاوڕێکانم، وە ئێستا زۆر بەوە بەختەوەرم کە ئەمە لەگەڵ خوێنەرەکانمدا بەش دەکەم، وەک چوونە ژورەوەیەک بۆ ناو دونیایەکی نادیاریی ڕۆمانەکانم.

## سەرچاوە:

Carlos Zafon website

MY HEART BELONGS TO DADDY

بەشی چوارەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا



# دڵی من هی باوکمە

نینار ئەسبەر
لە سویدییەوە: هیوا قادر

## لیمۆیەکی مەحرەم

نینار: هەر لەبەر ئەوەی کە من تۆ ناخوێنمەوە، ئیتر پێتوایە من لە تۆ ناگەم و ناتوانم بەشێک لە شیعرەکانی تۆم خۆشبوێت؟ ڕەنگە شیعرەکانی تۆ حاڵەتێکی ڕۆحی بن، جۆرێکبن گیرۆدەت بکەن.

ئەدۆنیس: ئەم پرسیارە ئەبوو من لە تۆم بکردایە! ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی تۆ ئەکرێتەوە نەک من! (پێئەکەنێت)

نینار: (پێئەکەنێت) بەڵێ وایە!

ئەدۆنیس: نۆش، بەخۆشیت «زرەی پێکە شەرابەکان دێت»، ئایە ئەمە بەشێکی تازەیە و بەم پرسیارە دەست پێئەکات؟

نیندار: بەڵێ.

ئەدۆنیس: با وازبێنین..

نیندار: بەڕاست وازبێنین؟ نا، وازم لێ بێنە با کەمێکی تریش زۆرت بۆ بێنم..

ئەدۆنیس: سەعات هەشت و نیوە!



نیندار: ئۆکەی، کەوایە تا سەعات نۆ بەردەوام ئەبین.

ئەدۆنیس: (پێئەکەنێت)

نیندار: با خۆمان کۆکەینەوە. بێ لەوەش من لە دۆخێکی شیعری وەک ئەوەی تۆدا نەژیاوم. بەڵام سەربری ئەوەش ئەزانم کە تۆ کەسێکی تایبەتیت و مەملەکەتێکی تایبەت بە خۆت هەیە، شێوازێکت هەیە کە کردوویتی بە کەسێکی زۆر تایبەت: کەسێکی بەدیقەت و وردکار و زۆر هەستیار. من لە هەموو ئەمانە ئەگەم.

ئەدۆنیس: باشە، ڕەنگە ئەمەندەش بەسبێت... وانییە؟

نیندار: ئەوەی کە بۆ من زەحمەت دێتە دەست خودی شیعرەکانە ـ وەک تێکست، وەک پێکهاتە. بێ لەو ڕیتمانەی کە هەیانە. ئەوەی کە پێموایە ئەیناسم ئەبوو وەکو خۆت وابوایە و لە تۆ بچووایە. ئەبوو لە ڕیتمی جەستەی خۆت بچوایە، لە ریتمی جەستەی خۆت بچوایە لە ژیاندا کاتێک ئەڕۆیت بەڕێدا، کاتێک کە تورەئەبیت، نان ئەخۆیت، شۆخی ئەکەیت. یاخود بەتایبەتی کاتێک عەشقێکی جەستەییانە ئەکەیت. گەرچی من سەبارەت بەمەیان هیچ نازانم! (پێئەکەنێت) من دڵنیام کە شیعرەکانیشت بۆخۆیان دۆستایەتیەکیان لەگەڵ جەستەتدا

هەیە، لەگەڵ ئەو لەزەتبردن و خۆشی و ئازارانەتدا. بەڵام من لەم لایەنەوە هیچم بۆ ناکرێت.

دواتر...

نینار: پێتوایە باوکانی ناو خێزانە باوەکان کە مێرد بۆ کچەکانیان هەڵئەبژێرن - زۆرینەی کاتیش ئەو کەسانە هاوڕێیانی باوکەکان خۆیانن! - ئایە ئەمە پێشکەشکردنی ئەو کچانە نییە بە ئەوان؟ یاخود من کەسێکی لادەرم لە ڕووی جنسییەوە؟ یان بەهەرحاڵێک ئەمە شتێکە و من ناتوانم تێیبگەم!

ئەدۆنیس: ئەمەی تۆ ئەیڵێیت زۆر سایکۆلۆژیانەیە، زۆر فرۆیدیانەیە، من نازانم... ئەمە پەیوەندی بەو باوکانە خۆیانەوە هەیە کە چۆنن. بەشبەحاڵی خۆم هەمیشە وتومە من لایەنگری فرۆید نیم، بەتایبەتیش لەم خاڵەدا.

نینار: بەڕاست؟

ئەدۆنیس: من بەشێوەیەکی گشتی لایەنگری خوێندنەوەی دەروونی نیم. چونکە پێموایە دەروونناسی زۆر زێدەڕۆیی و هەڵەڕەویی لەگەڵ خۆیدا هێنا. مەبەستم ئەوەیە بڵێم لەم لایەنەوە هەوڵی ئەوە درا ئینسان بە جۆرێک بخوێندرێتەوە، کە کەسێکی ئاڵۆز و فرەڕووە، وە تەنها گرنگی بە تەنها لایەنێکی ئینسان درا کە ئەویش لاموبالاتی و هەڵەشەییەتی. ئینسانێک، گرنگ نییە هەرچ کەس بێت، تێکەڵەیەکە، لە تێگەیشتنێکی زۆری تێکچڕژاو لە هەست و خەون. بە کەمگرتنی ئەم ئینسانە و دانانی لەبەردەم تەنها دیدێکدا: بڵێی ئەمە سەرجەم ئەم ئینسانەیە، ئەمە بۆخۆی بەسەرداسەپاندن و زۆرلێکردنە. من دژی ئەم شێوازەم بۆ تێگەیشتن لە ئینسان.

نینار: ئەی لاکان؟

ئەدۆنیس: لاکان لەوێوە دەستیپێکرد کە فرۆید تەواو بووبوو. بەشێوەیەکی گشتی ئەو سەرکەوتنەی ئەو بەدەستی هێنا ناویلێنا «گەڕانەوە بۆ فرۆید».بەڵام ناکرێت تۆ خوێندنەوە تەنها لەو ڕووەوە بۆ ئینسان بکەیت کە فرۆید کردی، چونکە ئەمە بەکەمبینینێکی ترسناکە بۆ ئینسان. ئینسان تا ئەو ڕادەیە ئاڵۆزە! دیارە ئەکرێت بە دیوێکدا بەشێکی ئەو خوێندنەوانە ڕاستبن، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان جۆرێک یارمەتیدەربن. هەندێک لە ئینسانەکان هەندێک جار پێویستیان بەوەیە لەگەڵ کەسێک قسەبکەن و گوێیان لێبگیرێت و کەشوهەوایەکی ئارامیان بۆ بسازێندرێت، بەڵام زەحمەتە تەنها هەر بەمە چاک ببنەوە.

نینار: ئەوەی کە توێژینەوە ئەکات کەسێک نییە چارەسەربکات. ئینسان خۆی ئەبێت چارەی خۆی بکات.

ئەدۆنیس: بەڵام ئەو کەسە ئەگەر هاوڕێیەکی هەبێت کە تەواو جێی باوەڕپێبێت ئەتوانێت لەگەڵ ئەودا قسەبکات؟

نینار: نەخێر، ئەمە وەکو یەک نییە . هەموو کەس وەکو یەک نییە، هاوڕێیەک ناتوانێت «بێلایەن» بێت و مەودایەک لەنێوان شتەکاندا دابنێت.

ئەدۆنیس: ئاوها، بەڵام ئەی ئەگەر زۆر نزیکی یەکتربن؟

نیدار: بەهیچ شێوەیەک! هاوڕێ بەهیچ شێوەیەک بێ لایەن نابێت. هاوڕێ ڕێنمایی ئەکات یاخود قسەکانی لەگەڵ قەناعەتەکانی خۆیدا تێکەڵ ئەکات، بەو شێوەیەی کە خۆی لە ژیان تێگەیشتووە و باوەڕی پێی هەیە. بەڵام توێژەرەوەیەکی دەروونی مەودایەک لەگەڵ کەسە بیمارەکەدا دائەنێت. ئەو هیچ ڕێنومایییەک نادات، هەروەها هیچ بۆچونێکی ئەخلاقی و دینی ناخاتەڕوو. بۆ نموونە گەر تۆ حەزت بەوە نەبێت منداڵت ببێت، یاخود بوویت بە هۆمۆسێکسوێل، ئەوا هاوڕێکەت پێت ئەڵێت: «شتێکی ئاسایی نییە کە تۆ منداڵت ناوێت» یاخود ئەڵێت «هۆمۆسێکسوێلی دژ بە لایەنی دینییە»، یاخود هەرچ شتێکی بێ عەقڵانەی تر کە بەخەیاڵیدا بێت پێت بڵێت. ڕەنگە تۆ کەسێکی بێچارە و تەنهابیت و گەر کەسێک لەو حاڵەتەدا شتێکی ئاوات پێبڵێت، ڕەنگە تۆ بەیەکجاری بڕوخێیت و زیاتر هەست بە دوورەپەرێزیی بکەیت. ئەم حاڵەتە ڕەنگە بگاتە ئەوەی کە ئەو کەسە خۆی بکوژێت.

مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە ڕۆڵی توێژەرێکی دەروونی ئەوەیە کە مەودایەکی باوەڕپێکراو لەنێوان دین و ئەخلاقدا دابنێت، هەروەها لەهەمان کاتدا وابکات کەسە بیمارەکە بهێنێتەوە ناو واقیع بەبێ ئەوەی تاوانباری بکات. وا لەو کەسە بیمارە بکات بزانێت کە ئەو خۆی چ جۆرە ئینسانێکە، وای لێبکات هەست بە لاوازییەکانی خۆی بکات. بەڵام  ئیتر ئەوە لەسەر کەسە بیمارەکە ئەکەوێت کە چەندە ئەو کارە ئەکات.

من لە ئەزموونی خۆمەوە قسەئەکەم، بەڵام بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانم لە ڕوانگەی تیۆری شیکاری دەروونیی و فرۆیدەوە خۆم بناسێنم. تەنها شتێکی بچکۆلە کە من لە شیکاری دەروونییەوە فێربووم ئەوەبوو فێریکردم تاقیکردنەوەکانی قوتابخانەم تەواوبکەم! بەڵام من ئەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکە، بۆ لای ئەو باوکانەی کە زاوا بۆ کچەکانیان ئەدۆزنەوە: ئەوانەی پیاو لەناو ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەی خۆیانەوە هەڵئەبژێرن، کە هەمان عەقڵییەت و باوەڕی دینیان هەیە وەک خۆیان ـ تەنانەت تا ئەو ڕادەیەی ئەو پیاوانە لەلایەنی جەستەیشەوە ڕێک لە خۆیان ئەچن! من ئەمە بە شتێکی سەیر و سەمەرە ئەبینم، تاڕادەیەک وەک پەیوەندی سێکسی ناو خێزانێک وایە لەگەڵ یەکتریدا. وەک ئەوەی باوکەکە خۆی نەتوانێت لەگەڵ کچەکەی «جوتببێت» ئەگەڕێت بەدوای نومایندەیەکی خۆیدا ئەوە بکات. بۆ من ئەم کارە وەک ئەوە وایە کە ئەو باوکانە لە ڕێی نوێنەرێکی خۆیانەوە کچەکانی خۆیان بخوازن.

ئەدۆنیس: باشە تۆ بۆ ئەم حاڵەتە بە دیوێکی تردا نابینیت؟ ئەگەر زاوای دەستنیشانکراو کەسێکی نزیکی خێزانەکەبێت، مانای ئەوەیە کە باوکەکە لەو ڕێگەیەوە ویستوێتی پەرۆشی خۆی بخاتەڕوو بۆ دروستکردنی ژیانێکی ئارام بۆ کچەکەی، بەمەش زاوای دوارۆژ حورمەتێکی زۆر لە کچەکەی ئەگرێت.

نیدار: نەخێر، لە ڕاستیدا ئەمە ڕاست نییە. ئەکرێت زاوا ببێتە هاوڕێیەکی زۆر باشی باوکەکە، بەڵام ئەشتوانێت ببێتە مێردێکی خراپ بۆ کچەکە تەنانەت ئەگەر هات و لەهەمان خانەوادەشەوە هاتبێت، ببێتە مێردێک کە کچەکەی خۆشنەوێت و ڕەفتاری خراپی لەگەڵدا بکات و چەندان شتی

تر.

ئەدۆنیس: ڕاستە، بەڵام ئەمە کێشەیەکی ترە. ئەمە هیچ پەیوەندی بە جوتبوونی خێزانییەوە نییە..

نینار: ڕەنگە وابێت، بەڵام ئەمە پیشانی ئەدات کە باوکەکە کەسێکی نەکردەیە، بۆ ئەوەی زاوا مێردێکی باش بێت، حورمەتی ژنەکەی بگرێت و خۆشی بوێت، هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە کە ئەبێت زاوا هاوڕێی باوکەکە بێت، ئەی وانییە!

ئەدۆنیس: ئەگەر باوکەکە بەکردەبێت یان نا ئەمەشیان هەر شتێکی ترە. ئەمە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە ئەو شتێک ئەکات کە باوەڕی پێیەتی. لە دێکەی من خەڵکی بە کچەکان ئەڵێن «شوو بە ئامۆزاکەت بکە، باشترە لەوەی شوو بە کەسێکی غەریبە بکەیت». ئەوان شوو بە پیاوانێک ئەکەن بیناسن تا بتوانن دواتر نزیک بە خانەوادەکانیان بژین. تا باوکەکانیش تا ئەوپەڕی توانا هەست بە ئارامی بکەن سەبارەت بە دواڕۆژی کچەکانیان. .

نینار: من پێموایە ئەمە خراپترین شتێکە کە ئەیکەن!

ئەدۆنیس: ئەکرێت وابێت..

نینار: زۆرینەی کات ئەو پیاوانەی ئەیانبینم من بەراوردیان ئەکەم بە تۆ. ئەمەوێت «ئەدۆنیس» لەواندا بدۆزمەوە. گەربێت و تۆ ئافرەتێک ببینیت و حەزت بەوەبێت لەگەڵی ڕابوێریت، یانی سەرکێشییەک پێکەوە بکەن، پێتوانییە بەجۆرێک لە جۆرەکان لەو کاتەدا لە قوڵایی دەروونی خۆتدا بەجدی بەدوای کچێکدا ئەگەڕێیت کە لە من بچێت؟ (زەردە ئەیگرێت)

ئەدۆنیس: (سوورهەڵئەگەڕێ، بەزەحمەت هەناسە ئەدات و ئەداتە قاقای پێکەنین) ڕەنگە وابێت! وایە، لەڕاستیدا ڕەنگە بەو جۆرەبێت کە تۆ ئەیڵێیت.

نینار: چۆن؟

ئەدۆنیس: ڕەنگە وابێت، بەڵام ئەگەر واشبێت پێموانییە مانای ئەوەبێت کە ئەمە جوتبوونە لەگەڵ ئەندامانی خێزانی خۆتدا.

نینار: من پێموایە ئەمە جوتبوونێکە لەگەڵ ئەندامانی خێزانی خۆتدا.

ئەدۆنیس: بەتەمام بەو زووانە ئەمە لە ژێر چەمکی لەیەکچوون ویەکتر تەواوکردندا ڕوونبکەمەوە. ئەم دووانە هەردووکیان پێکەوە یەک شت ئەکەن. بەڵام هەروەها ئەشکرێت ئەو عەشقەی کەهەیە ئەو کارە بکات. من خۆمم خۆشئەوێت و ئەوانەشم خۆشئەوێت کە لە من ئەچن، لەهەرحاڵێکدا بێت ئەوان هیچ پەیوەندییەکیان بە مەسەلەی سێکسی ناو خێزانییەوە نییە.

نینار: بەڵام ئینسان ئەتوانێت کەسێکی خۆشبوێت کە زۆر جیاوازبێت. بۆ پێویست ئەکات هەمیشە ئینسان کەسێکی خۆشبوێت کە لە خۆی بچێت؟ بۆچی ئەبێت تەنها کەسێکت خۆشبوێت کە لە ڕووی جەستەییەوە لە خۆت بچێت؟

ئەدۆنیس: من هەرگیز پێم لەسەر ئەمە دانەگرتووە. من تەنها باسی حاڵەتی ئەم جۆرە بیروبۆچوونەم کردووە کە ئینسان کەسێکی خۆشئەوێت وەک خۆی بێت.

نیدار: لەمەدا تۆزێک واوەتر چوویت.

ئەدۆنیس: (بێدەنگ ئەبێت).

نیدار: لە چ کاتێکی تایبەتدا ڕێ بەخۆت ئەدەیت بیر لە من بکەیتەوە؟

ئەدۆنیس: (پێئەکەنێت) ئێنسان ئەبێت ئەم دوو ئاستە جیابکاتەوە. لەیەکەمیاندا بە هیچ شێوەیەک من بیر لە تۆ ناکەمەوە، بەڵکە تۆ وەک هەوا لە منداویت و هەڵتئەمژم و وەک خۆرێک ئەتبینم ـ تۆ بەشێکی گرنگی ژیانی منیت. لە ئاستی دووهەمدا ئاوایە کاتێک کە تۆ وەک بەشە گرنگەکەی ژیانی خۆم ئەبینم وەک ئەوەی کە هەیت، دیقەت ئەدەم تۆ چ گەشانەوەیەکی گەورەت تیاهەیە و ئەزانم کە تۆ چەندە بەهرەمەندیت، بەڵام هێشتاش هەر تەممەڵیت، ئەو کات تێئەگەم کە تۆ ئەتوانیت چەندە داهێنەربیت. من بەم جۆرە بیر لە تۆ ئەکەمەوە، بەهەمان شێوەش بیر لە ئەروارد ئەکەمەوە.

نیدار: بەڵام ئەمە ئەو شتە نییە کە باسی ئەکەین.

ئەدۆنیس: ئەی کەوایە چییە؟

نیدار: باوکێک شتێکی تر لە کچەکەیدا، یان لە کچەکانیدا نابینێت؟

ئەدۆنیس: کاتێک خەڵکی ئەڵێن کچەکانم جوان و ڕۆشنبیرن و ئەم جۆرە شتانە. زۆر شانازی ئەکەم و ڕازیم.

نیدار: ئا، بە خۆتا هەڵبە.

ئەدۆنیس: ئەمە دڵخۆشم ئەکات.

نیدار: بێگومان.

ئەدۆنیس: من بیر لەو بەرپرسیارێتیەی ئینسان ئەکەمەوە کاتێک کە شتێکی هەیە و ئەیەوێت بیڵێت، کاتێک داهێنان وەک پێویستییەک ئەبینێت. لە خۆم ئەپرسم ئەبێت کچەکانم چۆن لەم بەرپرسیارێتییە گەیشتبن، چۆن ڕەفتار لەگەڵ ئەم بەرپرسیاریەتییەدا ئەکەن، چۆن لەگەڵی ئەژین و قوڵتر بیری لێ ئەکەنەوە ـ بەو جۆرەی کە ئەبوو من بمکردایە.

نیدار: بێگومان، بەڵام ئەمە ئەوە نەبوو کە من پرسیارم لەسەر کردبوو. من ئەمەوێ حەقیقەتی بە باوک بوونی تۆ بزانم، یان ئەوەی کە ئێستا باوکیت، بەوجۆرەی کە تۆ ئۆتۆماتیکی خۆت ئامادەکرد و فلتەرێکت لە چاوت بەست کە نەهێڵێت کچەکەت وەک ژنێک ببینیت، کە چۆن لەبەرامبەرتدا بەتەنورەیەکی کورتەوە دائەنیشێت، بە ڕانێکی جوان و پێڵاوی پاژنەبەرزەوە. تۆ بیر لەوە ناکەیتەوە بڵێیت: ڕانێکی جوانی هەیە، یاخود شتێکی لەو جۆرە بڵێیت؟ بەڕاستی بیر لە چی ئەکەیتەوە؟

ئەدۆنیس: نەخێر، من بیر لەو شتانە ناکەمەوە.

نیدار: بۆچی نا؟

ئەدۆنیس: چونکە من چیتر لەناو چیرۆکی ئافرەتاندا نەماوم.

نیدار: زیاتر ڕوونیبکەرەوە، چونکە تێناگەم. ئەمەوێت لەمە تێبگەم کە ئایا باوکەکان فلتەرێکی بایۆلۆژیان هەیە. ئەمەوێت لەوە تێبگەم کە باوکێک بۆ چی تەنها لەبەر ئەوەی باوکە ئیتر جەستەی

کچەکەی وەک جەستەی ئافرەتێک کە هەیە نابینێت. ئایا هیچ کات وێنەیەکی سێکسی بە خەیاڵدا نایەت؟ ئەمەوێت بزانم کە چی لەناو سەری باوکەکاندا ئەگوزەرێت! تۆ پێتوایە زەحمەتبێت بۆ باوکێک کە کچەکەی وەک کەسێکی تر ببینێت نەک تەنها وەک «کچەکەم»، وەک هەر ئافرەتێکی تر ببینێت؟

ئەدۆنیس: مەبەستت وەک جەستەیە؟

نینار: بەڵێ، وەک جەستەیەک ببینێت!

ئەدۆنیس: بەڵام خۆ جوانی بەشێکە لە جەستە، وانییە؟

نینار: وایە، بەڵام چ «بەشێک»ت مەبەستە؟

ئەدۆنیس: من حەزئەکەم کە تۆ زۆر ئاگات لە جەستەی خۆتبێت، هەمیشە جوان بیت و هەرگیزیش ڕقت لەجەستەی خۆت نەبێتەوە. نەیدەیت بە هەرچ کەسێک کە هاتەڕێت، بەڵکە جەستەت بە کەسێک بدەیت کە شایستەییبێت. ئەمە ئەو شتانەیە کە زۆر جار بیری لێ ئەکەمەوە. خەمبار ئەبم گەر بزانم کچەکەم شەوێک یان زیاتری لەگەڵ کەسێک بردۆتە سەر کە شایستەی ئەو نییە، لە ئاستی تۆدا نییە. بەپێچەوانەشەوە زۆر دڵخۆش ئەبم کاتێک کوڕێکی هاویار و ڕۆشنبیر لەگەڵ کچەکەمدا ببینم. خەمبار ئەبم کاتێک کچە «بەهرەمەندەکانم» لەوە تێنەگەن کە ئەوان چەندە بەهرەمەندن. کاتێک قیمەتی تەواوەتی نەدەن بە جەستە و کەسایەتی خۆیان.

نینار: دڵت نەلەرزێت! کچەکانت ئەو کێشانەیان نییە!

(دواتر)

نینار: پێتوایە باوکەکان فلتەرێک لەسەر چاویانە کە وائەکات کچەکانیان نەبینن بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە بە شێوەیەکی سێکسی خۆیان ئەگۆڕن و ئەچن بۆ لای هاوڕێکانیان؟ کاتێکیش باوکێک بەسەر کچەکەیدا ئەنەڕەنێت و فەرمانی پێئەکات بچێت جلەکانی بگۆڕێت، بۆ نمونە لەبەرئەوەی کچەکەی وەک سۆزانییەک خۆی گۆڕیوە، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئەو باوکەکە لەوکاتەدا ئەو هەستەی هەبووە لە بەرامبەر کچەکەیدا؟ وەک ئەوەی لەویادا بە خۆی وتبێت «منێک کە باوکم ئاوا ئەیبینم، ئەبێت پیاوەکانی تر چۆن ببینن»؟ نازانم ئەگەر زیادەڕۆیم نەکردبێت لەم بۆچوونەمدا.

ئەدۆنیس: من هەرگیز شتی واناڵێم. ڕەنگە ڕوویدابێت هێمام بۆ جلێک کردبێت کە لێتنەهاتبێت و جوان نەبووبێت! (زەردەئەیگرێت)

نینار: بەڵام تۆ پێتوانییە گەر باوکێک بەو شێوەیە ڕەفتار بکات هۆی ئەوەیە کە ئەزانێت کچەکەی بۆ ئاوا خۆی نیشان ئەدات ـ بەتایبەتیش کاتێک جلوبەرگێکی سێکسی پۆشیبێت؟

ئەدۆنیس: ڕەنگە باوکی واهەبێت، بەڵام من وانیم. کاتێک تۆ ببینم ئەچیتە دەرەوە حەزئەکەم هەردەم بە جلوبەرگێکی کیبارانەوە بتبینم، ئەی وانییە! (پێئەکەنێت)

نینار: ئۆکەی، کەوایە تێگەیشتم! (پێئەکەنێت)

باشە باوکێک چی ئەکات کاتێک ئەبینێت کچەکەی گەورەبووە و دەستی کردووە بە چوونەدەرەوە لەگەڵ کوڕاندا، لەکاتێکیشدا هەستبکات کچەکەی سێکسیان لەگەڵدا ئەکات؟ ئەبێ ئەو باوکە چی

بکات بۆ ئەوەی بیر لە جەستەی کچەکەی نەکاتەوە کە ئەو خۆی «دروستی کردووە»، کە ئەو خۆی نازی هەڵگرتووە، لەبەرچاوی ئەودا گەورەبووە، کردوێتییە باوەشی ـ کەچی ئێستا لە باوەشی پیاوێکی تردایە؟ ئەگەر باوکێک بۆ نموونە سەیری سمتی کچەکەی بکات (وەک سمتی ژنێک) ئایە ئەو باوکە نایهێنێتە بەرچاوی خۆی کە خۆشەویستەکەی چۆن ئەیگرێت و دەستی پیائەهێنێت؟ هەستئەکەیت ئەمە سروشتییە یان جێی نارەحەتییە؟ پێتوانییە هۆی ئەم هێنانە بەرچاوەبێت کە باوکانی ناو کۆمەڵگا نەریتگەراکان نەیانهێشتووە کچەکانیان زۆر جەستەی خۆیان پیشان بدەن، هەروەها پێش شوونەکردنیان نەچنە دەرەوە و لەگەڵ کوڕاندا نەگەڕێن، تا دڵنیابن لەوەی کچەکانیان کچبوونی خۆیان ئەپارێزن و چەندان شتی تریش؟

ئەدۆنیس: بەهەرحاڵ کوڕەکە...

نیدار: ... ئەها، وەڵامەکەت ئەناسمەوە. لەبەر ئەوەی ئەو «زۆر چاکبوو»!

ئەدۆنیس: بێگومان ئەوە زۆر دڵخۆشم ئەکات، بەڵام ئەو کوڕە ئەبێت هیچبێت کە واملێبکات نارەحەتبم! (پێئەکەنێت)

نیدار: ئەبینیت! ئەمە تەنها لەبەر ئەوەیە کە تۆ خۆت ئەخەیتە جێگای ئەو کوڕە! بێگومان ئەو کوڕە هیچ نەبووە، بەڵکە لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەو وێنەدا نایەتەوە کە لای خۆت هەتە!

ئەدۆنیس: ڕەنگە وابێت، بەڵام ئەوەش ئەزانم کە عەشق ناعەقڵانییە، ئەکرێت ئافرەتێک پیاوێکی بێ عەقڵی وەک کەسێکی عاقڵ خۆشبوێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم بەوە نییە کە عەشق ناعەقڵانیی بێت بەڵکە پێموایە عەشق کوێرە، بەهەرحاڵێک تەمەنائەکەم و هیوام وایە ئەو کەسەی کە کچەکەم هەڵیئەبژێرێت لە ئاستی خۆیدابێت.

نیدار: بەڵام ئێستا ڕاست بڵێ، پێتناخۆش نییە کوڕێک دەستی لەسەر سمتی کچەکەت دابنێ؟ ئەو سمتانەی کە لە تۆوە هاتوون، کاتێک کە منداڵبووم تۆ دەستت پیاهێناون.

ئەدۆنیس: نەخێر بەهیچ شێوەیەک! بە پێچەوانەوە. دڵم خۆشئەبێ کاتێک کچەکەم لەگەڵ کوڕێکدا ببینم کە خۆشیئەوێت.

نیدار: باوکانێکی زۆر هەن تەحەمولی ئەمە ناکەن کە تۆ ئەیکەیت.

ئەدۆنیس: ئەوان بەوە فشار ئەخەنە سەر کچەکانیان.

نیدار: تەنانەت باوکانی وا هەن کە لە کچەکانیان ئەدەن و ژیانیان لێ ئەکەن بەجەهەنم.

ئەدۆنیس: ئەوانە نەخۆشن.

نیدار: هەڵبەت، بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەرەوە کە لێمکردیت: ئایە تۆ پێتوانییە کە پیاو لە کۆمەڵگەی باودا ڕێ بە کچەکانیان نادەن جەستەیان دەرخەن، لەگەڵ کوڕاندا بچنە دەرێ پێش شووکردن و لەدەستدانی کچێتیان، تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەو شتانە ئەهێننە بەرچاوی خۆیان؟

ئەدۆنیس: نەخێر، پێموانییە ئەمەی تۆ ئەیڵێیت پەیوەندی بە داب و نەریتی کۆمەڵگەوە هەبێت. ئەم شتانە لە شوێنی تریش ڕووئەدەن. کچێک کە لە ژیانیدا لەگەڵ چەند پیاوێکدا بووبێت زەحمەتە بتوانێت پیاوێک بدۆزێتەوە و شووی پێبکات. ئەکرێت زۆر پیاو بیانەوێت لەگەڵی بچنە دەرێ، بەڵام

هیچ کام لەوانە ئامادەنین بیهێنن.

نینار: وایە، ئەزانم.

ئەدۆنیس: ئەمە تەنها لەبەر ئەوە نییە ئەو شتانەی ڕوویئەدەن باوکەکان نەیهێننە بەرچاوەی خۆیان، بەڵکە ڕەنگە لەبەرئەوەبێت تا کچەکان خەونی دواڕۆژی خۆیان بەبا نەدەن لەبەر ئەو داوایانەی لێیان ئەکرێت. تۆ خۆت ئەزانی لەکۆمەڵگەی نەریتگەرادا کچێک ناتوانێت هەر خۆی بەتەنها بژی. ئەبێت لەگەڵ کەسێکی تردابێت و پەیوەستبێت بە پیاوێکەوە. لەم کۆمەڵگایانەدا خەڵکی وابیرناکەنەوە کە ئافرەت ئەبێت لە ڕووی ئابوورییەوە ئازادبێت، کە خۆی بەرپرسیاربێت بەرامبەر ئەرکەکانی، بتوانێت تەنها بژی، یاخود خۆی بتوانێت ئەو پیاوە هەڵبژێرێت کە ئەیەوێت شەوێکی لەگەڵدا بباتە سەر. لەبەرئەوەیە ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە وا هەڵسوکەوت لەگەڵ کچەکانیاندا ئەکەن کە بێ ئەزموونن و ناتوانن بڕیار لەسەر ژیانی خۆیان بدەن. ئەم جۆرە تێڕوانینانە وائەکات هەمیشە وەک «ناکامڵێک» سەیری کچەکان بکرێت. تەنها هەلێکی ژیان بۆ ئەوان و تەنها دواڕۆژێکی ئەوانیش، هەر شووکردندایە.

هەروەها لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا کەسێک مەحاڵە کچێک بهێنێت کە پەیوەندی عاشقانە یان سەرکێشی سێکسی لەگەڵ پیاوانی تردا هەبووبێت. من پێموایە کە هۆی سەرەکی ئەوەیە کە وەک سەروەتێک سەیری کچەکانیان ئەکەن نەک وەک بونەوەرێکی ئازاد و سەربەخۆ. لەبەرئەوەیە کە باوکان بێ هیچ ئەملاولایەک توندو تیژن لەگەڵ کچەکانیاندا. ئەوان یەک ئامانجیان هەیە ئەویش شوکردنی کچەکانیانە بەکەسێکی ناسراو و خانەوادەیەکی خانەدان. ئەو باوکانەش بۆ ئەوەی کچەکانیان ئاوا بە شوویدەن ئەبێت کچەکانیان لە ماڵەوە «دەست بەسەرکەن». بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەوان دڵنیاییەکیان تیا دروستئەبێت لە نەدۆڕاندنی کچێنی کچەکانیان!

نینار: ئەی ئەمە مانای ئەوە نییە کە کچەکانیان جۆرێکە لە سەرمایەگوزاری، سەرمایەیەکی قازانج بەخشە؟

ئەدۆنیس: با، بەڵام لەبەرخاتری خۆیان.

نینار: نەخێر! لەبەرخاتری باوکەکان!

ئەدۆنیس: لەبەرخاتری دواڕۆژی کچەکانی خۆیان.

نینار: با، بەڵام لەبەر ئەوەیە کە دواڕۆژی ئەوان چاولەدەستی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە تیایدا ئەژین.

(بەکەللە ڕەقییەوە) پێتوایە باوکێک بتوانێت پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ کچەکەی خۆیدا هەبێت ـ هەوەسبازانە عاشقی جەستەی کچەکەی بێت؟

ئەدۆنیس: باوکێکی «ئاسایی» ناتوانێت پەیوەندییەکی جەستەیی لەگەڵ خودی خۆیدا هەبێت، بەڵکە تەنها لەگەڵ جەستەیەکی تردا ئەتوانێت هەیبێت، جەستەیەکی جیاوازتر. کچی باوکێک «خودی خۆیەتی» ـ بەجۆرێک لە جۆرەکان «جەستەی خۆیەتی». پەیوەندییەکی هەوەسداری لەگەڵ کچەکەتدا شتێک نییە جگە لە نەخۆشی. ئەم جۆرە پەیوەندیانە جێیەکیان نییە لە عەشقدا. عەشق

یەکگرتنەوەیە لەگەڵ چەندان کەسی جیاوازی تردا، کە لەیەک ناچن. هەرگیز عەشق یەکگرتنەوەی کەسێک نییە لەگەڵ خودی خۆیدا.

Lemon inceste

* لیمۆیەکی نامەحرەم: گۆرانییەکی فەرەنسییە کە لەساڵی ١٩٨٤ گۆرانیبێژی فەرەنسیی سێرژ گانسبۆر و کچەکەی شارلۆت گانسبۆر بە ڤیدۆ تۆماریان کردووە و لە ساڵی ١٩٨٥ بڵاوبۆتەوە. ئەم گۆرانییە ئابڕوچونێکی لێکەوتەوە لەبەرئەوەی تاوانبارکرا بە جوان نیشاندانی سێکسی نێوان نامەحرەمەکان، شارلۆت کە ئەوکاتە دوانزە ساڵان بووە لە گۆرانییەکەدا لیریکێکی ناڕۆشن دەخوێنێ کە باسی پەیوەندییەکی جەستەیی نێوان منداڵێک و کەسێکی کامڵ دەکا. ئەوەی کە زیاتر ئەم قسانەی بڵاوکردەوە جۆری پەیوەندی نێوان باوک و کچەکە بوو لە ژیانی واقیعیاندا کە لە گۆرانییەکە نزیک بوو، ئەمەش وای لە خەڵک کرد هەستبکەن گۆرانییەکە لەسەر خودی ژیانی ئەم دوو کەسە نوسراوە، بەڵام سێرژ گانسبۆر لەبەردەم میدیادا نکوڵیی لە پەیوەندییەکی لەم جۆرە کرد لەگەڵ کچەکەیدا.

مانای دووهەمی وشەکە پڕاوپڕ مەبەست لە سێکسکردنێکی نامەحرەمە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا.

## سەرچاوە:

Samtal med min far, Adonis
Ninar Esber
Alhambra 2007

# مرۆڤی سوننەتی، مرۆڤی مۆدێرن و قەیرانی ژینگە

## گفتوگۆ لەگەڵ فەیلەسوفی ناوداری ئێران و جیهان سەید حسین نەسر

لەفارسیەوە: موسعەب ئەدهەم

– مانای سروشت لە تێروانینی ئێوەدا چیە؟

* هەموو ئەوەی کە نە بەدەستی مرۆڤ دروستکراوە و نە جموجوڵەکانی مرۆڤ لە دروستکردنیدا کاریگەریان هەبووە، لە لوتکەی کێوەکانەوە تاکو نێو زەریاکان، لە قەوزەکانەوە تاکو فیلەکان، بە دەستەواژەیەکی دیکە، مرۆڤیش بەشێکە لەم سروشتە و جەستەی وەک هەموو جیهان لە هەمان ئەو یاسا فیزیاوی و سروشتیە پەیڕەو دەکات، بەڵام لەو شوێنەی کە مرۆڤ بۆ دژایەتی یاخود شۆڕش لە بەرامبەر خوداو هەروەها بەرامبەر سروشت ئازادە، لە ساتی تەکنیکی دەتوانرێت بوترێت لەگەڵ هەموو بونەوەرە سروشتیەکان یەکسان نیە. لەهەر شێوەیەکدا مەبەستم لە سروشت هەر شتێکی نامرۆیی و دوور لە چالاکیە مرۆییەکان دەگرێتەوە. هەڵبەتە لە کۆمەڵگە سونەتییەکاندا هەمیشە ئەم جموجوڵانە لەگەڵ سروشتدا سازگارن. بەڵام لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا هەرگیز سازگارییەک لەگەڵ سروشتدا نابینرێت و بەرچاو ناکەوێت، پێویست بە وتن ناکات کە تەنانەت لە جیهانی ئەمڕۆدا سروشت یان دەوروبەر و سنورەکانی دروستکراوی مرۆڤ بەچەندین جۆری جیاواز لێکدەدرێنەوە و ڕاڤەدەکرێن.

– جەنابتان شوێنی ئێستای ژینگە و پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵیدا چۆن وەسف دەکەن؟

*مرۆڤی مۆدێرن و پۆست مۆدێرن، بەشێکی زۆری سروشتی لە دارستانەکانەوە تاکو مەرجانەکانی دەریا وەرگرتووە و لەناوی بردوون و ئەوەی ماوەتەوە هەڕەشەی لێدەکات. ئەم باردودۆخە جێگاو شایەنی ڕەخنەلێگرتنە، لەگەڵ فراوانبوونی جیهان، پارادایمەکانی مۆدێرنە کە لەژێر کۆنترۆڵی دەرهێنانی سروشت کە بۆ ڕازیکردنی نیازو پێویستیەکانی ڕۆژانەی زیاتری مرۆڤ شتێکی جیا

نیە. بارودۆخەکە لە حاڵەتی سەخترو دژوارتربونداییە. هەرچەندە لە دەیەکانی کۆتایی لە رۆژئاوادا سەبارەت بە دۆخی جیهانی سروشتی و پێویستی فێرکردنی مامەڵەکردنی راست و دروست لە پەیوەندیکردن لەگەڵ سروشتدا و لە رووی پاراستنی ئەوەی کە ماوەتەوە، چەندین هەوڵ و تێکۆشان ئەنجامدراوە. پێویست بە بیرهێنانەوەیە کە بەهەر ئەندازەیەک سروشت بەدەستی مرۆڤ لەنێو بچێت، جارێکی دی هەر ئەم سروشتەیە کە قسەی کۆتایی دەکات.

– لە یەکێک لە کتێبەکانتاندا پەیوەندی نێوان قەیرانی ژینگەی ئێستاو قەیرانی مەعنەوی مرۆڤی مۆدێرنتان بینیوە. ئەم بابەتە زیاتر روون بکەنەوە؟

* قەیرانی پەیوەندی مرۆڤ و سروشت لە رۆژئاوادا لەسەر بنەمای دوو هەڵە هاتە دی، یەکەم: نەبونی دەرکی دروست و قوڵتری مرۆڤ و دووەم: واقیعیەتی پیرۆزی سروشت. ئەمە یەکێک لە سزاکانی قەیرانی مەعنەوی مرۆڤ بوو کە لە ماوەی رێنیسانسدا و سەدەی حەڤدەهەمدا پەیدابوو لەسەر ئەمەش مرۆڤی مۆدێرن خۆی وەکو بونەوەرێکی زەمینی بینی کە هیچ بەرپرسیاریەتیەکی لە بەرامبەر خوداو دروستکراوەکانیدا نیە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ناونیشانی ئەنجامی فیکری و مەعنەوی ئەمری قودسی، سروشت خرایە کەنارەوە. سروشت ئامادەگی میکانیکی و ژمێرەیی بۆ مرۆڤ پەیداکرد. ئەم قەیرانە مەعنەویە لە سەردەمی شۆرشی پیشەسازیەوە روەو ئەم ئاراستەیە زیاتربووە.

– لەرووی بەرگریکردن لە ژینگە دەوترێت مرۆڤەکان گەورەترین دوژمنانی سەرگۆی زەوین و بونیان بۆئەم زەویە پێویست نیە، لەبەرئەوەی ئامادەبونێکی تێکدەرانەو کاولکارانەیان هەیە، ئێوە لەم بارەیەوە چۆن بیردەکەنەوە؟

* ئەمە سەبارەت بە هەموو مرۆڤەکان شتێکی راست نابێت، بەڵکو تەنها مرۆڤی مۆدێرن بە گەورەترین دوژمنی سروشت دەژمێردرێت. خەڵکانی دوری ئوسترالیا نزیکەی «٤٠»چل هەزار ساڵ وەچە لە دوای وەچە بەشێوەیەکی سوننەتی دەژیان و مرۆڤی سپی پێست نەیدەتوانی هیچ جۆرە گۆڕانێک لە ژیانیاندا دروست بکات، ئەگەر رێگەیان پێ بدرایە، هەربەهەمان شێوە دەیانتوانی «٤٠» چل هەزار ساڵی دیکەو تەنانەت زیاتریش لە سروشتی جوان و بێوێنەی ئوسترالیادا بژین. بەڵام ئەم بابەتە سەبارەت بە دانیشتوانی ناوچە شارنشینەکانی وەکو: سیدنی یاخود مالبورن و هەروەها بۆ شارە مۆدێرنەکانی دیکە لە سیئول تاکو نیۆیۆرک راست نیە.

لە سروشتدا پێویست بە بونی مرۆڤی مۆدێرن ناکات و شێوەی مۆدێرنی ژیان ناتوانێت ئەوەندە درێژەبکێشێت. بەڵام مرۆڤ لە حەقیقەتدا، نەمریەتی مرۆڤ، مرۆڤێکی سوننەتیە، هەر بەو جۆرەی کە تاکو ئێستا توانیویەتی، دەتوانێت لەگەڵ ئەوەشدا سوپاسگوزاری سروشت بێت و رێگەی ئەوەی پێبدات کە لە جیهانی مەعنەویدا هەناسە هەڵبمژێت. گەلێک بەڵگەی میتافیزیکی و جیهانی و نهێنی ئامێزی بێشومار بونیان هەیە کە سروشت بەبێ مرۆڤ ناتوانێت دەریان بخات.

من ناتوانم لەم بارەیەوە قسە بکەم: ئێوە دەتوانن سەرنج لە کتێبەکانم بەتایبەت لە»مرۆڤ و سروشت» و «ئاین و یاسای سروشت» و «مەعریفەت و مەعنەوییەت» بدەن.

– ئێوە لە کتێبەکانتاندا باوەڕتان بە زانستی ئێستایی و کاتی هەیە و ئەو ڕێگەی ژیانەی کە ئەم زانستە پێشنیاری دەکات، لەلایەن مرۆڤی دونیاییەوە دروست بووە، لێرەدا دونیایی بوون بە چ مانایەکە؟

* مەبەستی من لە مرۆڤی دونیایی ئەو مرۆڤەیە کە لە مەعنەوییەتدا گەشەی نەکردووە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مەعنەویەتی دەرونی خۆی لەدەستدەدات. لەبەرئەوەی ئەو توانا فیکریانەی کە بیریان لێدەکاتەوەو هەروەها بابەتی ئەو کە سروشتە، وردە وردە لە هەرجۆرە مەعنەویەتێک خاڵی دەبێتەوە، من مرۆڤێکی لەم جۆرە ناوی مرۆڤی دونیایی لێدەنێم.

– بۆچی دەڵێیت جیهان هەروەک کتێبێکە کە مانای جۆراوجۆری هەیە؟

* کتێب چیە؟ ژمارەیەک وەرەقە یاخود نامەیەکە کە بەجۆرێک ڕەنگ نوسراوەتەوە و لەپشت ئەم شێوە دیارەوە مانایەک شاردراوەتەوە. ئەگەر کەسێک بیەوێت ماناکەی دەرک بکات و لێی تێبگات، دەبێت زمانی نوسینی بزانێت. باشە جیهانیش وەکو ئەم کتێبەیە کە لەپشت شێوەو چۆنیەتی ئەو دیاردانەی کە بونیان هەیە، مانایەکی تێدایە. ئەگەر مرۆڤ مانای ئەم زمانە نەزانێت ناتوانێت کێش و درێژی و پانی بدۆزێتەوە. زانستی بڕی سروشتی کتومت هەمان ئەو شتەیە کە لەکتێبی بوندا هەیە. لایەنە ژمێردراو دیاردە سروشتیەکانی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت، بەڵام ئەو زمانەی کە کتێبی سروشت و جیهانی پێ نوسراوەتەوە دەخرێتە پشتگوێ هەر لەبەر ئەمەشە کە مرۆڤەکان لە پەیامی ناوەکی و دەرونیەکەی تێناگەن.

– ئایا دەرکی نیشانەکانی سروشت و تێگەیشتن لە ماناکەی لە توانادا هەیە؟

* بەڵێ، دەرککردنی زمانی کتێبی جیهانی هەر بەو جۆرەی پێشینانمان ئەنجامیانداوە کارێکی مومکینە، بەڵام ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی تەواو ئەم کارە ئەنجام بدەین، سەرەتا بەپێی پێویست پێویستە لەگەڵ میتافزیک و جیهانناسی ئاشنا بین و بتوانین جارێکی تر جیهانی مەعنەوی و فیکری سوننەتی کە زمانە کە لەوەوە هاتووە ئەزموون بکەین.

– بە باوەڕی ئێوە کام یەک لەم زانستانەی کە ئێستا بونیان هەیە لە زانینی مرۆڤ و سروشت نزیکترن؟

* لەو شوێنەی کە زانستی نوێ لەسەر بنەمای ڕەدکردنەوەی پلەکانی بوون و واقیعیاتی مەعنەوی دروست بوون، هیچ یەکێک لەوانە لە دەرکی ئاینی مرۆڤ و سروشتەوە نزیک نین. بەڵام لەو شوێنەی کە ئەم پرسیارەتان کرد بە سەیرکردنێکی کردارییەوە دەتوانم بڵێم کە تێگەیشتنی هارمۆنی لە سروشت و پەیوەندی ئێمە لەگەڵیدا ئەوە دەتوانێت لەم بابەتە نزیکتر ببێتەوە، بە باوەڕی من بە تێڕوانینێکی میتافیزیکیانە میکانیکی کوانتەمی گرنگیەکی زۆری هەیە. بەم تێڕوانینە دەتوانرێت لە زیندانی دوجەمسەرەی دیکارتی ڕزگارمان ببێت.

– زانستە ڕۆژهەڵاتیەکان هاوکاری تێگەیشتنی زانستی ڕۆژئاوایی لە سروشت دەکات؟

* زانستە سوننەتییە ڕۆژهەڵاتیەکان، هیندی، چینی، یاخود چ ئیسلامی بن لەسەر پایەی جیهانناسی وەستاون و لەگەڵ میتافیزیکدا پەیوەندیەکی هەمیشەییان هەیە. ئەم زانستانە لەژێر سێبەری بنەمای فیکری و مەعنەوی بە شێوەی سروشتی فیزیکی باڵا «متعالی» سروشت

دەخوێندنەوە و لەسەر بنەمای پەیوەندی قوڵی نێوان مرۆڤ و سروشت وەستاون و دروست بوون، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە لە بیرکردنەوەی رۆژهەڵاتتدا لە رۆڵی مرۆڤگەراییدا باس دەکرێت و دەبینرێت. ئێستا ئەم زانستانە ئەگەر لە رۆژئاواشدا بخوێندرێن نەک تەنها بەشێوەی قۆناغی پێشەکی و سەرەتایی بەڵکو دەتوانن لە زانستی مۆدێرنی رۆژئاوادا بەشێوەی راستەوخۆ لایەنە قوڵ و بنەڕەتیەکانی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت ئاشکرا بکەن وە ئەو لایەنانەش ئاشکرا دەکەن کە لە دیدی سنورداری زانستی رۆژئاوادا نادیار و شاراوەن.

– ئاین چ رۆڵێک لە بابەتەکانی ژینگە ناسیدا دەگێڕێت؟

* ئایینەکان دەتوانن لە قەیرانی ژینگەدا و ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە و بەتایبەت لە نێوان تاکی نێو ئەو کۆمەڵانەی کە بە پێچەوانەی ئەوروپیە رۆژئاواییەکان بە ئایندار ماونەتەوە. لە سەرەتاوە ئەوە ئایین بوو کە لە مانای فراوانکردنی ڕوانینی مەعنەوی لە ئەزمون سەبارەت بە سروشت لە نێوان شارستانیەتە سوننەتیەکاندا ئەم بابەتەیان هێنایە کایەوە. هەر بەو جۆرەی کە وتم ئەگەر ئاینگەرایی لە سروشتدا لە رۆژئاوادا نەبوایە ئەو زانستە بڕی «کمی» یانە نەیاندەتوانی پێش بکەون بەم شێوەیە تەکنۆلۆژیا کە بوە هۆی وێرانیەکی لەم جۆرە نەیدەتوانی پێشکەوتن بەدەست بهێنێت.

لە پلەی دووەمدا: ئایینە بنەڕەتیەکان لە جیهاندا و بەتایبەت ئایینە سەرەتاییەکان خاوەنی ئەخلاقی ئاینین کە سەرنجی تایبەتیان بە مرۆڤ و جیهانی سروشت هەیە، ئەم بابەتە تەنانەت سەبارەت بە ئاینی مەسیحیەت هەر راستە، هەرچەندە کە قۆناغی مۆدێرن لە سایەی سوننەتی مەسیحیەتدا دروست بووە، بەڵام لە دەیەکانی کۆتاییدا وتەبێژان و ئەخلاق ناسانی مەسیحی رویان لەم بابەتە کردووە و سوننەتی فرانسویان بە ناونیشانی قەدیسی حامی سروشت ناساند و بەشێوەیەکی دیاریکراو ئەمڕۆ پێویست بوون بە «دروستکردنی فەزای سەوز» لە ئایندا و زیندوکردنەوەی ئەو لایەنە فێرکارییانەی کە پەیوەندییان بە سروشت و ژینگە و بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بەرامبەر بە دروستکراوە خوداییەکان هەستپێکراوە و گرنگە دەرکەوتووە.

دەتوانیت وێنای ئەوە بکەیت کە ئەگەر وتەبێژان و رێنمایکەرانی موسوڵمان و مەسیحی و هیندی و بوزایی لە نێوان موسوڵمانان و مەسیحەیەکان و هیندەکان و بوزاییەکان لە گوتە و قسەکانی رۆژانەیان باسیان لە پاراستنی سروشت بکردایە و ئەم وەزیفە ئاینیەیان سەبارەت بە دروستکراوەکانی خودا بناساندایە، بارودۆخ چەند جیاواز دەبوو.

– بۆچونتان سەبارەت بە تێگەیشتنی مرۆڤ و زانستی گیانەوەرناسی چیە؟

* بە باوەڕی من ئاگایی لە خودی ئاژەڵێک شێوەیەکی بەرزتری هەیە لە ئاگاداربوون بە لەدایکبون و زۆربون و توێکاری لەشی ئاژەڵەوە، رەفتارەکانی ئاژەڵ بە بەراورد لەگەڵ خودی ئاژەڵەکە گرنگیەکی کەمتری نیە و جێگەی تایبەتی خۆی هەیە. زانست سەبارەت بە خودی ئاژەڵ بەبێ گومان زانستێکی قوڵترە.

– ئەگەر حاڵی حازر خاڵێک بوونی هەبێت کە زانایان و پیاوە مەزهەبیەکان پێکەوە هاوبەشیەکیان

هەبێت، کۆتا ڕۆژی جیهانە کە ڕوداوێکی ترسناکی جیهانی تیایدا ڕوبدات، وەکو ئەم دوو کۆمەڵەیە ئەم بارودۆخە چۆن دەبینیت؟

* هەر بەو جۆرەی ئێمە لە سەرچاوەکانی ئیسلام و مەسیحیەت و هیندا دەبینین تاکە مەزهەبیەکان و ئایندارەکان باس لە کۆتایی مێژوو و ڕوداوی دوارۆژ دەکەن. ئەمانە لەگەڵ ئەمەشدا باس لە «نیشانەکانی سەردەم» دەکەن، ئەو نیشانانەی کە باس لە کۆتایی مێژوو دەکەن. ئەو شتەی کە زانایان لەژێر ناونیشانی بەڵانزیکەکانی ژینگە قسەدەکەن هەروەک «نیشانەکانی سەردەم و دوارۆژن»بەڵام ئەگەر بە بیروباوەڕی دوارۆژناسانەوە دەست بە وێرانکردنی سروشت بکەین، توشی گوناهێکی گەورە بووین و ئەمەش گەورەترین سوکایەتی بە خودا و ئەو فێرکارییانەیە کە لە ئاینەکاندا هەیە. ئەگەر ئێمە پەیڕەوی سەرسەختی مەزهەب بین، ئایا ئەوە ڕاستە کە بە پێچەوانەی ئەو فێرکارییانەی کە دامەزرێنەران و گەورەکانی ئاینەکان فێریان کردوین و پێیان ڕاگەیاندوین کاربکەین و بجوڵێینەوە. بۆ نموونە: هاوکاری و یارمەتی هەژاران نەدەین بەو بەڵگەیەی کە جیهان بەرەو لەناوچوون دەڕوات و ڕۆژەکانی کۆتایی خۆی تێدەپەڕێنێت. هیچ کەسێک جگە لە خودای گەورە نازانێت کەی کاتی ئەوە دەگات و دونیا کۆتایی دێت. پێغەمبەری ئیسلام«×» لە شوێنێکدا دەفەرموێ: (درەختێک بچێنە، تەنانەت ئەگەر لەوە دڵنیابیت سبەینێ کۆتایی جیهانە).

– ئایا هیچ ئومێدێک هەیە کە ئاشتی لە نێوان مرۆڤ و سروشت بێتەکایەوە؟ ئایا ئێمە وەکو مرۆڤ دەتوانین جێگەیەکی گونجاوتر لە پەیوەندیمان لەگەڵ سروشتدا هەبێت؟

* هەڵبەتە هەمیشە ئومێد هەیە، هەر بەو جۆرەی کە سوننەتی ئاگۆستین دەڵێت: ئومێد بنەمایەکی ئیلاهی هەیە. بەڵام ئێستا پاش نزیکەی نیو سەدە کە لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە سەبارەت بە قەیرانی ژینگە دەگوزەرێت، من بەو ئەنجامە گەیشتووم کە مەگەر بە لوتفی خودایی ئەو مەترسیە کۆنترۆڵ ببێت ئەو بیرکردنەوەیەی کە لەسەر مرۆڤی مۆدێرن فەرمانڕەوایە بگۆڕێت.

من بەداخم کە ئەمە دەڵێم، بەڵام واقیعیەت ئەوەیە کە تاکو ئەو دەمەی مرۆڤی مۆدێرن تێڕوانین و ڕەفتاری نەگۆڕێت بەرامبەر بە سروشت و بونەوەرانی دیکە، ڕەنگە باشتر بێت کە ڕوداوێکی ترسناک بۆ هەمووومان ڕوبدات تاکو مەرگ و ڕوداوی سروشتی ئەزموون بکەین. ئومێدەوارم لەم ڕووەوە هەڵە بیرم کردبێتەوە، لە هەر شێوەو دۆخێکدا باشتر وایە ئومێدەواربین کە ڕۆژێک بێدار دەبینەوە و جڵەوی مەترسیەکانی سروشت بەدەستەوە دەگرین و کۆنترۆڵیان دەکەین.

دڵنیا بن ئەگەر هەرجۆرە ڕەفتارێک لەگەڵ سروشتدا بنوێنین و لەو ڕەفتارەدا دوچاری خۆ بەگەورە زانین و غرور ببین، ئیدی ئەوە سروشتە کە قسەی کۆتایی دەکات. لە کۆتاییدا ئەوەمان لەیاددا بێت کە هەموو شتەکان لە دەستی خودادان. ئێمە هەر کارێک کە بتوانین ئەنجامی دەدەین و ئەوی دیکەی بە خودا دەسپێرین و خودای گەورە لە هەمووان باشتر دەزانێت.

## سەرچاوە:

ماهنامە پژوهشی «حکمت و معرفت» سال سوم، شمارە۳، خرداد ۱۳۸۷.

# گۆڕانکاری لە جیهانی ئیسلامدا دەبینم

## گفتوگۆ لەگەڵ نەسر حامد ئەبو زەید

لەفارسیەوە: کارزان محەمەد

پرۆفیسۆر (د.نەسر حامد ئەبو زەید) لە ساڵی (١٩٤٣ز) لە میسر لەدایک بووە، دوای تەواوکردنی کۆلیژی زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی لە زانکۆی کایرۆ لە ساڵی (١٩٨٧)دا، پلەی دکتۆرای لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبیدا هێنا. بواری لێکۆڵینەوەی ناوبراو دەربارەی قورئانە، تیایدا مێژووی فۆرمەڵەبوونەکەی شرۆڤە کردووە کە کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە. توندڕەوە ئاینییەکان ئەویان بەلادەر لە ئایین تۆمەتبار کرد، دوای ئەوە ناچار بوو لە هاوسەرەکەشی جیا ببێتەوە، سەرنجام وڵاتی میسری جێهێشت. ناوبراو لەساڵی (٢٠٠٤)ەوە لە هۆڵەندا سەرقاڵی کاری توێژینەوەو وانەوتنەوەیە لە زانکۆکاندا.

– پرسیار دەربارەی پەیوەندی موسڵمانان و توندوتیژی، ئێستاش یەکێکە لە پرسیارە گرنگەکان لە خۆرئاوا، تۆ لەم دوادواییەدا ئەو بۆچوونەت خستبووەڕوو کە پەنابردنی بیرمەندانی موسڵمان بۆ سورەتەکانی قورئان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە، بەشێوەیەکی تەواوەتی ڕێگاکە بەرەو هەڵە دەبات...

* بێگومان قورئان هەندێکجار زمانێکی زۆر دەسەڵاتدارانەی لەپێناو بزواندنی موسڵمانان بەرەو شەڕ بەکارهێناوە، لێکۆڵیاران دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە کە بۆچی قورئان زمانێکی هاندەرو لێبڕاوی لەم ئاقارەدا بەکارهێناوە. لەم ڕووەوە ئەوەی چارەنووسسازە هەلومەرج و زەمینە پراکتیکییەکانە، ئەو عەرەبانەی ئیمانیان بە موحەممەد(د.خ) هێنابوو، دەبوایە بڕوا بەوە بهێنن کە دەبێ بۆ جەنگی هاونەتەوەو کەسوکارەکانیشیان بچن، بۆ ئەنجامدانی ئەو چەشنە کارەش دروستبوونی گومانێک لەنێویاندا لەهەمبەر دابونەریتەکانی بەر لە پەیدابوونی ئیسلام پێویست بوو. بەلای عەرەبەوە، شەڕکردن

لەگەڵ کەسوکاری خۆیان قەدەغە بوو، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی موحەمەد (د.خ) ژمارەیەکی زۆر هۆزو عەشیرەت لە دەوری کۆبوونەوە. کاتێک کاتی ئەوە هات تا ئەوان بەرگری لە کۆمەڵگا نوێیەکەی خۆیان بکەن، هەڕەشە سەرەکییەکە لەلایەن خودی هۆزەکانی خۆیانەوە هات. لێرەدا دەتوانرێ پەی بە گوتاری ئاشتی قبوڵنەکەری قورئان ببەین.



ئیسلام لەنێو ئیمپراتۆرییەتێکی جیهانیدا لەدایک نەبووە، بەڵکو لە هەناوی جیهانی دابونەریتی عەشیرەت و ڕێسای عەشیرەتگەری و یاسا موشریکەکاندا لەدایک بووە. پەیوەندی خوێنایەتی و خزمایەتییە عەشیرەتگەرییەکان نەیدەتوانی کۆمەڵگا نوێیەکە بەیەکگرتوویی بهێڵێتەوە، چونکە موسڵمانە یەکەمینەکان لە کۆمەڵێک هۆزی جۆراوجۆرەوە لە دەوری یەکتر کۆببوونەوەو ئیدی هۆزێکی نوێیان هێنابووە ئاراوە، هۆزێک کە هەر لە دەستپێکەوە لەگەڵ هۆزەکانی تردا کەوتبووە هەلومەرجێکی پڕ ناکۆکییەوە. ئەوان دەبوایە بەرگری لە خۆیان بکەن، هەموو ئەم مەسەلانەشە کە قورئانیان لێ فۆرمەڵە بووەو قورئان بەرهەمی کاریگەرییەکانی هەلومەرجی هاتنەخوارەوەیەتی. هەربۆیەشە ناتوانین بەبێ ناسینی زەمینە مێژووییەکانی سەرهەڵدانی ئیسلام، لە قورئان تێبگەین. ئەم خەڵکە پەیڕەوییان لە ڕێبەرێکی ئایینی نوێ بۆ شەڕکردن نەدەکرد، ئەوان هەرکامیان لە جۆرە سیستەمی عەشیرەتگەرییەوە هاتبوونە دەرەوە بەڵام سەرەنجام ناچاربوون بجەنگن.

– تۆ چەندین جار بۆ لێکدانەوەی قورئان، پشتت بە یۆحەنای دیمەشقی (John of Damascus) بەستووە، ئەم پیاوە ئایینییە ناسراوە لە دەستپێکی سەرەتای بەرفراوانبوونی ئیسلام بۆ ناوچەکانی

تری جیهان، ژیاوه. ناوبراو ئاماژه بۆ كۆمەڵێک بابەت لە ئیسلامدا دەكات كە بە ناتەبا لەگەڵ یەكتردا ناویان دەبات. قسەی ئەم پیاوە مەسیحییەی سەدەی هەشتەم، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا سەبارەت بە شیكردنەوەو لێكدانەوەی قورئان چ شتێكی گرنگی هەیە تا بەئێمەی بڵێیت؟

* یەكەمین وانە كە من لە سەرەتای خوێندنەوەی خۆمدا بۆ ئەم لێكۆڵیارەی قورئان تێی گەیشتم، ئەمە بوو: ئەم مەسەلەیە باسێكی مشتومڕئامێزی سەدەی هەشتەمە، بەڵام وێڕای ئەمەش زۆر پڕبەرهەم بووە، چونكە یەكەمین قسەكەرە دەربارەی ئیسلام، ئەو پرسیارانەی لەلایەن یۆحەننای دیمەشقییەوە خراونەتەڕوو، بە ئاستەنگێكی دەزانم نەک هەڕەشە.

پەیوەندی لۆژیكی سەرجەم ئەم ئاستەنگانە بەلای منەوە، لە هەناوی گوتاری دژەئیسلامیدایە، لەم سەردەمەی خۆماندا هەر لە كاریكاتێرەكانی پێغەمبەر (د.خ)ەوە تا دەگاتە فیلمەكانی وەک (فیتنە) یاخود (تەسلیم) لەم ڕیزەدایە، منیش هەمیشە هەوڵ دەدەم تا موسڵمانانی تر هان بدەم كە ئەوانیش وەک ئاستەنگێک بڕۆنە ئەم مەسەلانە. بەهەرحاڵ هیچ شتێ ناتوانێ بەڕاستی ببێتە هەڕەشەیەک بۆسەر ئەو شارستانیەتە گەورانەی كە چەندین سەدە بەردەوام بوون و بوونەتەمایەی دروستبوونی سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەكان، لە سیستەمی عەشیرەتگەرییەوە بگرە تا ئیمپراتۆریی و لە میللەت و وڵاتانەوە بگرە تا دەگاتە سیستەمی گلۆباڵی.

یۆحەننای دیمەشی نەیدەویست گوتاردەرانی ئیسلامی بۆ ئەنجامدانی كارە مەزنترەكان ببزێوێ، هەموو ئەو مەسەلەیەی ئەو دەیویست، نیشاندانی پەیوەندی نێوان جیهانی ئیسلامی و نائیسلامی بوو، پەیوەندییەک كە قوڵترو دیرۆكیانەتر بوو لەوەی ئێمە بیرمان لێ دەكردەوە. چەمكی دوو جیهانی جیاواز لەیەكتر، لەڕاستیدا چەمكێكی هەڵەیە. هەرگیز ئەو جیهانانە بوونیان نەبووە.

– چی بووەمایەی ئەوەی كە ئیسلام ببێتە شارستانییەتێكی گەورە؟

* شێوازێک بوو كە تیایدا پەیوەندی هاوبەرامبەری لەگەڵ كلتورەكانی تر گرێ دا، ئاڵوگۆڕی بەرفراوانی جیهانی كلتوری لەدوادوای سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەمدا بونیاد نرا، لەڕاستیشدا لەڕێگەی ئیسپانیاوە بەردەوام بوو. هێندە بەسە ئەوە وەبیر بهێنینەوە كە فەلسەفەو فیقهی ئیسلامی بۆ زمانی لاتین وەرگێڕدرا.

شارستانییەتەكان هەروەک شەپۆلەكانن، واتا بەشێوەیەكی هەمیشەیی لە جوڵەدان، جوڵەیەک كە لە ئەفریقاو عیراقی كۆنەوە دەستی پێكردبوو و لەڕێگەی یۆنانەوە ڕۆیشت و گەیشتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش. لێرەدا ئێمە چەرخی هێلینیزم دەبینین، كاتێک كە ئەسكەندەری گەورە هەوڵی دا حكومەتەكەی خۆی لە سەرتاسەری ناوچەكەدا سەرتاپاگیر بكات. پاشان نۆرە گەیشتە شارستانییەتی ئیسلامی و سەرەنجام ڕێنسانس و شارستانییەتی خۆرئاوا دەستی پێكرد. ئەم جۆرە ئاڵوگۆڕانە كە جەختیان لەسەر بایەخی دیالۆگ لەنێوان شارستانییەت و ئایینەكان كردەوە، لەسەدەی حەوتەمدا دەستی پێكرد.

– تۆ بەم قسانەی خۆت، لەڕاستیدا پڕوپاگەندە باوەكانی رەخنەگرانی ئیسلام بەدرۆ دەخەیتەوە كە لەو بڕوایەدان هەرگیز ئاڵوگۆڕێكی جددی یاخود دیالۆگ لە ئیسلامدا نەبووەو ئیسلام و تاكگەرایی لەگەڵ یەكتردا ناتەبان...

* راستە. ئەمەش بەڵگەیەکی گرنگە لەهەمبەر ئەم بۆچوونەدا کە لە دیدگای تاکێکی موسڵمانەوە گۆڕین یاخود قبوڵکردنی ئایندێکی تر مەحاڵە. موسڵمان (بەپێی بۆچوونی باوی نێو موسڵمانان)، هەمیشە بە موسڵمانێتی دەمێنێتەوە، مەگەر ملی خۆی بکات بەپەتەوە.

بەبڕوای من، بانگهێشتی پێغەمبەر (د.خ) بۆ خەڵک لەپێناو پەیڕەویکردن لە ئایدۆلۆژیای ئایینی، لەسەر بنەمای قبوڵکردنی ئازادانەی هەڵبژاردنی ئاینەکەیە. ئەگەرنا ئەو مرۆڤانەی ئازادی هەڵبژاردنیان نییە، پێویستیشیان بە بانگهێشتکردن نییە. مافی بنەڕەتی هەر مرۆڤێک بۆ قبوڵکردنی ڕێبەرێکی ڕۆحی نوێ، دەبێ ئەو گرەنتییەش بدات کە ئەو مرۆڤە بتوانێ بەپێی حەزی خۆی، دووبارە باوەڕە ئاینییەکەی بگۆڕێت.

– تۆ لەبارەی ڕەوتەکانی مێژووی جیهان دەدوێی، ئاماژەت بۆ کۆمەڵێک قۆناغی زۆر داهێنەرو دینامیکی جیهانی ئیسلام کرد، بەڵام سەرەنجام سەردەمێک لە نزیکەی سەدەی چواردە یاخود پانزدەی زایینی وادێتەبەرچاو کە نادیارە، بەبڕوای تۆ فاکتەرەکەی چی بووە؟

* من بەتەواوەتی لەگەڵ ئەم بۆچوونەی تۆدا نیم، ئەگەر تۆ هزری ئیسلامی سەدەکانی (١٧،١٦،١٥) لەگەڵ پێشڤەچوونەکانی هزری ئیسلامی سەدەکانی (١٨،١٩) بەراورد بکەیت، فرەچەشنییەکی زۆر مەزن لەم هزرانەدا دەدۆزیتەوە. مەسەلەکە لێرەدایە کە هەندێکیان حەز دەکەن زیاتر وێنایەکی نەگۆڕیان بۆ عەرەب هەبێت. ئەوان تەنانەت توانای بینینی جیاوازییەکی زۆری نێوان شوێنە جۆراوجۆرەکانی وەک تونس و عەرەبستانی سعودیەیان نییە. بەلای ئەوانەوە ئیسلام مەسەلەیەکی جێگیرو نەگۆڕە. ئەم پڕوپاگەندانەش بەهیچ شێوەیەک ڕاست نین. لەجیهانی ئیسلامدا، گۆڕان بەردەوامە کە جۆرە چاکسازییەکیشە. ئەم ڕەوتە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە دەستی پێکردو لە سەرتاسەری سەدەی بیستەمدا درێژەی کێشاو سەرجەم چینوتوێژەکانی خەڵکی لەخۆگرتووە.

– بەڵام تۆ خۆت بەقوربانی دەستی ئەم گۆڕانانە دەزانیت.

* بەڵێ، من قوربانیم بەڵام لەهەمانکاتدا شایەتحاڵی ئەم گۆڕانکاریانەشم کە لەساتی ڕووداندایە، ئەوانەش وێڕای سەرجەم ئەو ڕووداوە ترسناکانەی ڕوویاندا (وەک دۆسییەکەی خۆم).

فەیلەسوفی بەناوبانگی عەرەبی- ئیسپانی (ئیبن روشد) لە سەردەمی خۆیدا دوورخرایەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هزرەکانی لە سەرتاسەری جیهانی خۆرئاوادا بڵاوبۆوە. بەرهەمەکانی لەڕێگەی سوریاوە بۆ زمانی لاتینی وەرگێڕدراو بنەمای کەنیسەی ئەو سەردەمەیان پێکهێنا. ئێمە هەمیشە دەبێ سەرنج لە زەمینەکان بدەین چ لۆکاڵی یاخود جیهانی بن، نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە جیهانی مەسیحیش کۆمەڵێک بیرمەندی زۆری سزا داوە، وێڕای ئەمەش لەو ڕووداوانەوە دینامیکییەتێکی ناوخۆیی کەوتە جموجۆڵ.

## سەرچاوە:

مجلة الكتروني (فكر نو)، شماره (٣٢)، ص (٥١-٥٧)، مترجم: على سنايى.



# گفتوگۆیەك لەگەڵ ماریا ڤارگاس لۆسا

**ئامادەكردنی: بیۆرن ڤیمان**
**«بەڕێوبەری بەشی ئەدەبی ڕۆژنامەی داگز نیهێتەر»**
**لە سویدییەوە: هیوا قادر**

ئەگەر سەیری ئەو فۆتۆ كۆنانەی شەستەكانی ماریۆ ڤارگاس لۆسا بكەیت، ئەبینیت كە لە ئۆلۆف پاڵمە «سەرۆك وەزیرانی كوژراوی سوید ١٩٨٦» ئەچێت. ئەو لەیەكچوونە تەنها لە شێوەی نیگاكردنیاندا نییە، بەڵكە لە ڕەنگی قەترانی قژی بە ئاو داهاتوویانەوە بگرە هەتا ئەگات بە زەردەی لەخۆڕازیبووی سەر لێو و خەتی كراسەكانیان و بۆینباخە باریكەكانیان. بەدەر لە هەموو ئەمانەش ئەو هەیبەتە درەوشاوەیەی كە هەیانە.

كاتێک تەلەفونم بۆ ڤارگاس لۆسا كرد لە نیوۆرک، هێمام بۆ ئەو لەیەكچوونەی ئەو و ئۆڵۆف

پاڵمە کرد، ئەو لەوێ ئەم پایزەی لە زانکۆی پرینستۆن وەک موحازرێکی میوان بەسەر ئەبرد. پاتریسیای ژنی وەڵامی دامەوە. پێکەوە لە قاتی چل و شەش هەمینی باڵەخانەیەکدا ئەژین، لەوێوە ئەتوانیت هەڵاتنی خۆر بەسەر هەریەک لە ڕووباری هودسۆن و پارکی شاردا ببینیت. لە وتارێکیدا کە لە «ئێل پایس»دا ڕۆژێک دوای بڵاوکردنەوەی هەراوهوریای بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ بڵاوکرایەوە، بەشێوازێکی زۆر شایستە و ئەدەبیانە باس لە ژیانی ناو مانهاتنی خۆی ئەکات: زوو بەخەبەرهاتنی، کارکردنی بەیانیان بە ڕۆبی خەوەوە، وەرزشکردن بە پشت، پیاسەی ناو پارکی شار و کاری زۆری ناو کتێبخانەی نێونەتەوەیی.

ـ ئۆلۆف پاڵمە؟ ڕوخسارمان لەیەک ئەچێت؟ بە ڕاست وایە؟ من هەرگیز بیرم لەمە نەکردۆتەوە. من هەموو ئەو نووسینانەم لەسەر کوشتنەکەی خوێندۆتەوە و هەرگیزیش بۆم قبوڵنەکراوە. پاڵمە تاڕادەیەک بوو بە ئەفسانە، ئەی وانییە؟

ـ من پێموایە ئۆلۆف پاڵمە کەسێک بوو تێڕوانینی زۆر باشی هەبوو، هەروەها کەسێکی زۆر ڕەسەن بووە لە کاری خۆیدا بۆ خزمەتکردنی دنیای سێ. لە ڕاستیدا ویستی نێونەتەوەیی سۆسیال دیموکرات پاڵپشتێک بوو بۆ هاوڵاتیانی ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر زەبروزەنگی دیکتاتۆریدا بوون. هەروەها پاڵمە دەرگای سویدی لەبەردەمی دنیا و سیاسەتی پەناخوازیدا خستەسەرپشت. پێشموایە بەشی هەرە گەورەی ڕەسەنایەتی ئەو لەو خاڵەدایە، ئەو لە ئەوروپایەکدا ئەمەی کرد کە بەشێوەیەکی گشتی مەیلێکی ترسنۆکانەی لەبەردەم ئەم پرسیارانەدا هەبوو.

کاتێک پێتەر ئینگلوند «سکرتێری ئەکادیمیای سوید» لە ٧ ی ئۆکتۆبەردا ڕایگەیاند کە ماریۆ ڤارگاس لۆسا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ئەمساڵی پێئەدرێت، لەپڕ وەک چۆن هەوادارانی فوتبۆڵێن کە تیپەکەیان گۆڵ ئەکات و هاوارئەکەن منیش ئاوا هاوارم کرد. ئەو هاوارە لە ناخمەوە هاتەدەرێ. هیچ زێدەڕۆیی نییە گەر بێت و بڵێم ماریا ڤارگاس لۆسا بۆ من یەکەم نموونەی بەرزی ئەدەبی بووە.

ئایە تۆ ئاگاداری ئەوەیت کە لە سوید گفتوگۆیەکی پڕ لە هەراوهوریا لە ئارادایە لەسەر ئەوەی کە چۆن باسی ئافرەت لە ڕۆمانەکانتا ئەکەیت؟

ـ ئەوها... نەخێر، هیچ شتێکم لەم بارەیەوە نەبیستووە...

ڕەخنەکە لەسەر ئەوەیە کە تۆ چۆن لە ڕۆمانەکانتا ئافرەت ئەکەیت بەکەسێکی سادەگۆ و زیاتریش مەیلت بەلای پیاوبوندا ئەشکێنیتەوە.

ـ وەک وتم من دوای ئەو «قەیران»ـە نەکەوتووم، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕۆمانەکانم باس لەو وڵاتانە ئەکەن کە کلتورێکی زاڵی پیاوانەیان تیایە، ئافرەت لەو شوێنانەدا پلەیەکی وای پێنەدراوە کە پلە کۆمەڵایەتییەکانی تر هەیانە، لەو حاڵەتەدا ئافرەت ئەچەوسێنرێتەوە و هەڵسوکەوتی خراپی بەرامبەر ئەکرێت. من داوا لە ڕەخنەگرەکان ئەکەم ئەمە وا لێکنەدەنەوە کە من بەرەنگاری لەم حاڵەتە

ئەکەم کە دەرهەق بە ئافرەتان ئەکرێت. تا ڕادەیەک کارێکی نەفامانەیە من بە کەسێکی پیاوسالار بزانن لەکاتێکدا پیاوسالاری لە بەشێکی زۆری دنیادا بۆتە حەقیقەت، نەک تەنها لە ئەمەریکای لاتین بەڵکە لە زۆرینەی وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا.

بەڵام ئەم گفتوگۆیەی کە تۆ باسی ئەکەیت سەرنجڕاکێش دیارە، پێمخۆش ئەبوو ئاگاداری وردە کارییەکانی بوومایە.

بەڵام سەربارى ئەمەش تۆ وەک نووسەرێکی هەست بزوێن دەرکەوتوویت؟

ـ وایە، ئەگەر مەبەستت لە هەست وەک پیشاندانی ناتەبایی بێت ئەمەیان ڕاستە. بەڵام ئەوەشیان ڕاستە کە من هەرگیز بەدوای هەست بزواندندا نەگەڕاوم، من کەسێکی لێهاتوونیم بۆ گفتوگۆکردن و خوتبەدان و دوورم لێیەوە. بەڵام باوەڕم بەوەیە کە هەمیشە بە قەناعەتێکی گەورەوە بەرگری بکەم، لە هەمان ئاستیشدا حەزئەکەم ڕەخنەبگرم.

تەمەنم نزیکەی بیست ساڵێک ئەبوو کاتێک بۆ یەکەم جار ڤارگاس لۆسام خوێندەوە. کاتێک زمانی ئیسپانیم لە دواناوەندی ئەخوێند یەکەم کتێبی ئەوم بە حونجە خوێندەوە کە یەکێک بوو لە نۆڤڵێتەکانی یەکەمی بە ناوی «بەرپرسیارەکان». ڤارگاس لۆسا مارکسییەکی بەجۆشی تەمەن بیست و یەک ساڵ بووە کە ئەم بەرهەمەی نووسیوە. زانستی یاسا و ئەدەبیاتی لە زانکۆی «سان مارکۆس» لە «لیدا» خوێندووە، هەروەها لەگەڵ دوو هاوڕێی خۆیدا سەرقاڵی گۆڤارێکی بچوکی ئەدەبی بوون بە ناوی گۆڤاری ئەدەب. گەورەترین شەڕێک کە ئەوکات وەک خۆی ئەیگێڕێتەوە کردوێتی، لەسەر ئەوەبوو کە کام لەم دوو نووسەرە گەورەترینن: جان پۆڵ سارتەر یان خورخێ لویس بۆرخیس. دوو نووسەری جیاواز لەیەک: سارتەر ـ سەرسەختێکی قسەکەر لەسەر کۆمەڵگا کە خەڵاتی نۆبڵی لە ١٩٦٤ دا پێبەخشرا و قبوڵی نەکرد وەریبگرێت ـ بۆرخیسیش بەهرەمەندێکی خەیاڵی بەزەوق کە هەرگیز بەهەڵەدا نەئەچوو.

ئایە تۆ ئەو سەروەختەت لەبیرماوە؟

ـ بێگومان! گفتوگۆگەلێکی توندوتیژ بوو. من لایەنگرێکی گەورەی سارتەر بووم و شەیداییەکی زۆرم بۆ بیرۆکەکەی «خۆتەرخانکردن بۆ ئەدەب» و بۆچوونی لەسەر بونگەرایی و شتەکانی تری هەبوو، بەڵام هاوڕێکانم لایەنگیریی بۆرخیسیان ئەکرد، بۆرخیس نوێنەرایەتی پێچەوانەی تیۆرییەکەی سارتەری ئەکرد و زۆر بە پراگماتیکی و ناحەزانەوە دژی بوو ـ بۆ ئەوەی قسەی چەواشە دەرهەق بەمێژو و حەقیقەت نەکەم. گفتوگۆ توندوتیژەکانمان لەسەر ئەوەبوو، نەک لەسەر چۆنییەتی بورخیس، چونکە ئەو زۆر بێ دەربەستانە لەبەرامبەردا وەستابوو، بەڵکە لەسەر ئەو هەڵسوکەوتە ئەخلاقییەی نێوان بۆرخیس و سارتەر بوو کە لەسەر ئەرکی ئەدەب هەیانبوو.

ـ ئەتوانم بڵێم، من ئەو کاتە زۆر سارتەریانە بووم و کەم بۆرخیسی بووم. ئەگەرچی بە دزییەوە

وەک کەسێکی دەرکەوتوو بۆرخیسیشم هەر ئەخوێندەوە، هـ هە هە...

ئەی ئەمڕۆ کامیان هەڵ ئەبژێریت؟

ـ بەبێ هیچ گومانێک، ئەمڕۆ ئەمەوێت بۆرخیس هەڵبژێرم. سارتەر هەم قەناعەتە سیاسییەکانی و هەم فەلسەفەکەی کە ئێستا جێی سەرلێشێواندنێکی زۆرە، خراپ پیربوون. هەڵوێستە سیاسییەکانی لەگەڵ ڕۆژگاردا خۆیان ڕانەگرت و تەنانەت هەندێک جار تا ئەوپەڕی چەواشەکردن چوون.

ئەم هەڵبژاردنەت لە تێڕوانینتا بۆ فەنتازیا و کاری ئەدەب هیچ ڕەنگی داوەتەوە؟

ـ تەنها لە ڕوویەکەوە پێموایە تا ئێستاش نزیکم لە سارتەرەوە، ئەویش لەبەرئەوەی کە من پێموانییە ئەدەب شتێکی هەرزان و تاڵانبێت. من پێموایە ئەدەب کاریگەریی خۆی هەیە، دەسەڵاتی لەسەر ژیانی ئینسانەکان هەیە و لەوانیشەوە مانایەکی هەیە بۆ مێژوو. لەبەر ئەمەش ئەبوو لای هەموو نووسەرێک جۆرێک لە بەرپرسیاری هەبوایە. هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتی لای زۆرینەی نووسەران بەرامبەر بە ئەرکەکانیان کاریگەرییەکی خراپ لەسەر کۆمەڵگە دائەنێت، لەم ڕووەوەیە کە من تا ئێستاش نزیکی سارتەرم.

نوسەر بەرامبەر بە کێ بەرپرسیارە؟ بەرامبەر بە خۆی یان بەرامبەر بە خوێنەران؟

ـ بەرپرسیاریەتیەکەی لەوەدایە کە ئەدەب بگەیەنێت بە خوێنەر، ئەدەب شتێک نییە کە ئینسان بەتەنها خۆی خەریکی بێت، بەڵکە پێدانی دەسەڵاتە بە خوێنەران. ئەمە ئەو پەیوەندییەیە کە جۆرێک لە بەرپرسیارێتی ئەخلاقی دروست ئەکات. پێش هەرشت ئینسان ئەبێت ڕەسەن بێت، نەک خۆی بخاتە ناو کلێشەکارییەوە و ڕێگا خۆشکەربێت بۆ سوکایەتی پێکردن و سادەکردنەوەی ئەدەب کە ئەمەیان دوو مەیلی زۆر خەتەرناکی ناو کلتوری ئێستایە.

دیارە ئەم تێڕوانینە کلتورییەش وەک تێڕوانینێکی ڕەق سەیرئەکرێت...

ئەم سادەکردنەوەیە وەک ئەوە نییە تۆ واز لە یارییەک یان گاڵتەکردنێک بێنیت، بەڵکە ئەمە زۆر ڕوون و ئاشکرا یەکێکە لە هەرە کێشە گەورەکانی کلتوری ئێستامان. زۆر لە نووسەران بەرپرسیارن لەبەرامبەر ئەمەدا. بەتایبەت ئا لەم خاڵەدا من پێموایە تا ئێستاش سارتەر لەسەر حەقە.

کاتێک دەستمکرد بە خوێندنەوەی ڤارگاس لۆسا تازە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە پیرۆ بەرامبەر ڕکەبەرەکەی «ئەلبێرت فوجیمور» دۆڕاندبوو. ئەو زۆر دەمێک بوو دەستبەرداری سیاسەتی بەشەوق و شۆڕی ڕادیکالە گەنجەکان بووبوو، هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە کاسترۆ وەرگرتبوو، ئێستاش بەچاوی خۆی ئەبینێ کە چۆن وڵاتەکەی بەدەست شەڕێکەوە وێرانبووە کە ئەکرێت بە شەڕی براکوژی نێوان دەستەی حکومەت و چەکدارە ماوییەکانی «سێندێرۆ لومینیوس» ناوببرێت.

ڕەنگە ئەمە ڕێکەوت نەبێت کە کارە هەرە ئاڵۆزەکانی لە ڕووی تەکنیکی گێڕانەوەوە زیاتر ئەو

کتێبانەبن سەرچاوەکەیان بگەڕێتەوە بۆ ئەو چەپڕەوییەی خۆی، «چیرۆکە ڕاستەقینەکەی هاوڕێ مایتا» ساڵی ١٩٨٣، ڕۆمانێکی دیکومێنتاری ساختەیە لەسەر شکستی شۆڕشگێڕێکی خەڵکی پیرۆ. لە ڕۆمانەکەدا ڤارگاس لۆسا خۆی بەو ناوەوە ڕۆڵ ئەبینێت. ئەمەش یەکەم جار نییە کە ڤارگاس لۆسا ئەم جۆرە لە «ئەوتۆفیکشن، ژیان نامەی تێکەڵ بەخەیاڵ» بەکاربهێنێت، کە دواتر ئەم شێوازە بوو بە شتێکی باو و هەر ساڵی ڕابردوو چەندان ڕۆمانی لەم جۆرە بڵاوکرانەوە.

ـ وایە، بەڵام ئەم کەسایەتییە ماریۆ ڤارگاس لۆسا نییە بە گۆشت و خوێنییەوە، بەڵکە «ماریۆ ڤارگاس لۆسا» بە وشە دروستی کردووە و سەرەتا و کۆتایی ژیانی ئەو کەسایەتیانە لەو کتێبەدایە کە ئەو نووسیویەتی. من پێموایە ئینسان ئەتوانێت ناوی خۆی لە چیرۆکێکدا بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی چیرۆکەکەی زیاتر جێی باوەڕبێت، بەڵام بۆ کردنی ئەم کارەش مانای ئەوە نییە کە تۆ واز لە دۆزینەوەی چیرۆکێک بهێنیت. هەموو ئەو شتانەی لە چوارچێوەی خەیاڵدان خەیاڵن، ئەگەر هات و تەنانەت هێمایەک بن بۆ پیشاندانی بەشێک لە ڕاستیش.

ئەی تۆ پێتوانییە زۆر مەیلدان بە «ئەوتۆفیکشن، ژیان نامەی تێکەڵ بەخەیاڵ» هەڕەشەیەک بێت بۆ سەر فەنتازیا و هونەری گێڕانەوە؟

ـ نەخێر، بە پێچەوانەوە! هەمیشە هەنگاوی یەکەمی فەنتازیا لە یادەوەرییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەهەرحاڵێک بۆ من وایە. فەنتازیا و داهێنان هەمیشە کەرەستەی خاوی یادەوەرین، ئەوانیش بەگوێرەی خۆیان لەو ئەزموونانەی ئینسانەوە دێن کە پیایاندا تێپەڕیوە. من پێموا نییە فەنتازی پاک و دەستلێنەدراو هەبێت، تەنانەت پیت بە پیتی ئەو فەنتازیانەی کە لای یەکێکی وەک بۆرخیسیش هەبوون فەنتازیای ڕووت نین. لە ڕاستیدا هەمیشە نووسەر خۆی کەسایەتی سەرەکی ناو ئەو چیرۆکانەیە کە ئەیانگێڕێتەوە.

یەکێک لە ڕۆمانە هەرە باش و خۆشەکانی ڤارگاس لۆسا ڕۆمانی «نەنە ژولیا و نووسەرە» کە ساڵی ١٩٧٧ نووسیویەتی، لەوێدا ئەو خۆی کەسایەتی یەکەمی ناو ڕۆمانەکەیە و باسی ئەوە ئەکات کە چۆن لە ساڵانی پەنجاکاندا وەک مێردمنداڵێکی هەراش بوو لە لیما، کچێکی خزمی دایکی کە سیانزە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە خواستوێتی. ئەمە ئەو دیوە ڕووناکەی مێژووی خزم و کەسی ڤارگاس لۆسا پیشان ئەدات . بەشە تاریکەکەشی لە یاداشتنامەکەی خۆی «ماسییەک لە ئاوا» کە لە ساڵی ١٩٩٣ دا نووسیویەتی، هەر بەش نابەشێک باسی هەڵمەتی هەڵبژاردنی ١٩٩٠ و بەش نابەشێکیش باسی مێژووی منداڵی خۆی ئەکات. چەقی باسەکە سویدە کە تا ئەوکات کەس مێژووی نەزانراوی باوکی ماریا ڤارگاس لۆسای نەزانیوە.

ـ من بۆ یەکەمجار باوکمم لە دە ساڵیدا بینی. تا ئەوکاتە دایکم و خانەوادەکەی بە منیان وتبوو باوکم مردووە. ئەوان کاتۆلیک بوون، زۆر موحافزکار بوون و بێ ئەندازە شەرمەندەبوون لەوەی دایک و باوکم هەر لە کاتی ساوابوونی منەوە وازیان لەیەکتری هێناوە. من کاتێک بۆ یەکەمجار زانیم باوکم

ماوە ئەوکاتە بوو کە لەگەڵ دایکمدا گەڕانەوە بۆ لای یەکتری.

ئەمە چەند کاریگەریی لەسەر تۆ هەبوو؟

ـ کاریگەرییەکی قوڵ و تۆقێنەری لەسەر ژیانی من هەبوو. ئەتوانم بڵێم من هەر لەو کاتەوە گەورەبووم، تەنهاییم ناسی، هەستکردن بەدەستەڵات، توندو تیژی، ئەو شتانەم ناسی کە تا ئەوکاتە من هیچ شتێکم دەربارەیان نەدەزانی، چونکە تا ئەوکاتە لەلایەن خانەوادەی دایکمەوە زۆر ئاگاداری بەخێوکردنم بوون.

لەلایەکەوە ئەمە زۆر ئازاراوی بوو بۆ من، لەلایەکی تریشەوە ڕاستی دنیا و ژیانم ناسی، ئەی وانییە؟ بێ لەوەش ئەمە گرنگییەکی زۆر گەورەی لەسەر وزەی نووسینی ئەدەبی من هەبوو. باوکم زۆر دژی ئەوە بوو بنووسم، بێ ئەو بەرهەڵستیکردنەی ئەو ڕەنگبوو من بەزەحمەت بتوانم خۆم بۆ نووسین تەرخانبکەم، ئەو بوو بە هۆکارێکی ڕاستەوخۆ بۆ شۆڕشکردنم دژ بەو دەسەڵاتەی کە ڕقم لێیبوو. ئەمە ئەو پەیوەندییە بوو کە کاریگەریی زۆر گەورەی لەسەر من دانا.

تا ئێستاش وایە؟

ـ باوکم دەمێکە مردووە و مردنی ئەویش ڕووداوێک بوو کە پێموابوو تێئەپەڕێت، بەڵام تا ئەو لە ژیاندا بوو من زاڵبووم بەسەر کەسایەتی خۆمدا و ئەو بۆ من مانایەکی زۆر گەورەی هەبوو.

هەر باوکیشت بوو تۆی خستە قوتابخانەی سەربازی لینیکۆ پارادۆ لە لیما؟

ـ بەڵێ، ئەو کاتە تەمەنم چواردە ساڵان بوو، ئەو پێیوابوو قوتابخانەی سەربازی ئەتوانێت لە ژێر باری ئەدەبیات ڕزگارم بکات. ئا، بەڵام دواتر پێچەوانەکەی کەوتەوە، چونکە ئەو قوتابخانەیە بوو بە هەوێنی نووسینی یەکەم ڕۆمانم «شارەکە و سەگەکانی».

خوێندنەوەی «شارەکە و سەگەکانی»م لە بیرە کە کاتی خۆی یەکێک بوو لە گەورەترین هەستی چێژکردنی من بۆ هونەر لە ژیاندا. ئەو هەستە وەک تا لێهاتن وابوو، لەلایەکەوە هەوڵدانێک بوو بۆ چوونە ناو زمانێکی تر، لە لایەکی تریشەوە بەرەنگاربوونەوەیەک بوو بۆ چوونە ناو تەکنیکێکی نوێی گێڕانەوەوە، هەروەها چوونە ناو دنیایەکی تەواو نەناسراو و بارودۆخێکی دڕندانەی نێوان قوتابییەکانی قوتابخانەی سەربازی لینیکۆ پارادۆ. هەر لەو دەمەوە تەکنیکی گێڕانەوە لە لای ڤارگاس زۆر سەرکەوتووانە دەرکەوت، بەجۆرێک کە جێی باوەڕنەبوو چونکە ئەو تەنها تەمەنی بیست و حەوت ساڵان بوو کاتێ ئەم کتێبەی بڵاوکرایەوە.

ئەو تەکنیکە لە کوێوە هات؟

ـ ئەو تەکنیکە... ئا... من گرنگی ئەم تەکنیکەم لە شێوازەکانی ئەدەبەوە دۆزییەوە، سوپاس بۆ خوێندنەوە کە فێری شێوەی داڕشتن و ستروکتوری ئەدەبی کردم. یەکێک لەو نووسەرانەی لێیانەوە

فێربووم فۆکنەر بوو، هەروەها بەگشتی لای نووسەرانی ئەمەریکای لاتین «وەچە دۆڕاوەکانی نووسەران» و نووسەرە مۆدێرنەکانی ئەوروپا وەک جۆیس و ڤێرجینیا وۆڵف. من لە ڕێی خوێندنەوەوە فێری تەکنیک بووم.

هەروەها ئەو دوو ڕۆمانە گەورەیەی سالآنی شەستەکان «ماڵە سەوزەکە» و «گفتوگۆیەک لە کاتدراڵەکەدا» کە دوای ڕۆمانی «شار و سەگەکانی» دێن، ئەکرێت وەک شاکاری نەخشەسازی ڕۆمان دابنرێت. خوێنەران لە بارێکی کاریگەری دژبەیەکدا لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر ئەبرێن، بەڵام هەمیشەش زۆر بە ئارامییەوە چونکە نووسەرەکە تەنانەت لە دانانی بچوکترین خاڵ بەندیدا بەتەواوەتی ئەزانێت چی ئەکات. هەراوزەنایەکی تێکڕژاوە بەڵام لەژێر کۆنترۆڵێکی تەواودا. وەکو باسیش ئەکەن ڤارگاس لۆسا سێ ساڵ خەریکی پلان دانان ئەبێت بۆ ڕۆمانێک، بەڵام دواتر تەنها یەک ساڵی ئەوێت بینووسێت.

چۆنێتی شێوەی کارکردنی تۆ چۆنە بۆ نووسینی ئەم جۆرە ڕۆمانانە؟

- ئەم پرۆسێسە کەم تا زۆر بۆ هەموو ڕۆمانێک وەک یەک وایە. من گومانێک یان وێنەیەک لە یادوەریمدا ئەوەستێت، ئەکرێت ئەوە ئینسانێک بێت، دۆخێک بێت، ڕووداوێکی بچکۆلەبێت، شتێک بێت خوێندبێتمەوە، شتێک بێت بیستبێتم یان بەسەر خۆمدا هاتبێت، لەپڕ ئەو شتە ئەبێت بە هەوێنی چیرۆکێک و دەست دەکات بە دروستکردنی خۆی لە مندا بەبێ ئەوەی من هەستم پێکردبێت.

- من لەم قۆناغەوە دەست ئەکەم بە نووسینی سەرەقەڵەم و پشکنین، هەمیشە کاتێکی زۆر تەرخان ئەکەم بۆ پشکنین. بەڵام وەک مێژوونووسێک نا کە بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕێت، بەڵکە بۆئەوەی خۆم نزیک بکەمەوە و ئەو نادڵنیاییەی کە هەمە بەسەریدا زاڵبم. ئەچمە ناو شوێنەکان و کات و کرۆکی بابەتەکەوە، ئەخوێنمەوە و سەفەر و چاوپێکەوتن ئەکەم. هەر کتێبێک لە ساتی خۆیدا سەرکێشییەکە، هەندێک جار نووسینی کتێبێک ساڵێک ئەخایەنێت، گەر گەورەتریش بێت دوو تا سێ ساڵێک ئەخایەنێت.

بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی تۆ کە لە چوارچێوەی ڕۆماندا بەدەستتهێناوە بە ئەندازیاری ڕۆمان ناوبراویت.

- وایە، من زۆر کار ئەکەم، پلان زۆر دائەنێم، بەڵام من نامەوێت لەم بوارەدا بە ئەندازیاری ڕۆمان ناو ببرێم چونکە هەموو ئەم کێشەیە بۆخۆی تەنها پەیوەندی بە سروشتی تەکنیکەوە هەیە. من تا ئەو ڕادەیە باوەڕم بە تاقەت و پێشبینیکردنی ئینسان هەیە کە ئەتوانێت وەک نەخشەیەکی واقعی و عەقڵانی ببینێت. ئەوەیان جیاوازە کاتێک من وتارێک یان دەقێکی هونەری ئەنووسم، ئەم جۆرە کارانە زیاتر واقعیترن.

بەڵام بۆ خوێنەرێک تاڕادەیەک ئەستەمە لەوە تێبگات کە ئینسان چۆن ئەتوانێت ڕۆمانێکی وەک «ماڵە سەوزەکە» دابڕێژێت.

- کاری زۆر، بە کاری زۆر! بە خۆپڕوکاندن! من حەزم لە کارکردنە و هەرگیزیش وەک دووبارەبوونەوەیەک بیر لە کارکردن ناکەمەوە. ئەتوانم تائەوپەڕی ڕادەی بێ سنووریی کاربکەم. ئەمە ئارەزووە و جۆرێکیشە لە لەزەتبردن.

کاتێک ساڵی ١٩٨٢ گابرییێل گارسیا مارکیز خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەبدا وەرگرت، ئەم خەڵاتە وەکو دانپیانانێک وابوو بەو گەشە ئەدەبییەی کە لە ئەمەریکای لاتیندا لە سەرەتای شەستەکانەوە دەرکەوتبوو. ڤارگاس لۆسا نامەی دکتۆراکەی لەسەر «مێژووی ئەم سەدەیە لای گابرییێل گارسیا مارکیز» لە ساڵی ١٩٧١ نووسی، هەتا ڕوودانی شەڕە بۆکسە بەناوبانگەکەی نێوانیان کە پێنج ساڵ دوای ئەوە ڤارگاس لۆسا ڕایگەیاند کە بۆکسێکی کێشاوە بە دەمی هاوڕێکەیدا - لە کاتێکدا ئەوان دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەکتر بوون.

ئەکرێت بوترێت پێدانی خەڵاتی نۆبڵی ئەمساڵ بە ڤارگاس لۆسا بە جۆرێک لە جۆرەکان پاداشتێک بوو لە ڕوانگەیەکی جیاوازترەوە بۆ ئەو «گەشە» ئەدەبییەی ئەمەریکای لاتین. ڤارگاس لۆسا ئەو هونەرە واقعیەی ڕۆمانی ئەمەریکای لاتینی تازەکردەوە بە تایبەتیش لە ڕووی تەکنیکی گێڕانەوەوە. ئەکرێت بوترێت کە ئەو بەرەو مۆدێرنیزمی ئەوروپی گەڕایەوە و پەرەی پێدا.

ئەگەر بۆچوونێک لە پشتی پێدانی نۆبڵی ئەمساڵەوە هەبووبێت و پێشتر فەرامۆشکرابێت ئەبێت - جیا لە بەهرەمەندی ڤارگاس لۆسا لە تەکنینی گێڕانەوەدا - ئەو کاریگەرییەی ئەو بێت لە ئێستادا کە بەسەر شێوازی گێڕانەوەوە هەیەتی، نەک تەنها هەر لە ئەدەبدا. «ئەلیاندرۆ کۆنزالس ئینیاریدۆس»ی مەکسیکی دروستکەری شێوازی فیلمی «سەگە خۆشەویستەکان» و «بابل»، نموونەیەکن کە ناکرێت بە بینینی ئەم فیلمانە بیر لە ڤارگاس لۆسا نەکەینەوە: کە بەهەمان ئەو تایبەتمەندێتی و توانایەوە دەرئەکەوێت بۆ پێکەوە گرێدانی لەزەت و عەزابی ئینسانی لە بونیادێکی گێڕانەوەدا کە تێکەڵێکە لە ئاڵۆزیی و سادەیی پێکەوە.

ڕەنگە جیا لەمەش پێویست بکات گوێ لەو وتەیەی ڕۆمان نووسی داهێنەری کۆچکردوی شیلی «ڕۆبێرتۆ بۆلانۆ» بگرین کە وتوێتی تاکە دەرسێک لە ڤارگاس لۆسام وەرگرتبێت «چوونە دەرەوە و یۆگاکردنی بەرەبەیان» بووە، ئەمەش وەک گوزارشت کردنێک بۆ کوشتنی باوک، ئایا ئینسان کاتێک وائەڵێت کە هاوڕێیەکی بەتەمەنی پێش خۆی کاریگەریی قوڵی بەسەریەوە هەبووبێت؟

- بۆلانۆ نووسەرێکی گەنجی ئەمەریکای لاتینە کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هەموو دنیا دانا، بەداخەوە ئەمەش ئەوکاتە ڕوویدا کە مرد. ئەو نووسەرێکی گرنگ بوو کە چەند ڕۆمانێکی نایابی نووسی، هەرە باشترینیان لەوانە لای من «پشکنەرە دڕەکان»، نەناسراوترین ڕۆمانیشی

«ئەدەبی نازیی لە ئەمەریکا» یە، ئەمەیان جۆرێکە لە ئینسیکلۆپیدیایەکی خەیاڵی کە تاڕادەیەک بۆرخیسیشە. خۆشحاڵم کە ئەبینم بەرهەمەکانی بەم شێوەیە بڵاوبوونەتەوە.

دوای خەڵاتی نۆبڵەکە دەنگۆیەک هەبوو کە گوایە تۆ ستیگ لارشۆن کە لە دنیادا ناسراوە بە سێرڤانتیس و دۆنجوانت بەراوردکردووە؟

ـ هـ هـ هە، من هەرگیز شتی وام نەوتووە. من ئەوەندەم وت کە ڕۆمانە سیانییەکەی بێ ئەندازە خۆشە، بەڵام پێموانیە کە ئەوەی ئەو ئەدەبێکی گەورەبێت. ئەو لە ڕووی ناواخنی ئەدەبییەوە زۆر سەرکەوتووە، توشی سەرسوڕمانیش نابم کاتێک ئەبینم کتێبەکانی پێشوازییەکی زۆریان لێبکرێت. بێ مروەتییە بەرامبەر بە خۆم گەر بێت و من دان بەوەدا نەنێم کاتێک کە کتێبەکانیم خوێندۆتەوە پێمخۆش نەبووبێت.

بەدەر لە هەموو شتێک حەزم لە کەسایەتی لیسبێس سەلاندەرە. خەلقکردنی ئەم کچە سەوداسەرە، خەلقکردنێکی خودایانەیە بە تەنوورەیەکەوە، کچێکی دڵخۆش، نا تەنوورەی لە پیا نییە بەڵکە پانتۆڵی لەپیایە، خەلقکردنێکی تەواو بەهرەمەندانەیە. ئەو کەسایەتییە جۆرێکە لەو ئینسانانەی ئەم سەروەختەی ئێمە کە زۆر شتی هەیە لێیانەوە خۆی پێبناسێنێت. بەڕاست ئەی ڕەخنەگرانی سویدی چۆن پێشوازیان لە ستیگ لارشۆن کردووە؟

ئەتوانم بڵێم، بەو ڕادەیەش خراپ نەبوو وەک ئینسان پێشبینی ئەکات.

ـ پێمخۆشە لە دەمی تۆوە گوێم لەمە دەبێت. بیستومە کە گەشتکەران ئەچن ئەو جێگایانە ئەبینن کە لە کتێبەکانی ستیگ لارشۆندایە. بەداخەوە کاتێک کە من هاتمە ستۆکهۆڵم کاتی ئەوەم نەبوو ئەو جێیانە بچم.

ئەم جۆرە لە ئەدەب لەناو جەرگەی ئەو ئەدەبە بەناوبانگەدا ئەژی کە هەیە، هەروەک داستانەکانی ١٨٠٠ کان، بۆ نموونە وەک ئەوەی لە لای نووسەرێکی وەک ئەلیکسەندەر دوماس هەیە.

بەڵام ئەی بۆ سێرڤانتیس و دۆنکیخوت ئەڵێی چی؟

ـ هەموو ئەم ئەدەبە گەورە و ڕاستەقینانە بەڵگەیەکن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە سێرڤانتیس لەسەر حەق بووە: کە ئینسان ئەتوانێت لەیەک کاتدا هەم بەجدی بنووسێت و هەم بە شۆخیش بگێڕێتەوە. ئەمە تەنها لەسەروەختی ئێمەدایە کە ئەم دژەبەرکێ ساختەیەی دروستکردووە کە ئینسان ئەبێت بۆ ئەوەی سەرکەوێت باشترین کاری خۆی بکات. ئەمە وەک ئەو نەریتەی سرڤانتێس وایە، ئەو نەریتە گەورەیەی کە: تۆڵستۆی و دیکنز و ڤیکتۆر هیگۆ و ئەوانی تر هەیانبوو...

ـ من کاتێک ڕۆمانێک یان شانۆنامەیەک ئەنووسم، خۆم ئەدەمە دەست پێشبینی و فەنتازیا و بەتەواوی جەستەی خۆم و هێزی خۆمەوە کارئەکەم، هەروەها بە عەقڵ و شێتیشەوە ئەنووسم.

# سەردەم

ئەمەوێت ڤارگاس لۆسا بێنمە بەرچاوی خۆم کە لەبەردەم ئاسۆی تێڕوانینی بەر پەنجەرەی ژورێکدا لە قاتی چل و شەش هەمینی باڵەخانەیەکدا لە مانهاتن وەستاوە، سەرباری هەموو ئەم جوانی و پێشکەوتنانەی ناو ئەم دنیایە. بەڵام ئەو هێشتا سوتماکی تاریکییەک لەناویایەتی.

ڕەنگە ئەمە وێنەیەک بێت لە پاڵمەوە وەرگیرابێت؟وێنەی کەسێک کە بە عەقڵ گەشبینە و بە دڵ ڕەشبین.

## تێبینی:

Autofiction

جۆرێکە لە ژیاننامەی تێکەڵ بە خەیاڵ، ئەم زاراوەیە یەکەمجار لە ساڵی ١٩٧٧ لەلایەن نوسەری فەرەنسی سێرژ دۆبرۆڤسکی وەک دوو ستایلی ناکۆک بەیەک بەکارهاتووە، کە هەم ژیاننامە و هەم چیرۆکیش بووە.

- هەندێک کورتە بەشی ئەم چاوپێکەوتنە وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کە تایبەت بوون بە ئۆلۆف پاڵمە و سیاسەتی سۆسیال دیموکراتەکان لە سوید.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی داگز نیهێتەر بەشی کلتوری.

.DN, Kultur, 101204



# شارەکەم پێشکەش بە تۆ دەکەم

## "مارینا تێسوێ تایوا" ژنە شاعیری هەڵکەوتووی سەدەی بیستەم

**مارینا تێسوێ تایوا**
**لە فارسییەوە: لەیلا ساڵحی**

تێسوێ تایوا دەڵێ: "ئەگەر بەهەشتم بە مەرجی دەست شوشتنەوە لە نووسین بدەنێ، نامەوێ".

ئەوەی سەبارەت بەو شاعیرە سەرسووڕهێنەر دەنوێنێ ئەوەیە کە شان بە شانی هەول و تەقەللای بێ بڕانەوەی بۆ گەشەبەخشین بە لێوەشاوەیی و هەڵکەوتەیی، بە درێژایی ژیانی بەرپرسایەتی قورسی ژنانەشی لەسەر شان بووە. هەرچەند لە سەردەمی قەیرانی تەمەنیدا بۆ بەڕێوەبردنی کار و باری ژیانی کەوتە تەنگانەوە بەڵام ئەو ئەرکەی تا کۆتایی ژیانی هەر لەسەر شان بوو.

سەبارەت بە ژیانی مارینا ئەوەندەمان زانیاری لەبەردەستدایە هەتا بە دیتنی وزەی شاراوەی لە رادە بەدەری هونەرەکەی سەرمان سووڕبمێنێ. ئەو وەک منداڵی گەورەی پرۆفسۆرێکی هونەرە جوانەکانی زانکۆی مۆسکۆ، سەردەمی منداڵی خۆی لە کەش و هەوایەکی لێوانلێو لە دارایی و خۆشیدا رابوارد. بەڵام زۆری نەخایاند کە هێمنایەتی ماڵەکەیان تێکچوو. دایکی مارینا کە پیانۆژەنێکی کارامە بوو بە هۆی گیرۆدە بوون بە نەخۆشی ئازارە باریکەوە لەو جیهانە باری کرد. پاش مەرگی دایکی، مارینا پیانۆ ژەنین وەلا دەنێ و روو دەکاتە هونەری شیعر. ئەوەی لەو سەردەمەی ژیانی ماریندا جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەو وەک دایکی گرنگیەکی ئەوتۆی بە لایەنی ماددی ژیان نەدا، ئەگەرچی ئەو لایەنە رۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ساڵانی داهاتووی ئەودا هەبوو. ئەوە میراتی دایکی بوو کە بەو گەیشتبوو، هەر بۆیە بۆخۆشی سەبارەت بەو بابەتە دەڵێ :"پاش کۆچی دوایی دایکم تاقە رێیەک لە بەردەممدا ماوە، ئەویش شاعیرێتی یە".

هەژدە ساڵان بوو کە ناوبانگێکی بەرچاوی وەدەست هێنابوو. هەر لەو تەمەنەدایە کە کەسایەتی وەک"ماکسیمیلیان وولوشین" شاعیر و وێنەکێشی ناودار دێتە بازنەی هاوەڵانییەوە و دەبێتە یەکەمین

لایەنگری ئەدەبی مارینا.

هەر لە ویلای وولوشین لە کریمە لەگەڵ "سێرگێئی ئێفرۆن" شاعیر و نووسەری حەڤدە ساڵان یەکتر دەناسن و پاشان پێکەوە ژیانی هاوبەش پێک دێنن.

مارینا لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی خۆی وەک "ئۆسیپ ماندلشتایم و سوفیا پانۆک" پیوەندی گەرم و گوڕی بووە. ئەو هەروەها هۆگریەکی زۆری بە شیعری شاعیرانی وەک ئانا ئاخماتووا و ئەلکساندر بلووک هەبووە و تەنانەت بەشێکی زۆری شیعرەکانی بۆ ئەوان نووسیوە.

ژیانی تێسوێ تایوا پڕکەند و لەند و بەڵام پڕ لە بەرهەمی هونەریش بووە. ئەو هەر بە زوویی لە هاوسەرەکەی هەڵدەبڕی. ئێفرۆنی هاوسەری رەگەڵ ئەفسەرانی ئەرتەشی سپی دەکەوێ و مارینا و منداڵەکانی دەمێننەوە. مارینا لە لایەک خەریکی راپەڕاندنی کاروباری رۆژانەیە و لە لایەک خەریکی داهێنانی کاری هونەری و نوسینی شیعرە. هەر لەو بارەیەوە لە نامەیەکدا بۆ "بۆریس پاستێرناک" دەنووسێ "هیچ دەرفەتێکم بۆ بیرکردنەوە و ورد بوونەوە و رامان لە دیاردەکان نەماوە. شەو و رۆژ یەخسیری دەستی کاری رۆژانەم و زەین و مێشکم بە دەست ئەو کارانەوە پواوە. من هەر لە یادداشتەکانمدا خۆم دەبینمەوە و هەڵبەت لە پیاسە تاکەکەسیەکانیشمدا، کە ئەویش زۆر دەگمەن هەڵدەکەوێ پیاسەیەک بکەم. لە تەواوی ژیانمدا منداڵم بە باوەشەوە بووە و نەحەساومەوە".

مارینا تێسوێ تایوا هاو چاخی ئاخماتوا، ماندلشتایم و پاستێرناک، یەکێکە لەو چوار شاعیرە گەورەیەی روسیا کە  لە سەدەی بیستەمدا ژیاون. مارینا پێنج ساڵ دوای شورشی سوور، وێڕای کچەکەی شوڕەوی بەجێدێڵێ بۆئەوەی لەگەڵ مێردەکەی کەوێ، کە چوبووە ریزی لایەنگرانی ئەرتەشی سپیەوە. بەو شێوەیە پێی نایە هەرێمی دوورخرانەوەیەکی خۆویست. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی پێوەندی سروشتی خۆی لەگەڵ خوێنەرانی بپسێنێ.

"مەدمەک گوولین" ژنە شاعیری ئیرلەندی لە پێشەکی کتێبی "شیعری ژنانی جیهاندا "دەنووسێ : من رێزێکی زۆر بۆ توانایی و هەڵکەوتەیی "ئیمیلی برۆنتە" دادەنێم، بەڵام "تێسوێ تایوا" منی شێت و شەیدای خۆی کردووە. مارینا ژنێکە بە کچێکی جوانەمەرگ لە شەڕدا و کچێکی لە دەست قات و قڕی خەلەساوەوە، بە بوێری و دلێرییەکی زۆرەوە، لە سوچی مەدبەقەکەیەوە بەشێکی زۆر لە ئەدەبیات و نەمری بۆ خۆی داگیر دەکا. بریندار بوون و ژان چەشتن لە دەست شۆڕش و منداڵبوون، یان لە دەست هەردووکیان و دیسانیش هەر بە جێنەهێشتنی پێنووس و بەردەوام بوون لەسەر شیعر نووسین، پێویستی بە پشکووتنی رەسەنترین و راستەقینەترین بیر و زەینی شاعیرانەوە هەیە.

سەرەنجام لە ساڵی ١٩٣٩دا لەگەڵ کوڕەکەی کە سەردەمێک بوو پەڕیوەی وڵاتان ببوون دەگەڕێنەوە بۆ رووسیا. بەڵام وێڕای بنەماڵەکەی بە دژایەتی لەگەڵ رژێمی شووڕەوی تاوانبار دەکرێن. کوڕەکەی و مێردەکەی هەردوکیان دەستبەسەر دەکرێن و ئەویش لە ساڵی ١٩٤١ دا خۆی هەڵدەواسێ و کۆتایی بە ژیانی دێنێ. ساڵەهای ساڵ پاش مەرگی ناو و ناوبانگی سەرەتا لە ئامریکا و دواتر لە نیشتمانی خۆیدا و پاشانیش لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا رۆژ بە رۆژ پەرەیسەندو لە ساڵی ٢٠٠٠ دا وەک یەکێک لە دە مەزنە شاعیری سەدەی بیستەم ناودێر کرا.

## ((چەپکە شیعرێکی تێسوێ تایوا))

### راستەقینە دەزانم

راستەقینە دەزانم من-ئەوی دی هەموو ئەفسانەن!
هیچ گەلێک لە هیچ کوێی زەوین پێویستیی بە شەڕ نییە.
بڕوانن-وا خۆرنشینە، شەو خەریکە وردە وردە بەسەر دادێ:
چی شک دەبەن بیگێڕنەوە ئەی شاعیران، هۆ عاشق و جەنگاوەران؟

ئێستاکە با ئارام دەبێ و خاکی خاو شەونم دەپۆشێ،
تۆفانی ئەستێرەکانیش لە ئاسماندا ئۆقرە دەگرێ و
بەو زووانە ئێمە وێکڕا لە ژێر خاکدا وچان دەدەین
ئێمە کە لەسەر ئەو هەرگیز
دەرفەتێکمان بۆ ئارامش نەدا بە یەک.

ئێمە قەت لە دۆزەخ رزگار نابین

لە دۆزەخ قەت رزگار نابین، خوشکە دەردەدارەکانم
ئێمە لە شیلە رەشەکان دەخۆینەوە-
ئێمە کە لەسترانماندا خودامان ستایش دەکرد
بە تان و پۆی لەشمان،

ئێمە کە شەوەکانمان بە چەماوەیی لەسەر بێشکە
یا لە کاتی تەشی رستندا رانەبواردووە،
ئێستا لەسەر گەمیەکی گێڕ
بە ناو ئاوەکاندا وێڵین
بە توێی باڵتەیەکی بێ قۆڵەوە،

ئێمە کە بەری بەیانان جلکی حەریرمان دەپۆشی
ئێستا لە کوێ
سترانی خودایی بڵێین؟:

لە لای ئاگری خێوەتی چەتەکان!

(لای)ژنانی  جلک درووی هەرزەش
(ریسەکەمان بۆوە خوری)
سەماکەر و ئەکتەرە هەلە و هەرزەکانیش:
ئێمە کە شاژنی تەواوی جیهان بووین!

سەرەتا بە جلکی شڕ و دڕ داپۆشراو
پاشان بە تاجێکی پڕشنگدار لەسەر بسکەکانمانەوە
لە بەندیخانەو لە جەژنەکاندا
ئێمە بەهەشتمان لەکیس چووە
لە هەمبەر نیوە شەوە پڕ ئەستێرەکان  و
باخە سێوە بەهەشتیەکان.
خوشکە بەڕێزەکانی من، ئەی کیژۆڵە نەجیبەکان
بێ شک خۆمان لە دۆزەخدا دەبینینەوە.

## سێ شیعر بۆ ئانا ئاخماتوا

(١)

ئەی خاتوو خوای سەردوولکە؛* تۆ لە نێوخاتووخواکاندا جوانترینی
پڕشەنگدانەوەی شێتانەی شەوی سپی:
تۆ لە هەموو خاکی رووسیا، تۆفانێکت لە بەفری رەش هەڵکردووە و
گیانمان برینداری نێزەی گورچووبڕی سەردوولکەکانی ئەتۆیە.

ئاوەهایە کە ئێمە وەک  (ئەسپی لە مێخ یاخی)لغاو دەپسێنین و
چیها بەڵێنمان لەگەڵ بەستی —ئاخ!ئانا**
ئاخماتووا—ئەو ناوەی وەک ئاخێکی قووڵ
رۆدەچێتە قووڵاییە نەناسراوەکان.

ئێمەش هەڵبژاردەکانین چونکوو هەنگاو هەڵدەگرین
هەر کەس لەسەر ئەو زەوییەی تۆ هەنگاوت لەسەر هەڵێناوە؛
 لە ژێر ئاسمانێکی هاوبەشدا
هەر کەس لەگەڵ توانایی مەرگهێنی تۆدا هاودەردە،

نەمر دەژی —
لە ئەوپەڕی مەرگی خۆیدا.

لە شاری خۆش ئاوازی مندا، گومبەزەکان بە جوانی دەدرەوشێن
هەڵوەدای کوێر؛ خوای پڕ تیرێژی ئێمە ستایش دەکا.
من شارەکەم بە زامە بێ ئەژمارەکانییەوە پێشکەشی تۆ دەکەم
ئاخماتووا؛ وێڕای ئەویش: دڵم.

* خاتوو خوا هاوسەنگی وشەی «Muse»ە ؛ ئاماژەیە بۆ خاتوو خودای هونەر لە یۆنانی کەونارادا.

** ئاخ لە رووسیش دا «Akh» ە و بەشی یەکەمی ناوی شاعیرە مەبەستی تێسوێ تایواشە.

## دەنگت تاریکییەکی قووڵە
## ٢

راوەستاوم، سەرم لە ناو دەستەکانما، بیر دەکەمەوە
چ بێ بایەخن ئەو داوانەی بۆ یەکی دەنێینەوە
سەرم لە ناو دەستەکانما و سترانت بۆ دەخوێنم
لە دوایین ساتەکانی خۆرنشینەوە تا سپێدە.

ئاخ چ بەهێزە ئەو شەپۆلەی
کە منی کێشاوەتە سەر ترۆپکی خۆی
سترانی ستایشی ئەو کەسەی بێ هاوتایە لە ناوماندا
هەر وەکوو مانگ کە تەنیایە لە ئاسماندا.

ئەو کەسەی وەکوو سێرووبەک روو بە ئاسمانی دڵم هەڵدەفڕێ
سینگی هەورەکان هەڵدەدڕێ
بە دەنوکێکی هەڵۆیی و بە تووڕەیی مەرگاوییەوە:
تەنانەت میهرەبانی تۆش، مەترسی هەڵیدەگرێ.

چونکە شەوی بەرینی دەروونی خۆت راخستووە
لەسەر زێڕی بێ خەوشی کرێملین
گەروشم بە چێژی ئاواز دەگوشی
هەر وەک بە گوریسێکی ئەستوور...

بەڵێ دڵخۆشم من، قەت سپێدە ئاوا گەش دەرنەکەوتووە
درەوشاوەتر و رووناکتر لە ئێستای،
دڵخۆشم من، لە پێشکەش کردنی هەموو شتێک بە تۆ و
دوورکەوتنەوە وەکوو هەژارێکی داماو
چونکە من هەوەڵ کەس بووم کە پێشکەش تۆم کرد
ناوی خاتوو خوای شیعری"تزارسکوسلو"*
ئەی ئەو ژنەی، کە دەنگی تۆ
وەکوو تاریکایەکی قووڵ
رێی بە هەناسەم گرتووە!

*ئاخماتووا زۆربەی ساڵەکانی لاوەتی لە شاری میرنشینی تزارسکوسلو، نزیک شاری پێترزبۆرگ بردە سەر و هەر بەو هۆیەش جار ناجارێ سەردانێکی ئەوێی دەکرد.

## وەک منداڵێکی گرینۆک
## ٣

تۆ هەموو شتێکت گرتۆتە دەست،
تەنانەت خۆریش
لە دوورە دەست و لە مستتدا ئەستێرەکان رێک دەگوشی!
بریا بمتوانیبا لە دەرکێکی ئاوەڵاوە وەک شیبا
بشنابامەوە بە رووی تۆدا،

قسەشم کردبا بەزمانێکی پسک،
بە روخسارێکی داگیرساو لە شەرمەوە
بمتوانیبا سەرم داخەم لە رووی تۆدا و
فرمێسکەکان داوەرێنم وەک منداڵێکی گرینۆک
بۆ گەیشتن بە لێخۆش بوون.

# چوار شیعر بۆ ئەلیکساندر بلووک

(١)

ناوت باڵندەیەکە لە دەستما
لەتێک سەهۆڵ لە سەر زمان
وەک بزووتنی لێوەکان بۆ ماچ
ناوی تۆ پێنج نیشانەیە.
تۆپێکە لە بەرزاییەوە دەکەوێتە ناو دەستەوە
تامی گەڵای داری لەعلە لەناو دەمدا.

ناوت زایەڵەی بەردێکە لە ئەستێرێکی مەنددا
ئەو دەنگەیە لوول دەخوا لە زەنازەنای سمکۆڵی تاریکیدا
بەرز وەک هەورە تریشقە
کە راستەوخۆ روو دەکاتە تەوێڵی من
توند و تیژ هەروەکوو دەنگی پەلەپیتکە.

ناوت ماچێکی زۆر دوورە
لەسەر رەشایی چاوەکان، تەڕ و گەش
لە پەنا پێلوو گەلێکی کراوەی بێ جووڵە
ناوت ماچی کلوو بەفرێکە
چۆڕێکی فێنکی جۆبارێکی بەهاری،
شین هەر بە چەشنی کۆترێک
نزیکترین وشە لە ناوی تۆ"خەوە.

(٢)

لە خاکی وەتەن لە مۆسکۆ- ئەو شوێنەی کە گومبەزەکان دەدرەوشێنەوە*
لە خاکی وەتەن لە مۆسکۆ- لە زەنازەنای دەنگی ژامەکاندا
لەو شوینەی من تێیدا دەژیم- قەبرەکان بە ریز لە تەنیشت یەک هەڵکەوتوون
لە ناویاندا قەیسەر و ژنەکانیان راکشاو.

تۆش نازانی کە چلۆن بەرەبەیان — ئەوە تەنیا کرێملینە
لە سەرانسەری گۆی زەویدا هەوایەکی هەیە بۆ هەڵمژین.

تۆش نازانی چلۆن هەموو بەربەیانێک لە کرێملین
دووعات بۆ دەکەم هەتا کازیوەی ڕۆژێکی تر،

وێڕای تۆ هەنگاو هەڵدەگرم — هەتاکوو قەراخ چۆمی نوای خۆت**
چۆمی مۆسکۆش — لەولای ترمەوە خوڕەی دێ
راوەستاوم ئێستا لێرە، شەلاڵی خەیاڵ، بە سەری شۆڕەوە و
ریزی چرای شەقامەکانیش- دەبریسکێتەوە لە ئاوی چاوما.

خۆشم دەوێی بە قەت هەموو ئەو شەوانەی هەتا سپێدە بێ خەوم و
گوێت لێدەگرم لە سەرانسەری ئەو شەوانەدا کە تا بەیانی ناخەوم.
تا ئەو ساتەی لە سەرانسەری کرێملیندا
ئەو پیاوانەی کە ژامەکان وەدەنگ دێنن — لە خەو رادەبن و چاویان هەڵدێنن.

سەرەڕای ئەوەش رووباری من و —رووباری تۆ
وێڕای ئەوەش دەستی من و دەستەکانت
هەرگیز ناگەنە یەکتری — تا ئەو ساتەی
سپێدەیەک دەگاتە سپێدەیەکی دی.

*دوو دێڕی یەکەم و بەشی کۆتایی ئەو شێعرە، ئاماژەیەکە بەو پاڕانەوە و دووعایانەی لە کڵێسای ئۆرتۆدۆکسدا باون.

**چۆمی نوا :شاری شوێنەزای بلووک:سەنت پێترز بوورگ بوو.

(٣)
پێیان وابوو کە مرۆڤە
جا بڕیاریان دا بیکوژن.
ئێستا کە ئەو مردووە،
تا هەتایە بگرین و شیوەن بگێڕن بۆ فریشتەیەکی مردوو.

لە دەمەدەمی خۆرنشیندا،
ئەو سترانی جوانی چڕی
ئێستە تیشکی گڕی سێ مۆم
بە لەرینەوەی وەهماوییەوە،

تیشکی گەرمیش لەوپەڕی کولووی بەفرەوە
لەوەوە سەرچاوە دەگرن.
سێ مۆمی داگیرساو
روو بە هەتاو،
وەکوو چەپەری رووناکی.

ئاخ، بڕوانە پێڵوەکانی
چۆن دەوەرن،
ئاخ، بڕوانە باڵەکانی
چلۆن دەشکێن.

شینگێڕی رەشپۆش دەنگی هەڵدەبڕێ
فاتیحاخوێنەکان بێ خەم، رادەبرن
شاعیر ئۆقرەی گرتووە لەناو هەمێزی مەرگدا و
هەستانەوە و راسانی خۆی کردۆتە جەژن و هەڵپەڕین.

(٤)
بڕوانە ئەوێ، ئەوە ئەوە، وەڕەز و ماندوو لە وڵاتانی بێگانە
رێبەرێک بێ پارێزەری تاکە کەسی.

لەوێ، ئەمە ئەوە، کە جۆباری کوێستان لە دەستەکانیدا دەنۆشێ
شازادەیەک بێ وڵاتی دایی و بابی.

لەوێ لە هەرێمی پیرۆزی خۆیدا، ئەو خاوەنی هەموو شتێکە
بە سوپا و نان و دایکەوە.

میراتەکانی تۆ جوانن
حوکمات بکە ئەی هەڤاڵ، بە دوور لە هەڤاڵەکانت.

## سەراپا گوێم

سەراپا گوێم بۆ بیستنت
زیت و وریا وەکوو دایکێک کە لە خەودا
لە ژێر سەری ساوای نەخۆش دەم بە چپە
هەر ئەو جۆرەی لە باوەشی تۆدام من، تا سپێدە.

خوێنم لە ژێر پێستەوە بانگ دەکاتە دڵی تۆ و
لە ئاسۆیەکەوە تا ئاسۆکەی تری ئاسمانم
دەربەدەری دیتنەوەی دوورگەی ئەوینن و
بەرەو تۆ دەخوشێن
رووبارەکانم.

من دەتارێم بەرەو لێژێک
وەک ئەو پلیکانەی دەگاتە باخێک
بە دوور لەو تابلۆیەی مەوداکان نیشان دەدا.

ئەستێرەکان شێتی زەوی و
لە سەر کێلەکان، ئەو شانازیانەی بە رەنجەڕۆیی دەست کەوتوون،
شێتی شەکانەوەی ئاڵا
لەوێ، کوندێک لە حەسرەت کاولاشەکاندا.

منیش بە هەڵەداوان رووە و خوار
دەچەمێمەوە بە رووتدا، وەک چەمانەوە بەسەر کێلێکدا و
رابردووی خۆشم دەنێژم
بە لێوەکانم دەگەڕێم بە شوێن لێوەکانی تۆدا
وەک کانییەکی هەڵقوڵێو.

## ئەو کاتانەی دەڕوانمە هەڵفڕینی گەڵاکان

ئەو کاتانەی دەڕوانمە هەڵفڕینی گەڵاکان و
ڕچەی کەوتنیان تا ئاستی عەرزی
دەیانبینم کە-با-وایان ڕادەماڵێ
دەڵێی هونەرمەندێکی لێهاتووی شێوەکارە
کە سەرەنجام ڕەسمەکەی تەواو کردووە،
ئەو دەمە بیر دەکەمەوە:[لەو کاتەشدا هیچ ڕێبوارێک پێی خۆش نییە
بڕوانێتە شێوەی ڕاوەستانی من و
ڕوخساری پڕ لە ئەندێشەم]
چون گەڵایەکی زەرد و وشک هەڵاتوو
بەجێماوە
بە سەر لقێکی دوورە دەستەوە.

## یەکێک لە باپیرەکانم

یەکێک لە باپیرەکانم ویۆڵۆن ژەنێک بوو
هەروەها ڕێگریش...
ئاخۆ ئەوە پاساوێکە بۆ سروشتی سەرگەردانم و
بۆ بۆنی بسکم کە بەدەم شەماڵەوە دەشەکێ؟

قژ ڕەش و لووت لە چەشنی دەنووکی هەڵۆ، هەر خۆیەتی
کە قەیسی لە داشقە دەدزێ،
بە دەستەکانی من! بەڵێ ڕاست خۆیەتی
چارەنووسی من دەئاژوێ.

سەرقاڵی تەماشای ئارەق ڕشتینی ورزێرە، بە ڕوانینی پڕ ستایش
دایمە گوڵێکی نەستەرەن لە لێوەکانیا دەگەڕا
هەواڵێکی نالەبار بوو
ئەویندارێکی ڕەسەنیش بەڵام
زۆری قەنەنەکەی خۆش دەویست، مانگی نیوە شەوان و تەسبێحەکەشی
هەروەها هەموو ئافرەتە جوانەکانی جیرانی...

من پێم وایە خوێڕیش بووە
باپیرە چاوکاڵەکەی من.

دەترسا لە پیاسەی نیوەشەوانی ناو گۆڕستان
چون رووحی خۆی فرۆشتبوو بە شاییەک و
بێ شک بەردەوام خەنجەرێکی پێبوو
شاراوە لە چەکەمەکەی دا.
زۆر جار سیپەی دەگرت لە پەنا و پەسیوان
وەک پشیلەیەکی بریقەدار
من جاری وایە دڕدۆنگم لەوەی
کە ئاخۆ بە راستی دەیزانی ویۆلۆن بژەنێ؟

بەڵام دڵنیام کە لای ئەو
هیچ شتێک لە بەفری تواوەی پار بە بایەختر نییە.

بەڵێ ئاوەها بوو باپیرە گەورەی خاوەن شکۆی من
ئاوەهاشە ژنە شاعیرێک کە منم.

## دڵخۆشم لەوەی رەنجی تۆ

دڵخۆشم لەوەی رەنجی تۆ بۆ من نیە و
رەنجی منیش بۆ تۆ نیە
زۆر شادیشم لە زانینی ئەو راستییە.
کە عەردی رەق، هەرگیز لە ژێر پێمان ناخزێ و
دەتوانین ئاسوودە بژین لە پەنای یەک، بە بێ ترسی چاوەدێری وشەی یەک و
بە بێ خۆفی، خنکان لەو شەپۆلە سوورەی تا بنان گوێمان هەڵدەستێ
ئەو کاتەی کە قۆڵی کراسەکانمان لە یەک دەخشێ.

دڵخۆشم لەوەی بە ئارامشەوە دەڕوانمە تۆ
ئەو دەمەی وا لەبەر چاوم ژنێکی تر دەگرێ ئامێز
بەبێ ئەوەی بتەوێ خەفەتبارم کەی، هەروا کە تۆ ئاور ناگری
ئەوکاتانەی ئەمن پیاوێکی دیکە ماچ دەکەم.

دەزانم قەت، نە شەو، نە رۆژ
ناو و رووحم ئەویندارانە بانگ ناکەی
هیچ دەنگێکیش لە بێدەنگی زاڵی ناو کڵێسادا
سترانی پیرۆزی پاکبوونەوەمان بۆ ناچڕێ.

سوپاس بۆ تۆ و بۆ خۆشەویستی بێ درۆت
چونکە تۆ هەست بە عەشق دەکەی، ئەگەرچی یەستا نایناسی
سوپاس بۆ تۆ و ئەو شەوانەی کە من تێیدا بە هێمنی و ئارامییەوە رامبوارد
سوپاس بۆ تۆ و پیاسەکانی ژێر پرشەنگی مانگە شەو
تۆ دەستت لە من هەڵگرت و لە ژووانەکانی نیوە شەو، کە قەت دووپات ناکرێنەوە.

سوپاس بۆ تۆ، هەتاو هەرگیز دەستی پیرۆزی بە سەرماندا ناهێنێ
سوپاسە خەمینەکانی دڵی شێواوم وەرگرە
چونکە
نە رەنجی تۆ لە بەر منە و
نە رەنجی منیش لە بەر تۆ.

## سەر هەڵدێنی

سەر هەڵدێنی و لووتت بەرزە چونکە
لە خۆبایی و قسە زلی.
زستانی ئەو ساڵ
هەڤاڵێکی سەرەڕۆی بە دیاری بۆ من هێناوە!

من بە دەنگی خرینگە خرینگی بازنەکانم و
تۆش بە دەم مژ لێدانی هێور لە جگەرەکەت
لە شاری شوێنەزای مندا پیاسە دەکەین و دەگەڕێین
وەک گەڕۆکە بیانییەکان!

منیش ئەی پیاوی جوانی شۆڕە لاو!
قەت لێت ناپرسم: دەستی دلۆڤانی چەند ژن
برژۆڵە درێژەکانتی لاواندۆتەوە و

لێوە تینوەکانی چەند ژن لێوەکانتی راماوسیوە .

خۆشەویست بەتینی تۆ
ئەو کەڵکەڵانەی بە تێکڕا بەزاندووە .
ئێستا دەتوانم شانازیت پێوە بکەم، ئەی پیرۆزە بچووکەکەم
هۆ کوڕە ساکارە دە ساڵانەکە!

لێگەڕێ تاوێک لە رۆخ رووبار راوەستین
کە لە ئاوەکانیدا
تەسبێحی دەنگ زێڕینی چراکانی شەقام دەشواتەوە: ئینجا هەتا دوورە دەستەکانت دەبەم:
تا گۆڕەپانێک کە نیشاندەری حوزووری قەیسەرە مێر منداڵەکانە .

رێگە دەبڕی بە دەم فیتوو لێدانەوە، وەکوو مێرمنداڵێکی کاڵی بێ خەم
بەڵام دڵت لە مستتدا
ئەی ئەوینە سنوور بەزێنەکەم!
ئێستا بڕۆ-تۆ ئازادی-خودا ئاگادارت بێ.

## گەڵاش تامی شەو دەدا

کاتی شەوە لە شارە گەورەکەی من
ماڵە خەوتووەکەم جێ دێڵم
خەڵکیش رەنگە ئەمن بە کیژێکی عازەب یان بە ژنێک بزانن
بەڵام بیرێک لە زەینی مندا ناگەڕێ، جگە لە شەو

شنەی هاوین ئێستاکە رێگەم بۆ دەکاتەوە
لە پەنجەرەیەکی دوورەوە دەنگی مووسیقا دێ
دەڵێی هەتاکوو سپێدە دەشنێتەوە ئەو شیبایە
لە دەروونی تەنگ و نووتەکی سینگمدا.

چنارە رەشەکان، پەنجەرەکان، لێورێژی نوور.
دەنگی مووسیقا لە باڵەخانە بەرزەکانەوە و چڵە گوڵێک بە دەستەوە .

بڕوانە هەنگاوەکانم-هاوڕێی هیچ کەسێک ناکەن
بڕوانە سێبەرەکەی من-هیچ شتێکی لە من ناچێ.

چراکان لە دەنکە تەسبێحی زێڕین دەچن
گەڵاش تامی شەو دەدا لە دەمما.
رزگارم کەن لە سنوورەکانی رۆژ،
هەڤاڵانم! بڕوا بکەن: من هیچ نیم
جگە لە خولیایەکی رازاوە لە زەینی ئێوەدا.

گوێچکە ماسی بە زایەڵەی ئووقیانووسەوە

رەش وەک رەشایی گلێنە
کە رووناکایی هەڵدەمژێ،خۆشم دەوێ وریایی و چالاکیت!
ئەی شەو! یەکەم دایکی هەموو ئاوازەکان! دەنگێکم پێ ببەخشە با مەقامەکەت بخوێنم
لغاوی هەموو-با-ی دونیا لەوێدایە: لە ناو قامکەکانی تۆدا.

ئەو کاتەی بە دەم هەراوە، وشەی پڕ لە ستایشت پێشکەش دەکەم، ئەمن هیچ نیم
جگە لە گوێچکە ماسییەک کە ئێستاش زایەڵەی ئوقیانووس لە ناخیدا دەنگ دەداتەوە.

بەڵام من ماوەیەکی زۆرم لە چاوەکانی مرۆڤ روانیوە
ئێستا ئەی خۆری مەیلە و رەش، ئەی شەو!بمکە بە تۆزێک خۆڵەمێش.

## پەنجەرەیەک لە شەودا

پەنجەرەیەکی تر
بە شەونخوونی کێشانی ترەوە!
رەنگە ئەوان شەراب بخۆنەوە
رەنگە هەر دانیشتبێتن
یان رەنگە دوو دڵدار بن کە ناتوانن دەست لە یەک بەردەن.

هەر ماڵەی پەنجەرەیەکی ئاوای هەیە.
پەنجەرەیەک لە شەودا: لێو ڕێژ لە زایەڵەی ژوان یان لێک دابڕان
ڕەنگە رووناک داگەڕابێ بە نووری شەوچراکان
یان تەنیا روون بێ بە نووری لەرزۆکی مۆمەکان.
بەڵام لە هیچ کوێ بیری ناحەسێتەوە، چونکە
لە ماڵی منیشدا
ئەو خۆزگانە رووحیان وەبەر دێ.

ئارەزووی ماڵێکی زیندوو
شان بە شانی یارەوە و پەنجەرەیەکی رووناک.

"لە شەونخوونییەکان"

هەر بەو شێوەی خۆشم دەوێ
رامووسینی دەستەکان و
ناوبردنی هەرچی هەیە،
خۆشیشم دەوێ
کردنەوەی دەرگاکان!
ئاوەڵا لەسەر گازی پشت بە رووی تاریکایی شەودا!

تەوێڵ لە تاریکی دەسووم
هەر بەو جۆرەی کە گوێ دەدەمە
ئەو هەنگاوە بەرزانەی وردە وردە دوور دەکەونەوە
یان(گوێ دەدەمە)با کە رادەژێنێ
ئەو دارانەی کە خەوتوون
یان شەونخوونی دەکێشن.
ئاخ، شەو
رووبارە بچووکەکانی ئاو دەخوشێن و
سەر دەخەنە سەر سینگی خەو
(پیڵوەکانم قورس دەبن)
لە جێگەیەک لە شەودا
کەسێک خەریکە دەخنکێ.

نەشتەر لە دەمارم دەدەم

نەشتەر لە دەمارم دەدەم
ژیان
هەڵدەقوڵێ
بەردەوام و
ناچار
هەموو ئەو جام و پیاڵانەی
ریزم کردوون
لێورێژ دەکا و
ئەوسا
دەڕژێتە سەر تەوێڵی
خاکی رەش
هەتا بەردەوام و ناچار
هەڵقوڵێ و
فوارە بکا
کانی شێعر..

## میراتگری ژان*

هەورگەلێکی بێ ژمار- لە دەوروبەری ئێمە
گومبەز گەلێکی بێ ژمار —لە دەوروبەرمان
سەرتاسەری رووسیاش
پێویستی بە دەستی لە رادە بەدەرە!
وەک نەمامێک هەڵت دەگرم
یەکجار بارسووکم بە تۆوە.

لەو بازێڕە سەیرەدا
لەو بازێڕە هێورەدا
هەروا سەرخۆش دەمێنمەوە

تەنانەت پاش مردنیشم.
تۆ دەبیە میراتگری تاج و تەختی من
یان رەنگە میراتگری ژان و رۆژە رەشیەکان.
چونکە تۆ نۆبەرەی منی!
رەچاو بکە ئاکار و رێ و رەسمە ئاینییەکان
لە قووڵایی دڵتەوە و
شانازی بە مۆسکۆ بکە، بە شاری کڵێساکان–
بە پێیان رابورە بە سەرانسەری ئەو حەوت تەپکە بێ پەرژینەدا**
بە هەنگاوە بەرز و بوێرەکانتەوە.

نۆرەی تۆش دێ
تۆش مۆسکۆ دەکەیە خەڵاتی کچەکەت
بە ناڕەزایەتییەکی خۆشەویستانەوە.
هەر وەکوو ئەوێیان بە من بەخشی
ئەوانەی بۆ هەمیشە لە گۆڕستانی (واگانوکوو)***دا رازان
ئەو هەمیشە خەوتوانەی گۆڕستانی (واگانوکوو)
لەگەڵ دەنگی ژامی کلیساکان
لە کازیوەی رۆژی وادەدا.

*تێسوێ تایوا ئەو شیعرەی بۆ ئالیای کچی گوتووە. ئالیا دوو مانگ پاش گەڕانەوەی دایکی بۆ رووسیا دەزگیر دەکرێ و ماوەی ١٧ساڵ لە ئۆردووگای کاری زۆرە ملێ زیندانی دەبێ.

**لێرەدا مەبەست رۆژووی چللە و خۆپاراستن لە رەنگ کردنەوەی برۆیە.

***واگانوکوو گۆڕستانێکی بە ناوبانگی مۆسکۆیە کە دایک و باوکی تێسوێ تایوا لەوێ نێژراون.

## خەڵات*

جوان و غەریب، ئەی برالە شۆخەکە لێمی وەرگرە
ئەو شارە، کە دەستکردی هیچ دەستێک نییە!

کڵێسا بە کڵێسا گومبەزەکانی و
ئەو کۆترە باریکانەش کە لە سەریانەوە هەڵدەفڕن.

لێم وەرگرە (سپاسکی گەیت**)بە گوڵەکانییەوە
ئەو شوێنەی ئۆرتۆدۆکسەکان کڵاو لەسەر لادەبەن و

میحرابی ئەستێرەکانیش کە داڵدەی ئەهریمەنە
بە عەرزەکەیەوە کە بەماچ تیف تیفە دراوە

پیری پیرۆز و تاقانە، ئەی هەواڵی پیرۆز لێم وەرگرە
گومبەزە پێنجینەکەی کڵێسای گشتی.
وەک میوانی هەرێمێکی دیکە
دەتبەم بۆ زیارەت میحرابی کڵێسای(ئینا دۆرتێنت جووی***)
ئەو جێگایەی گومبەزە درەوشاوە زێرینەکان
لەبەر تۆ دەدرەوشێنەوە و
زامە هێسییەکان دیسانەوە وەک هەور دەگرمێنن،

لەوێ مەریەمی پیرۆز چارۆکەکەی بەسەر شانی تۆدا دەدا
لە سەر هەورە ئەرخەوانییەکانەوە

تۆش لێو رێژ لە هێزە ئەفسانەییەکان، رادەبی و
ئیتر لە مەودوا قەت پەژیوان نابیەوە
لەوەی منت خۆش ویستووە.

*ئەم غەزەلە بۆ ماندلشتایم نووسراوە کە خۆی لە سەنت پێترزبۆرگ دەژیا و تێسوە تایوا مۆسکۆی زێدی پێشکەش دەکا.

**پێنج کڵێسای گشتی لە کرێملین

***پەیکەرەیەکی سەرسوورهێنەری مەریەمی عەزرایە کە لە نزیک کرێملین هەڵکەوتووە.

## شارەکەی خۆم، مۆسکۆ

ماڵەکەی تۆ
چ میوانخانەیەکی مەزنە مۆسکۆ!
هەموو گەلی رووسیا بێ خان و لان بوون،
هەموو ئێمەش دەبێ پەنا بێنینە بەر تۆ.

بە داخی پڕ لە شوورەیی بە پشتمانەوە و
چونکە تۆ خۆت بەرەو لای خۆتمان بانگ دەکەی
هەرچەندە زۆری لێ دوورین،

چون مەڵحەمی داغەکان و
دەوای دەردەکانی ئێمە
لێرەیە، لە
"چایلّد پانتلیموون"*
لە پشت دەرگایەکی بچووکەوە، لەو شوێنەی حەشیمەت
پوورە دەدەن
وێنەی"ئیورسکی"**هەڵواسراو-
سوور و زێڕین و پڕشەنگدار.

سێڵاوی بەزەیی خودا
بە پێدەشتە گەرمەکان وەربووە
دەچەمێمەوە و ماچ دەکەم
سینگی درەوشاوەت شارەکەی خۆم، مۆسکۆ!

*ئەو پیرۆزەی کە کڵێسای ئۆرتۆدۆکس ستایشتی دەکا و بە بڕوای خەڵکی رەشۆکی شفای نەخۆشان دەدا.

**پەیکەرەیەکی مەریەمی عازرایە کە شوێنی ستایشت و میحڕابی تایبەتی بۆ چێ کراوە و لە ساڵی ١٨١٢ دا بۆ شاری ولادیمیر راگوێزرا.

## یەکە یەکەی گومبەزەکان

لە سەر ئەو شارەی کە پێترِی مەزن* خستیە پشتگوێ (درۆی لێکرد)
گرمەی ژامەکان دەنگ دەدەنەوە.
شەپۆلێکی پڕ خرۆش پاشەکشە دەکا ئێستا
لە بەرانبەر ئەو ژنەدا کە تۆ دەیخەیە پشتگوێ (درۆی لێدەکەی)

ستایشتی ئەتۆ و پێترِی مەزن دەکەم
هەرچەند ژامەکان لە هەردووکتان راوەستاوتر دەبن و

هەر گرمەیان لە ئاسمانی شیندا دەنگ دەداتەوە
هیچ گومانێک لە گەورەیی مۆسکۆ ناکرێ
چون یەکە یەکەی گومبەزی کڵێساکان
قاقایان دێ بە لووت بەرزی قەیسەرەکان.

*پێترِی مەزن (١٦٨٩-١٧٢٥) بناخەدانەری پێترزبۆرگە و بەجێی مۆسکۆ ئەو شارەی کردە پایتەختی رووسیا.

## لە سپی و سوور، هەر هاوارێک دەبیسترێ

لە وڵاتی قووەکانەوە
کارگی بچووک، بۆلتووسی *سپی، دڵخوازم
سەمای مەزرا و سروودی رووسیا بە سەری دا دەنگ دەداتەوە،
فریام کەون توانای راوەستانم نییە
رەنگی خوێن بەرچاوی گرتووم:
لەو بەرەوە دەمەکان ئاوەڵا
جۆگەلەی باریکی خوێن لە گۆشەی دەمەکانەوە چۆڕاوە و
هەر بریندارە ناڵەیەکی لێوە دێ:
-ئاخ دایە گیان!
ئەوان هەموویان وەک یەکن
بە بێ هیچ جیاوازییەک،

هەموویان هاتوون بە شەڕ بێن
بەڵام کامیان سەر بە باڵی منن؟ کامیان لە باڵی دژ بە من؟
ئەم پیاوە هی ئەرتەشی سپی بوو......ئێستا چۆتە پاڵ ریزەکانی "سوور"ەوە
خوێنی رژاوی "سوور"ی کردووە
ئەوەیان سەر بە ئەرتەشی "سوور" بوو......ئێستا لەگەڵ سپییەکانە
مەرگ سپیایی خۆی پێ بەخشیبوو.

بەم شێوەیە لە راست و چەپ
لە پاش و پێش
لە سپی و سوور، هەر هاوارێک دەبیسترێ
ئاخ دایە گیان!

بێ داڵدە و بە بێ تووڕەیی
هاوارێکی دوور و درێژ و بێ وچان
ناڵەیەک کە دەگاتە حەوێقی ئاسمان:
ئاخ دایە گیان!

*بوولتووس جۆرێک کارگی گەورەی گۆشتییە کە چەندین رەنگی هەیە و هەندێکیان دەخورێن.

## (بۆ بۆریس پاستێرناک)

## شاعیر

ئەوان زیادین لە سووچ و قوژبنی ئەو دونیایەدا دەژین
وەبەر چاو نایەن، تەنانەت لە دەفتەری رێنوێندا
ناویان نییە و
حەیفە نان و ئاو و ماڵ و ژیان
بۆوان.

چەند بوونەوەری نابووتە، شیاوی پاڵ پێوەنانن
لە ئەلفەوە نایەنە بێ، بێدەنگ و گێژن چەشنی ریخ
پەنجەیەکن پڕیان داوەتە داوێنی پڕ لە شانازی ئێوە
قوڕ و چڵپاوێکی خەیاڵین لە ژێر تەگەری ماشینەکانتاندا.

ئەوان ئاوان، بە چەشنی نسێی نەبەدی
بە دیاردەی تایبەت بە خۆیانەوە، وەکوو برینی گوڵەکان
ئەو کەسانەن وەک ئەیووب و بەسەبرتر
چەشنێکی وا ئەیووب ئێرەییان پێ دەبا.

ئێمە"شاعیر"ین دەنگی وشەی دەرکراومان بە دواوە
سەرەڕای ئەوەش لە بەستێنەکانی خۆمان تێپەڕیوین
ئێمە بوێری کێشە لەگەڵ پلەوپایەی خوداییمان هەیە
بوێری رقەبەری لەگەڵ خواژن و مەریەمی پیرۆز
لەگەڵ خودی خواش تەنانەت.

## خۆشت دەویستم

خۆشت دەویستم و درۆکانت راستۆکی تایبەت بە خۆیان هەبوو
هەر درۆیەکت راستەقینەیەکی تێدا بوو
ئەوینی تۆ گشت سنوورەکانی بەزاند
بە شێوەیەک کە ئیتر کەس نەیگەیشتێ.

پێم وابوو کە ئەوینی تۆ
زۆرتر دەخایەنێ لە خودی زەمان
ئێستە دەستم لێ هەڵدێنێ بە نیشانەی ماڵئاوایی-و
لە ناکاوێک عەشقت بە من کۆتایی دێ و
راستەقینەش تەنیا لەو پێنج پیتەدایە-.

## سەرچاوە:

تسوەتایوا،مارینا (١٣٨٠) مارینا تسوەتایوا شاعرەی برگزیدە قرن بیستم،ترجمە:فریدە حسن زادە،تهران:انتشارات نسیم دانش

# زیندە بەچاڵ



**سادقی هیدایەت**
**لە فارسییەوە:یونس رەزایی**

پشوم دەبڕێ، فرمێسک لە چاومەوە سەرڕێژ دەکا، دەمم تاڵە، سەرم لە گێژەوە دێ. دڵم گیراوە، لەشم شەکەتە، داهێزراو و شل و شەوێقم، بێ ویستی خۆم لە نێو نوێنەکاندا کەوتووم، مەچەکم بە دەرزی ئەنژکسیۆن کوتراوە. جێ و بانەکە بۆنی ئارەقە و یاوی لێدێ. دەڕوانمە ئەو کاتژمێرەی لەسەر چرپا بچووکەکەی تەنیشت جێ و بانەکە دانراوە. کاتژمێر دەی رۆژی یەکشەممەیە. دەڕوانمە میچی دیوەکە؛ گڵۆپێکی پێوە هەڵواسراوە. چاوم بە هەموو سووچەکانی وەتاغەکەدا دەگێڕم. کاغەز دیوارییەکە گوڵ و شەتڵی سووری پێوەیە. ناو بە ناویش ئەو دوو باڵندە رەشەی کە رووبەڕووی یەک لە سەر لقێک هەڵنیشتوون، یەکیان دەنووکی دەکاتەوە، دەڵێی لەگەڵ ئەوەی دی دەدوێ. ئەو وێنەیە رامدەپەڕێنێ، نازانم بۆ، بۆ هەرلایەک وەردەسووڕێم هەر لەبەر چاومە. سەر مێزی وەتاغەکە پڕە لە شووشە و فتیلە و قودیلکەی دەوا و دەرمان. بۆنی ئەڵکۆڵی سووتاو و بۆنی هۆدەی نەخۆش بە وڵاتدا بڵاوبۆتەوە. دەمەوێ راست بمەوە و پەنجەرەکە بکەمەوە، بەڵام بێ وازییەکی سەیر لە سەر جێ و بانەکەم بەستوومیەوە، دەمەوێ جگەرەیەک داگیرسێنم، ئیشتیام لێ نییە. دە دەقیقەیەک تێناپەڕێ. ریشم تاشی، هاتمەوە و لە نێو جێگاکەمدا کەوتم.روانیمە ئاوێنە، خۆم زۆر کز و لاواز هاتە بەرچاو. بە زۆر بە رێگادا دەڕۆیشتم. وەتاغەکە شپرزە و تێکەڵ و پێکەڵە، من تەنیام.

هەزار بیری سەیر و سەمەرە لە کەللەمدا دەسووڕێنەوە، دێن و دەچن، هەموویان دەبینم، بەڵام بۆ نووسینی بچووکترین هەست یان بچووکترین خەیاڵی سرک، دەبێ تێکڕای ژیانی خۆم لێک دەمەوە و ئەوەش ناکرێ، ئەو بیرانە، ئەو هەستانە، سەمەرەی کەرتێک لە ژیانی منە، سەمەرەی شێوەیەک ژیان و بیری بە میرات وەرگیراوە، لەوەی کە دیتوومە و بیستوومە و خوێندوومەتەوە و

هەســـتم پێکردووە یان هەڵمسەنگاندووە . تێکڕای ئەوانە وجوودی خەیاڵاوی و هیچ و پووچی منیان پێک هێناوە .

لە جێیەکەمدا دەتلێمەوە، یادداشـــتەکانی ناو بیرەوەریم دەشـــێوێنم، بیرە ئاڵۆز و شـــێتەکان زۆر بۆ مێشـــکم دێنن. پشـــتە ســـەرم وەژان دەکەوێ. چڵ دەدا، گۆناکانم سوور بوونەوە، وێک دێم. لێفەکـــە دێنمـــە بەر چاوم. پێم وایە ماندوو بووم، چ خۆش بوو بمتوانیبایە کەللە ســـەرم لێک بڵاو کەم و تێکڕای بەشی خۆڵەمێشی پێچاوپێچی کەللەی خۆم دەربێنم و فڕێی بدەم. بیخەمە بەردەمی سەگەل.

کەس ناتوانێ لەوە ســـەرەندەر بکا. کەســـێ بڕوا ناکا. بە یەکێ کە دەســـتی بە هیچ کوێ ڕاناگا دەڵێن بڕۆ ســـەر بنێوە و بمرە . بەڵام ســـاتێ کە مەرگیش پیاو وەخۆ ناکا، ساتێ مەرگیش رووی لە پیاو وەردەگێڕێ، مەرگێ کە نایە و نیازی هاتنیشی نییە ...!

هەموان لە مەرگ دەترسن و من لە ژیانی قۆشمەی خۆم.

زۆر ناخۆشـــە، دەمایەک کە مەرگیش بە پیاو رازی نەبێ و وەلات نێ! تەنیا شـــتێک دڵخۆشـــم دەکا، دوو حەووتوویەک لەمەوبەر لە رۆژنامەیەکدا خوێندمەوە لە ئوتریش پیاوێک ســـێزدە جار بە شـــێوەی جۆراوجۆر ویســـتوویەتی خۆی بکوژێ، هەموو قۆناغەکانی تێپەڕاندووە . خۆی لە دار داوە گوریســـەکەی پساوە، خۆی خســـتۆتە چۆمەوە هێناویانەتەوە دەرێ، و..هتد... تا ئەوەی بۆ دوایین جار کە دەبینێ ماڵەکەی چۆڵ و بێدەنگە بە چەقۆیەکی زل هەموو دەمارەکانی دەبڕێ، ئەوە جاری سیزدەهەمە دەمرێ! ئەوە دڵخۆشم دەکا! نا، کەس بڕیاری خۆکوشتن نادا، خۆکوشتن لەگەڵ هەندێ کەسە، ئاوێتەی خوێن و ئاکاریانە، ناتوانن لە دەستی دەرباز بن. ئەوە چارەنووسە دەسەڵاتی هەیە، بەڵام ســـەرەڕای ئەوەش ئەوە منم کە چارەنووســـی خۆم بەدی دێنم، ئیدی ئێستا ناتوانم لە دەستی دەرباز بم، ناتوانم لە خۆم دەرباز بم، ئەرێ چ دەکرێ؟چارەنووس لە من بەخۆوەترە .!

خولیای سەیر سەیر لە کەللەم دەدا! هەر وا کە ڕاکشابووم پێم خۆش بوو منداڵۆچکەیەک بوایەم. جا"گلین باجی"ش کە حەکایەتی بۆ دەکوتم و تفی دەمی قووت دەدا، لێرە لە تەنیشتم بایە . هەر وا کە من شەکەت لە نێو پێخەفەکەمدا ڕاکشابووم ئەو بە راوێژێکی هێند خۆش حەکایەتەکەی دەگێڕاوە هێدی هێدی پێڵوەکانم دەکەوتنە سەر یەک. پێم وایە هێندێ لە شتەکانی منداڵیم بە باشی دێتەوە بیـــر. هـــەر دەڵێی دوێنێ بووە، وا دەزانم لەگەڵ منداڵیم زۆر لێک دوور نین. ئێســـتا تەواوی ژیانی رەش و بێ ســـەمەری خۆم دەبینم، ئاخۆ ئەوێ دەمێ خۆشـــم ڕابواردووە ؟ نا....چ هەڵەیەکی کەڵەیە! هەموویـــان پێیـــان وایە منداڵ بەختەوەرە، نا، چاکم لە بیرە، ئەوێ دەمێ زۆرتر هەســـتم بە شـــت دەکرد. بەڵام لە دەروونی خۆمدا تانە و تەشـــەرێکی بچووک یان رووداوێکی ناخۆش و بە هەڵکەوت بـــۆ ماوەیەکـــی زۆر بیرمی بە خۆیـــەوە دەخافڵاند و خۆم دەخواردەوە . هەی ســـەگ لەو تەبیعەت و سروشتەی من ری. ئەوانەی دەڵێن بەهەشت و دۆزەخ لە خودی مرۆڤەکاندایە، ناحەقیان نییە . هێندێ کەس بە خۆشییەوە لەدایک دەبن و هێندێکیش بە چەرمەسەرییەوە .

چاوێک لەو لەتکە قەڵەمە سوورە دەکەم کە بەدەستمەوە گرتووە و لە جێیەکەمدا پێی دەنووسم.

هەر بەو قەڵەمە بوو ژوانگەی خۆمم نووســـی و دام بەو کچەی تازە لەگەڵی ناسیاویم پەیدا کردبوو. دوو ســێ جاریش چووینە سینەما. دوایین جار فیلمی"گۆرانی بێژ و وێژەر"بوو، لەنێو پرۆگرامەکەدا گۆرانی بێژی بەناوبانگی شـــیکاگۆ گۆرانی دەکوت"Where is my silvia?"هێندم پێخۆش بوو چاوم وێک نا، گوێم راداشت. دەنگی خۆش و بەرزی ئێستاش لە گوێمدا دەزرینگێتەوە. ژووری سینەماکە دەلەرییـــەوە. پێم وابوو ئەوە قەت نابێ بمرێ. نەمدەتوانی ئـــەوەم بەبیردابێ کە رەنگە رۆژێک ئەو دەنگە کپ بێ. لە ســۆزەی دەنگی خەفەت دایگرتبووم، هەرچەندە زۆریشـــم پێ خۆش بوو، سازیان لێـــدەدا. بەرز و نزم بوونەوەی دەنگەکان، ناڵەیەک کە لە ســـیمی ویۆلۆنەکە هەڵدەســـتا، دەتکوت ئارشـــەی ویۆلۆنەکە بەسەر دەماری مندا دەخشـــێنن. تێکرای تان و پۆی ژیانمی تێکەڵاوی سازەکە دەکرد. موچرکێ پێدا دێنام و دەیبردمە سەفەرێکی خەیاڵییەوە. لە تاریکییەکەدا دەستم بە دەستی کچەکـــەدا ماڵـــی. چاوەکانی خومار بوون، منیش جۆرێکی ســـەیرم لێدەهات. لەبیرمە هەســـتێکی خەفەتـــاوی و خۆش بوو کە بۆ کوتن نابێ. لێوەکانیم راموسســـی، گۆناکانی ســـوور هەڵگەڕابوون. خۆمان(لێک نزیک کردبۆوە)لە فیلمەکە هەر تێنەگەیشـــتم، دەســـتم لە دەستی وەردەدا و کایەم پێ دەکرد، ئەویش خۆی بە منەوە نووساندبوو. ئیدی دەتکوت خەون دەبینم، لە دوایین رۆژەوە کە لێک هەڵبڕاین تا ئەمڕۆ نۆ رۆژە. بەڵێن وابوو ســـبەینێ بچم و بیهێنمەوە ماڵێ. ماڵەکەی ئەو لە نزیک گۆڕستانی مۆناپارسەوە بوو. هەر ئەو رۆژە چووم لەگەڵ خۆمی بێنم، لەوێ لە گۆشەی کۆڵانێکدا لە واگۆنی ژێر زەمینی دابەزیم. بایەکی ســـارد دەیلووراند. هەور و هەڵا بوو. نازانم بۆ لە خۆڕا پەژیوان بوومەوە، نەک لەبەرئەوەی کە بڵێم ناحەز بوو یان خۆشـــم نەدەویســـت، بەڵام شـــتێک گێڕامیەوە. نا، هەر نەمویســـت ئیتر بیبینمەوە، دەمویســـت دڵ لە هەموو شتێک بکەمەوە. بێ ئیختیار چوومە گۆڕستانەوە، لەبەر دەرگا دەرکەوانی ئەوێ خۆی لە شنێلێکی سوورمەیییەوە پێچابوو. بێدەنگییەکی سەرســـوورهێنەر دەســـتی بەســـەر ئەوێدا گرتبوو. من هێدی هێدی پیاســـەم دەکرد. جوان روانیمە کێلەکان، ئەو خاچانەی لەسەر گۆڕەکان دانرابوون، گوڵی نایلۆنی و ئەو گژ و گیایەی لەسەر گۆڕەکان یان لـــە پەنایانەوە روابوون. ناوی هێندێ لە مردووەکانم دەخوێنـــدەوە. ئیرەییم دەهاتێ کە بۆچی مـــن لەجیاتی ئەوانە نیم. بە خۆم دەکوت ئەوانـــە چەندە بەختەوەرن!...ئیرەییم بەو مردووانە دەبرد کە لەشـــیان لە ژێر خاکدا هەڵپروکابوو. قەت ئەوەندەم بەغیلی بە هیچ شتێک نەبردووە. پێم وابوو مەرگ بەختەوەری و نیعمەتێکی گەورەیە و بە ســـانایی وەدەست هێندێ کەس ناکەوێ. لەبیرم نییە چەندی پێچووبوو، کز و مات چاوم دەگێڕا.

کچەم بە یەکجاری لەبیر چووبۆوە. هەســـتم بە ســـەرمای هەوا نەدەکرد. دەتکوت مردووەکانم لێ نزیکترە تا زیندووەکان. لە زمانی ئەوان باشتر دەگەیشتم، گەڕامەوە. نا...ئیتر نەمدەویست ئەو کچە ببینمەوە. دەمویســـت لە هەموو شتێک و لە هەموو کارێک دوور کەومەوە. دەمویست ناهومێد بم و بمرم. فکری سەیر و هیچ و پووچ لە کەللەم دەدا!رەنگە قسەکانم هەڵیت و پڵیت بن. چەند رۆژێک بوو بە وەرەق فالم دەگرتەوە. نازانم چۆناوچۆن بوو باوەڕم بە شتی هیچەکە و پووچەکە قایم ببوو. هەر بەڕاست فالم دەگرتەوە. هیچ کارێکی ترم نەبوو، هیچی ترم لەدەست نەدەهات. دەمویست قومار

بە داهاتوم بکەم. نیەتم کرد خۆم یەکجاری کەم. چاکی هێنا. رۆژێک حسـێبم کرد، سێ سەعات و نیو لەسەر یەک بە وەرقەکان فالْم گرتەوە. لە پێشدا بۆرم لێدەدا، دواتر لەسەر میزێک وەرەقێک لە سـەر و پێنج وەرەقی دیکەم لە بنەوە لەسەر یەک دادەنا. ئەو جار لەسەر وەرەقی دووهەمیان کە لە پشتەوە بوو، وەرەقێکم لە سەرەوە و چوار وەرەقم لە پشتەوە دادەنا. هەر ئاوا...تا ئەوەی کە لەسەر وەرەقی شەشەمیش وەرەقێک دەکەوتە روو. دوای ئەوە وام لەسەر یەک هەڵدەچنین کە خاڵێکی رەش و خاڵێکی سوور دوا بەدوای یەکدا بێن. بەڕیز .شا...بیبی...سەرباز..دە...نۆ...و هتد...

هەرجێیـەک کراباوە، وەرەقی ژێرەوەی ئەوم لە سـەرەوە دادەنـا، ئەگەریش پێنج جێ یا کەمتر بوایە ئەوە باشـتر دەکەوت. دواتر ئەو وەرەقانەی بە دەستمەوە بوو، سێ دانە سێ دانە لەسەر یەکم دادەنان، ئەگەر وەرەقێکی باش هاتبا لەسـەرماڵەکانم دادەنا، بەڵام نابێ لە شـەش ماڵ زیاتر بێ، تەک خاڵەکانیشـم بە جیا لە سەر ماڵەکان دادەنا، واشم دادەنا کە ئەگەر فالی چاک هاتبا تێکڕای وەرەقی ماڵەکانی خوارەوە، بەڕیز لە سەر یەکەکانی هاوڕەنگی خۆیان دادەنران، ئەو فالە بە مندالی فێر ببووم و کاتم پێ رادەبوارد.

حەوت هەشـت رۆژ لەوەپێش لە قاوەخانە دانیشـتبووم. دوو کەس بەرامبەرم تەختەیان دەکرد. یەکیان بە رەفیقەکەی، کە دەم و چاوی سـوورهوول و سـەری تاس بوو، جگەرەیەکی لەژێر سمێڵە شـۆڕەکەی دانابوو و بە شێوەیەکی گەوجانە گوێی راداشـتبوو دەڵێ: قەت وانەبووە من لە قوماردا بیبەمـەوە. لـە دە جار نۆ جاری دەدۆڕێنم. من مات و بێدەنگ چـاوم لێدەکردن، چم گوتبا؟نازانم، دوایەش هاتمە کۆڵان و بەبێ وازی دەڕۆیشـتم. چەند جـار وام بە خەیاڵدا هات کە چاوم بقووچێنم و خۆم بخەمە بەر ماشـینێک تا تەگەرەکانی بە سـەرمدا تێپەڕن، بەڵام ئەوە مەرگێکی ناخۆش بوو. داویەش خودا دەزانێ ئاسـوودە دەبووم یان نا؟رەنگە هەر زیندوو مابام. ئەو بیرە شێتم دەکا. دواتر هەروا لە چوار رێیان و شـەقامە پڕ حەشـیمەتەکانەوە تێدەپەڕیم. لە نێو ئـەو ئاپۆرەیەوە کە لە هاتوچۆدا بوون، دەنگی نالی ئەسپی داشقەکان، عەرەبەکان، دەنگی سیگنالی ماشین، هەڵلا و بگر و گێرە و کێشـە. بە تاقی تەنیا بووم. لە نێو چەند ملیۆن مرۆڤدا دەتگوت لە گەمییەکی شـکاودا دانیشـتووم و لە دەریادا ون بووم. وام هەسـت دەکرد بەبێ فەزیحەتییـەوە لە کۆمەڵی مرۆڤەکان راونـراوم. پێم وابوو بۆ ژیان دروسـت نەکراوم. بڕوبیانووم بۆ خۆم دێنـاوە و پەیتا پەیتا هەنگاوم هەڵدەبڕی، لە بەردەرکی ئەو دوکانانەی تابلۆیەکی نەققاشی لێبوو رادەوەستام، هێندێکی تێڕادەمام و حەسرەتم دەخوارد کە بۆچی نەبوومە نەققاش، تەنیا ئیشێک بوو کە خۆشم دەویست و پێم خۆش بوو. بیرم دەکردەوە و دەهاتمە سـەر ئەو رایە تەنیا لە نەققاشیدا دەتوانم دڵخۆشییەکی بچووک بۆ خۆم ببینمەوە، فەڕاشـێک لە پەنامەوە تێدەپەڕی و لە پشت چاویلکەکەیەوە دەیڕوانییە سەردێڕی کاغەزێک، چ بیرێکم بە زەیندا دێ؟نازانم!رەنگە وەبیر پۆسـتچییەکەی ئێران، وەبیر فەڕاشە پیرەی مالی خۆمان کەوتبێتمەوە.

دوێ شـەو چاوەکانـم لێک دەنا، خـەوم لێنەدەکەوت، بیری پچڕ پچڕ، وێنـەی پڕ جموجۆڵ بە بەرچاومـدا تێدەپەڕین. خەون نەبوو، چونکە هێشـتا خەوم لێنەکەوتبـوو، مۆتەکە بوو، نە خەوم

لێکەوتبـــوو، نـــە بەخەبەریش بووم، بەڵام ئەوانەم دەدیت. لەشـــم سســـت، ورد و نەخۆش و قورس بوو. ســـەرم ژانی دەکرد. ئەو مۆتەکە ســـەیرە لە پێش چاومەوە تێدەپەڕی. گیانم شـــەلاڵی عارەقە بـــوو. بەســـتەیەک کاغەزم دەدیت لە حـــەوادا بڵاو دەبۆوە . پەڕە پەڕە دەڕژایە خوارێ. دەســـتەیەک ســـەرباز تێدەپەڕین. روخسارییان دیار نەبوو، شەوی ئەنگوستەچاو و پڕ ژان و برووسک پڕ ببوو لە هەیکەلی ترسێنەر و تووڕە، ساتێ دەمویست چاو لێک نێم و خۆم بە دەست مەرگەوە دەم؛ ئەو وێنە سەرسووڕهێنەرانە سەریان هەڵدەدا. جەغزەکانی گڕکان کە بەدەوری خۆیاندا دەخولانەوە، مردوویەک کە لەســـەر ئاوی چۆمێک خولی دەخـــوارد، چاوگەلێک کە لە هەموو لاوە دەیانڕوانییە من. ئێســـتا بە باشـــی وەبیرم دێتەوە، کۆمەڵێک وێنەی شـــێت و تووڕە هێرشیان بۆ هێنابووم. پیرە پیاوێک بە دەم و چاوێکی خوێناوییەوە بە ســـتوونێکەوە بەسترابۆوە، چاوی تێبرِیبووم، پێدەکەنی. ددانەکانی دەبریســـکانەوە . شەمشـــەمە کوێرەیەک بە باڵە سارد و سڕەکانی بە دەم و چاومیدا دەکێشا. بەسەر تەنافێکی باریکدا دەڕۆیشـــتم. لە ژێر ئەوەوە گێژاوێک بوو، هەڵدەخلیســـکام. دەمویســـت بگوێزنم. دەســـتێک دەنرایە سەر شانم. دەستێکی سەهۆڵین گەرووەی رێک دەگوشی، پێموابوو دڵم لە لێدان دەکەوێ. ناڵەکان، ئەو ناڵە شوومانەی لە بنەبانی تاریکی شەوەوە دەهاتنە گوێ. ئەو دەم و چاوانەی سێبەری سەریان پاک ببۆوە . ئەوانە هەر لە خۆڕا وەدیار دەکەوتن و ون دەبوونەوە . لە ئاست ئەوانەدا دەمتوانی چ بکەم؟لە ســـاتێکدا ئەوانە نزیک بوون زۆریـــش دوور بوون. ئەوانەم بە خەو نەدەدیت، چونکە هێشتا خەوم لێنەکەوتبوو.

نازانـــم، گاڵتە بە هەموان دەکـــەم. بۆخۆم بوومەتە گەپجاڕ، بەڵام بیرێک خەریکە شـــێتم دەکا، ناتوانـــم پێکەنینی خۆم بەربەســـت بکەم. جاری وایـــە پێکەنین ئەوکم دەگـــرێ. ئاخرەکەی کەس نەیزانی من نەخۆشـــییەکەم چیە، هەموان فریویان خوارد! حەوتوویەکە خۆم نەخۆش خستووە یان نەخۆشـــییەکی ســـەیر و نامۆم گرتووە، بێ حاڵ و باڵ جگەرەیەکم هەڵگرت و دامگیرســـاند، بۆچی جگەرە دەکێشم؟خۆشـــم نازانم. دوو قامکی دەستە چەپم کە جگەرەیان لە مابەینداپە لە لێوم نزیک دەکەمەوە، دووکەڵەکە بە وڵاتدا بڵاو دەکەمەوە، ئەوەش نەخۆشی یە!

ئێســـتا کە بیر لەوە دەکەمەوە موچڕکم پێدادێ. حەتوویەک بوو، بۆ گاڵتە نابێ. خۆم بە هەموو شـــێوەیەک جەزرەبە دەدا، دەمویست نەخۆش کەوم. چەند رۆژێ بوو هەوا ساردی کردبوو. لە پێشدا چووم شـــێرەی ئاوە ســـاردەکەم بەســـەر خۆمدا بەرداوە، دەلاقەی حەمامم کردەوە . ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە بێزم هەڵدەســـتێ، پشـــووم بڕا، پشت و سینگم دایانە ژان، بە خۆمم گوت ئیدی کار لە کار ترازاوە . ســـبەی کۆخە رەشەیەکی سەیر دەگرم و بە جێ و بان دەکەوم. لە خۆمی پیستر دەکەم و دوایەش خۆم تەفر و توونا دەکەم. بۆ ســـبەینێ هەســـتم بەوە نەکرد کە ســـەرمام بووبێ. دیسان جلەکانم کەم کردەوە، ســـاتێ هەوا تاریکتری کرد دەرکەم لە پشـــتەوە داخســـت. چرام کووژاندەوە، پەنجەرەی وەتاغەکەم کردەوە و لەبەر سۆزەی ئەو سەرمایە دانیشتم. بایەکی سارد دەیلووراند، وەک مێوژۆکە هەڵدەلەرزیم. گوێم لە شەقەشەقی ددانم دەبوو. روانیمە دەرێ، ئەو ئاپۆرەیەی لە هاتوچۆدا بوون، سێبەرە رەشـــەکانیان، ئەو ماشێنانەی تێدەپەڕین، لەســـەر نهۆمی شەشەمی باڵەخانەکەوە

بچووک ببوونەوە. لەشی رووتمم بە دەست سەرماوە دابوو، خۆم وێک دێنا، هەر لەو ساتەدا ئەو بیرەم بە زەیندا هات کە رەنگە شێت بووبێتم. پێکەنینم بە خۆم دەهات. بە ژیان پێدەکەنیم. دەمزانی لەو قومارخانە گەورەیەی دونیادا هەر کەسێ بە شێوەیەک کایە دەکا، هەتا دەمی مردنی دەگاتێ، منیش ئەو قومارەم هەڵبژاردبوو، چون پێم وابوو زوو تەفروتوونام دەکا، لێوەکانم وشــک هەڵاتبوو، سەرما چزەی لە گیانم هەڵدەســـتاند، دیســـانیش کەڵکی نەبوو. خۆم گەرم کردەوە. شەڵاڵی عارەقە بووم. لەپڕدا رووت دەبوومەوە.

شەو تا بەیان لەسەر جێ و بانەکەم کەوتم، هەڵئەلەرزیم. هەر خەوم لێنەکەوت. هێندێکم سەرما بوو، بەڵام لە گەڵکوو ســـەرخەوێکم شـــکاندبا نەخۆشـــییەکەم بە تەواوی دەرەوی. زانیم ئەوەش بێ ئاکامە. ســـێ رۆژ بوو هیچم نەدەخوارد و شـــەوانە بەردەوام رووت دەبوومـــەوە و لەبەر پەنجەرەکە دادەنیشتم. خۆم ماندوو دەکرد. شەوێک تا بەیانی بە زگی برسییەوە لە کۆڵانەکانی پاریسدا هەڵاتم، شـــەکەت بووم، لەسەر پلیکانێکی سارد و شـــێدار لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا دانیشتم. شەقەی نیوە شەو بوو، کرێکارێکی مەست بە لەترە لەتر لەبەردەممەوە تێپەڕی. لە ژێر رووناکایی کز و بێرەنگی چرا گازەکەدا ژن و مێردێکم دیت پێکەوە دەدوان و تێدەپەڕین. دواتر هەستام و کەوتمە رێ. داماوە بێ ماڵ و حاڵەکان لەسەر سەندەڵی شەقامەکان خەویان لێکەوتبوو. ئاخرەکەی هێند بێ هێز بووم لـــە جێدا کەوتم، بەڵام نەخۆش نەبووم، هاوەڵەکانیشـــم دەهاتنە دیدەنیم. لەلای ئەوان چەق و چۆم دەخســـتە خۆم. وەها رەنگی نەخۆشـــم بە خۆوە دەگرت هەموویان زگیان پێم دەسووتا، پێیان وابوو ناگەمە ســـبەینێ و دەمرم. دەمگوت دڵم دەگیرێ، ساتێکیش لە هۆدەکە دەچوونە دەرێ جرتێکم بۆ رادەداشـــتن. بە خۆمم دەگوت رەنگە لە دونیادا تەنیا کارێکم لە دەســـت بێ: دەبوو ببمە ئەکتەری شانۆ!...

چۆن لای ئەو دۆستانەی هاتبوونە دیدەنیم و لای دکتۆرەکان رۆڵی نەخۆش کایە دەکەم!هەمووان پێیان وابوو بەڕاســـتی نەخۆشـــم، هەرچییەکیان پرســـیبا هەر دەمگوت دڵم دەگیرێ، چونکە تەنیا مردنی کوت و پڕ دەکرا بڵێی پێوەندی بە گیرانی دڵەوە هەیە، دەنا سینگ ئێشەیەکی موختەسەری بە جارێک پیاو ناکووژێ.

ئەوە موجیزات بوو. ســـاتێ بیر دەکەمەوە هەستێکی نامۆ دەســـتم بەسەردا دەگرێ. حەوت رۆژ بوو خۆم ئەشـــکەنجە دەدا، ئەگەر بە پێداگری و ویســـتی هاوەڵەکانـــم چاییەکم لە خاوەن ماڵەکە بویستبایە و بمخواردبایەوە چاک دەبوومەوە. ترسێنەر بوو، نەخۆشییەکە بە تەواوی لە ناو دەچوو. زۆرم پێخۆش بوو ئەو نانەی پەنا چاییەکە بخۆم، بەڵام نەمدەخوارد. هەموو شەوێ بە خۆمم دەگوت ئیتر ئەوە لە جێدا کەوتم. ســـبەی ناتوانم لە جێی خۆم ببزووم. دەرۆیشـــتم و ئەو شووشانەم دێنا کـــە پڕم کردبوون لە گردی تلیاک، لە دەخیلەی تەنیشـــت مێزە بچووکەکـــەی پەنا جێ و بانەکەم دادەنا، هەتا ســـاتێ کە نەخۆشـــی بە باشی لە جێی دا خستم و نەمتوانی لە جێی خۆم چرتە بکەم، ئەوانە بێنمە دەر و بیانخۆم. لە چارەڕەشیان نەخۆش نەدەکەوتم و نەخۆشی لێم نەبان بوو. جارێک لەلای یەکێک لە هاوەڵەکانم لێبڕام تیکە نانێکی بچووک لەگەڵ چاییەک بخۆم. هەســـتم کرد چاکتر

بوومەوە و هاتمەوە ســـەر خۆ، هەر بە یەکجاری چاک بوومەوە، لە خۆم دەترســـام، لە گیان سەختی خۆم دەترسام. زۆر جێی مەترسی بوو، جێی باوەڕ نییە. ئێستا کە ئەوانە دەنووسم هۆشم لە خۆمە، قســـەی هەڵیت و پڵیت ناکەم. چاک چاک لەبیرمە. ئەوە چ هێز و توانایەک بوو لە مندا کۆ ببۆوە؟ تێگەیشتم هیچ کام لەو کارانە ئاکامێکی نییە. دەبێ بەڕاستیی نەخۆش کەوم. ئەرێ، ژاری کوشندە وا لـــەوێ لـــە جانتاکەمدایە. ژاری کوت و پڕ، وەبیرم دێتەوە ئـــەوێ ڕۆژێ باران دەباری و بە درۆ و دەلەســـە و هەزار زەحمەت ئەوەم بـــە بیانووی وێنەگرییەوە کڕی. بە درۆ نێو نیشـــانێکم بە کابرا دابوو."ســـیانووری دۆپتاسیۆم"کە لە کتێبی حەکیمیدا خوێندبوومەوە و ئاسەواری کارتێکردنەکەیم دەزانی؛ فێ گرتن، پشوو سواری، کەوتنە ئاویلکە ...ئەگەر زگ برسی بێ بە بیست گرام دەم و دەست یان دوو دەقیقەیەک دەبا. بۆ ئەوەی بۆ با نەبێ لە جغجغەی شـــیرنیاتمەوە پێچابوو، لە مێویشـــم گرتبوو، لە شووشـــەیەکی سەربەســـتراوی بلووریم خستبوو. هەمووی سەد گرامێک دەبوو؛ کە وەک گەوهەرێکی پڕ بایەخ لەگەڵ خۆم دەگێڕا. بەڵام بە خۆشـــییەوە دەبێ بڵێم شـــتێکی باشـــترم وەگیر کەوت: تلیاکی قاچاغ ئەویش لە پاریس! ئەو تلیاکەی لە مێژبوو بۆی دەگەڕام، خوداوراستان وەگیرم کەوت. خوێندبوومەوە کە شـــێوەی مردن بە تریاک زۆر خۆشـــترە لە مردن بەو ژارەی هەوەڵ. ئیدی دەمویست هەر بەڕاست خۆم نەخۆش کەم و دواتر تریاکەکە بخۆم.

سیانوورە دوپتاسیۆمەکەم کردەوە، لە گۆشەی گزموولەکە کە دەتگوت هێلکەیە بە قەدرایی دوو گرامم لێکردەوە و لە شووشـــەیەکی بەتاڵم خســـت: بە چەسپ گۆشـــەکەیم قایم کرد و خواردم. نیو سەعاتێک رابورد. هەستم بە هیچ نەکرد. سەر شووشەکە سوێر ببوو، دیسان هەڵمگرتەوە. ئەو جار بە قەدرایی پێنج گرامێکم لێکردەوە و قووتم دا. چووم و لە جێیەکەمدا خەوتم. وەها کە رەنگە ئیتر هەڵنەستمەوە!

ئـــەو بیرە هەر مرۆیەکی زیت و وریا شـــێت و وێت دەکا. نا، هەســـتم بە هیـــچ نەکرد، ئەو ژارە کوشندەیە کاری لێنەکردم! ئێستا زیندووم، ژارەکەش لەوێ لە جانتاکەمدایە. لە جێیەکەمدا پشووم ســـوار دەبێ، بەڵام ئەوە هی کارتێکردنی دەواکە نییە. مـــن دەتگوت گوللەبەندم پێوەیە. گوللەبەند کە لە ئەفســـانەکاندا باسیان کردووە. بۆوە نابێ بڵێی جێی باوەڕ نییە، بەڵام دەبێ سەر بنێمەوە و بـــڕۆم. بێ ئاکامە، ژیانم پڕی ماندووییە. بێخود و بێ بایەخە، دەبێ بە زوویی چاری خۆت بکەی و بڕۆی. ئیدی ئەو جارەیان گاڵتە نییە، هەرچەندی بیر دەکەمەوە هیچ شتێک بە ژیانەوەم نالکێنێ و دڵم بە ژین خۆش ناکا. هیچ شتێک و هیچ کەسێک...

لەبیرمە پەسرپێرێ بوو، لە وەتاغەکەمدا پیاسەم دەکرد، لەولا بۆئەولا دەرۆیشتم. ئەو جلانەی بە دیوارەوە هەڵواســـراون، تەشـــتی دەم و چاو شوتن، ئاوێنەی ناو کومێد، وێنەیەک کە بە دیوارەوەیە، جـــێ و بان، چرپای نێو هۆدە. ئەو کتێبانەی لە ســـەری بڵاو بوونەتەوە، چرپاکان، پێڵاوێک کە لە ژێر کومێددا دانراوە، جانتاکانی ســـووچی هـــۆدە، پەیتا پەیتا بە پێش چاومدا تێدەپەڕن. بەڵام من نەمدەدیتن. لەپڕدا وەخۆ هاتمەوە، ئەو ڕۆیشتنە وەحشیانەیەم لە جێیەک دیتبوو و سەرنجی منی بۆ لای خۆی راکێشابوو. نەمدەزانی لە کوێ، وەبیرم دێ یەکەم جار لە باخی ئاژەڵانی بێرلین بوونەوەری

درێـــدەم دیت. ئەو بوونەوەرانەی لـــە رکەکانی خۆیاندا بەخەبەر بوون هەر ئاوا بەڕێدا دەڕۆیشـــتن. هەر راســـت ئاوا. ئەویٚ دەمـــیٚ منیش وەک ئەو بوونەوەرانەم لێهاتبوو. رەنگبیٚ وەک ئەوانیشـــم بیر دەکـــردەوە، لـــە دڵی خۆمدا هەســـتم دەکرد وەکوو ئەوانم. ئـــەو رێپیوانە لە خۆڕایـــە، خولانەوە بە دەوری خۆمدا. ســـاتێک خۆم بە دیوار دادەدا هەســـتم دەکرد پاوانە . دەگەڕامەوە . ئەو بوونەوەرانەش هەر ئاوایان دەکرد... نازانم چی دەنووســـم. چرکە چرکی کاتژمێریش ئەوە لە پەنا گوێمەوە هەر لە بەرزبوونەوەدایە . دەمەویٚ هەڵیگرم و لە پەنجەرەکەوە تووڕی هەڵدەمە دەریٚ. ئەو دەنگە بەسامەی کە تێپەڕینی کاتم وەک کوتەکێک بە سەردا دەکوتیٚ!

حەوتوویەک بوو خۆم بۆ مردن تەیار کردبوو. ئەو کاغەز و نووسراوەی هەمبوو لە ناوم بردن. جلە چڵکنەکانم فڕیٚ دا تا دوایی کە شـــتەکانیان پشکنیم شـــتی چڵکنیان وەچنگ نەکەویٚ. کراسێکی نوێی ژێرەوەم کڕیبوو، لەبەرم کرد، هەتا دەمێک منیان لە سەر جێیەکەم هێنایە لاوە و دکتۆر چاوی لێکردم رێک و پێک بووبێتم. شووشەیەکی ئۆدکلۆنم هەڵگرت بە جیٚ و بانەکەوەم کرد تا بۆنی خۆش بیٚ. بەڵام لەبەر ئەوەی کە هیچ کام لە ئاکارەکانم وەک خەڵک نەدەچوو ئەو جارەش دڵنیا نەبووم، لە گیان سەختی خۆم دەترسام. دەتگوت ئەو پلە و گەورەییە بە سانایی وەبەر کەس ناکەویٚ. دەمزانی هەر وا بە مفتیٚ کەسیٚ نامریٚ...

وێنەی کەسەکانمم دەرێنا و تێم ڕوانین، هەرکامەیانم وەک لەوەوپێش دیتبوو هاتە بەرچاو. خۆشم دەویستن و خۆشیشم نەدەویستن. دەمویست بیانبینم و پێشم خۆش نەبوو، نا، یادگارەکانی ئەویٚ زۆر لەبەر چاوم روون بوون. وێنەکانم لەت و کوت کرد، دڵم پێیانەوە نەبوو. بوومە قازی خۆم، من پیاوێکی بەڕەحم و بەزەیی نەبووم. من زۆر تووڕە و بێزار دروست کراوم. رەنگە هەر واش نەبووبێتم، هێندێکیش ژیان و رۆژگار وای لیٚ بەســـەرهێنام، هەر لە مردنیش نەدەترســـام، بە پێچەوانەشـــەوە، نەخۆشـــییەک، شێتییەکی تایبەتی و سەیر لە مندا سەری هەڵدابوو کە بۆ لای مێغناتیسی مەرگی رادەکێشام. ئەوەش زۆر سەیر نییە، حەکایەتێکم وەبیر هاتەوە، هی پێنج شەش ساڵێک لەمەوبەرە . بەیانیەکی زوو لە تاران چوومە شەقامی"شـــاە ئاباد"لە وردە فرۆشـــێک تریاک بکڕم، سیٚ تمەنم لە بەردەمـــی دانـــا و گوتم: بایی دوو قڕان تریاکم دەیە . ئەویش ریشـــی لە خەنە دراو و ســـوور بوو، کڵاوێکی ســـپی لەسەردا بوو، سڵاواتی لێدەدا. خێسەیەکی لیٚ کردم، دەتگوت هەر بە قەڵافەتدا پیاو دەناسیٚ، یا بیری خوێندمەوە، گوتی:وردە پووڵم نییە . دوو قڕانییەکم دەرێنا و دامیٚ. گوتی:نا، هەر نایفرۆشـــم. هۆیەکەیم لیٚ پرســـی. لە وڵامدا: تۆ تازە لاوی، نەزان و کەللە پڕی، خودا بەو رۆژە نەکا خۆت شێت کەی تریاکەکە دەخۆی!منیش ئیدی زۆرم لیٚ نەپرست.

نا، کەس بڕیاری خۆکوشـــتن نادا، خۆ کوشـــتن لەگەڵ هێندیٚ کەسە . تێکەڵ خوێن و گۆشتیانە . ئەریٚ چارەنووســـی هەر کەســـیٚ لەسەر تەوێڵی نووسراوە، خۆکوشـــتنیش لەگەڵ هێندێکان لەدایک دەبیٚ. من هەموو دەم بە گاڵتەوە روانیومەتە ژیان، دونیا و خەڵکیشم بە تێکڕایی وەک منداڵۆچکە، وەک عارێک وەک شـــتێکی هیچ و پووچ و بیٚ مانا هاتۆتە بەرچاو، دەمویســـت راکشێم و ئیدی راست نەبمەوە . خەونیش نەبینم. بەڵام چونکە خۆکوشتن لای هەموان کارێکی سەیر و نامۆ بوو، دەمویست

خۆم زۆر پیس نەخۆش کەم. وەک مردوو لەڕو لاواز و بێ هێز بم، جا کە قسەکە بڵاو بۆوە و هەموو بیستیانەوە، تریاکەکە دەخۆم. هەتا بڵێن: نەخۆش کەوت و لە حەوت ساڵان راست بۆوە...

لە جێیەکەمدا خەریکی یادداشــت نووســینم. ســێی پاش نیوەڕۆیە. دوو کەس هاتنە دیدەنیم. ئێســتا کە رۆیشتن بە تەنیا مامەوە. ســەرم لە گێژەوە دێ، لەشم حەساوە و ئاسوودەیە. گەدەشم فینجانێک شــیر و چایی زیاتر تێدا نییە. لەشــم شل و سستە و یاوێکی ناخۆشی هەیە. هەوایەکی خۆشــم لە گرامافۆنەکە بیســتبوو، دەمویســت ئەو هەوایە بە فیتوو لێدەم. بریا دیسان گوێم لەو هەوایە بوایەتەوە. ئێســتا نە ژیانم پێ خۆشــە و نە لێشی وەڕەزم. زیندووم، بەڵام بێ ویستی خۆم. دەســتەڵاتێکی لە پســان نەهاتوو رایگرتووم، لە بەندیخانەی ژیاندا بە زنجیری پۆڵا شەتەک دراوم. ئەگەر مردبایەم دەیانبردم و لە مزگەوتی پاریس دەکەوتمە دەست چەند عەرەبی حەپۆلی بێ گەورە و بێ ســەرەوبەرە، دیســان دەمردمەوە، چاوم پێیان دەکەوێ بێزم هەڵدەســتێ. هەرچییەک بێ بۆ من جیاوازییەکی نەبوو. دوای مردنم ئەگەر لە مەبالیشــیان خســتبایەم گرنگ نەبوو. ئیتر خەڵاسیم هاتبوو: تەنیا لە ماڵەکەماندا شیوەن و گابۆڕیان دەکرد. وێنەکەمیان دەردێنا، وە زمان دەهاتن، لەو هەڵیت و پڵێتانەی باوە.

پێم وایە تێکڕای ئەوانە گەوجانە و پووچن. جا چەند کەســێک تاریفیان دەکردم، چەند کەسێک وەدرۆیان دەخســتنەوە. بەڵام ئاخرەکەی لەبیر دەچوومەوە. من مرۆیەکی خۆبەزل زانم و وەبەر دڵ ناکەوم. چەندەی بیری لێدەکەمەوە درێژەدانی ئەو ژیانە بێ سەمەرە. من بوومەتە میکرۆبی کۆمەڵ، وجوودێکی پڕ لە زەرەر. ســەرباری خەڵکم، جارجاریش شێتی لە کەللەم دەدا، دەمەوێ بڕۆمە دوور وڵاتان، زۆر دوور، بچمە جێیەک خۆشــمم لەبیر بچێتەوە. لەبیر بچمەوە، ون بم، تەفر و توونا بم، دەمەوێ لەدەســت خۆم رزگارم بێ و راکەم، بڕۆمە شــوێنێکی زۆر دوور، بۆ وێنە بچمە سیبیری و لەوێ لە نێو ماڵە بە دار هەڵچنراوەکان، لە ژێر دارە کاژەکاندا، ئاسمانی خۆڵەمێشی، بەفر، بەفرێکی قورس، لە نێو مووجیکەکاندا، بچم و ژیانێکی نوێ دەســت پێ بکەم. یا بۆ وێنە بچمە هیندستان، یان ژێر پڕشــەنگی زێڕینی هەتاو، دارســتانە چڕوپڕەکان، نێو خەڵکە سەیروســەمەرەکان، بچمە جێیەک کەس نەمناســێ، کەس لە زمانم نەگا، دەمەوێ لە خۆمدا هەســت بە هەموو شــتێک بکەم. بەڵام وەک دەبینم بۆ ئەو کارە دروست نەکراوم.

نا، من تەمبەڵ و بێکارەم، هەر بە هەڵە لەدایک بووم. وەک دارێکم هەردوو سەری گڵاوی بێ، وەک جوولەکەکە لە هەر دوو دین بووم. چاوم لە هەموو گەڵاڵەکانی خۆم پۆشــی. لە ئەوین، لە هەڵپە، دەستم لە هەموو شتێک شتۆتەوە. ئیتر من لە جەرگەی مردووەکان دێمە ئەژمار. جاری وایە بۆ خۆم گەڵاڵەی گەورە گەورە دادەڕێژم. پێم وایە شــیاوی هەموو کارێک و هەموو شــتێکم، لە دڵی خۆمدا دەڵێم: ئەرێ ئەوانەی دەســتیان لە گیانیان شتۆتەوە و دەنگیان بە هیچ کوێ راناگا، تەنیا دەتوانن کاری گــەورە گــەورە بە ئاکام بگەیەنن. دوایی بە خۆمم دەگوت: بە کاری چی دێ؟چ ســەمەرێکی هەیە؟.

شــێتییە، هەمووی شێتییە!نا، لێدە و خۆت بکووژە، لێگەڕێ با کەلاکەکەت تووڕ هەڵدرێتە ئەو

نێوەوە، برۆ، تۆ بۆ ژیان دروســـت نەکراوی، بڕوبیانوو مەهێنەوە، وجودی تۆ هیچ بایەخێکی نییە. هیچ کارێکت لە دەست نایە! بەڵام نازانم مردن بۆ هێندە بەنازە؟نازانم بۆ نەهات؟بۆ نەمتوانی کاری خۆم راپەڕێنم و خەڵاســـیم بێ؟حەوتوویەک بوو خۆم جەزرەبە دەدا، ئەوەش هەقەکەم بوو کە نرایە مســـتم! ژار کاری لێنەکردم. جێی بڕوا نییە، من ناتوانم بڕوا بکەم. هیچم نەخواردووە، خۆم وەبەر ســـەرما داوە، سرکەم خواردۆتەوە، هەموو شەوێ پێم وابوو ئازارە باریکەم گرتووە، بەیانی کە راست دەبوومەوە لە دوێنێ باشـــتر و بە کەیفتر بووم، پیاو ئەو قســـانە بە کێ بڵێ؟تلیاکیشم نەکێشاوە. هەمووم بە تێکڕا لەبیرە، نا...جێی باوەڕ نییە.

بە نووسینی ئەوانە هێندێک ئەهوەن بوومەوە، دڵی دامەوە، دەڵێی بارێکی قورسیان لەسەر شانم هەڵگرتووە. زۆر خۆش دەبوو بکرایە هەموو شتێک بنووسی. ئەگەر بمتوانیبایە خەڵک لە بیرەکانی خۆم بگەیەنم، بمتوانیبایە پێیان بڵێم، نا. هەســـتگەلێ هەیە، شـــتگەلێ هەیـــە کە پیاو والێدەکا نەتوانێ بەپێی بیری خۆی خەڵکی تر هەڵسەنگێنێ، زمانی مرۆش وەک خۆی کەمایەسی هەیە.

من گوللەبەندم پێوەیە، ژار کاری لێنەکردم. ترباکم خوارد ســـوودی نەبوو، ئەرێ، من گوللەبەندم پێوەیـــە، هیچ ژارێک کارم لێناکا. ئاخۆ کەی زانیم کە هەموو کوێرەوەرییەکانم بە با چوون، بڕیارم دا تا لەوە زیاتر گووی تێ نەبووە ئەو شـــێت بازاڕییە تەواو بکەم، چووم و گزمووڵە ترباکەکانم لە چەکمەجەی مێزەکەم هێنایە دەر، ســـێ دانە بوون، بە قەت لوولە ترباکێکی ئاسایی دەبوون، هەڵم گرتـــن، ســـەعات حەوت بوو، داوام کرد لە خوارەوە چام بۆ بێنـــن، هێنایان. هەڵمقوڕاند، تا کاتژمێر هەشت کەس بە شوێنمدا نەهات. دەرکەم لە پشتەوە داخست. چووم لەبەر ئەو وێنەیەی بە دیوارەکەوە هەڵواســـرابوو راوەســـتام، تێم روانی، نازانم چ بیرێک بە زەینمدا هـــات، بەڵام لەبەر چاوم مرۆیەکی نەناســـیاو بـــوو، نامۆ بوو، ...بە خـــۆم گوت: ئەو پیاوە چ پێوەندییەکی بـــە منەوە هەیە؟بەڵام ئەو روخسارەم دەناسییەوە. زۆرم دیتبوو. دواتر گەڕامەوە، هەستم بە شۆڕش، ترس و خۆف یان دڵخۆشی نەدەکرد. تێکڕای ئەو کارانەی کردبووم، ئەو کارەی دەمویســـت بیکەم و هەموو شتێک بە بڕوای من بێ سەمەر و پووچ بوون، بە تێکڕایی ژیانم پێ گاڵتە بوو. چاوێکم بە دەوراندەوری هۆدەکەدا گێڕا. هەموو شتەکان لەجێی خۆیان بوون. چوومە بەر ئەو ئاوێنەیەی بە دەرکی کومێدەکەوە بوو. روانیمە روخساری سوورهەڵگەڕاوی خۆم. چاوم هێندێک وێک نا، دەمم تۆزێک کردەوە، وەک مردوو ملم کەچ کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: ســـبەینێ بەیانی ئاوام لێدێ. ســـەرەتا هەرچەندی لە دەرکە دەدەن کەس وەڵام ناداتەوە، هەتا نیوەڕۆ پێیان وادەبێ خەوتووم. دوایی ئاڵقەڕیزی دەرکە دەشکێنن. دێنە ژوورێ و بەو شێوەیە دەمبینن، تێکڕای ئەو بیرانە وەک برووسکە بە پێش چاومدا تێپەڕین.

لیوانە ئاوەکەم هەڵگرت، بە لەســـەرخۆییەوە بە خۆمم گوت ئەوە حەبی ئاســـپرینە و گزمووڵەی هەوەڵیانم قووت دا، بە شڵەژاوییەوە دووهەمی و سێهەمیشیانم بە دوای یەکدا قووت دا. هەستم کرد هێندێک لەرزۆک بووم. دەمم بۆنی ترباکی لێدەهات. دڵەکوتەم وێکەوت. جگەرە نیوە کێشـــراوەکەم خســـتە نێو تەپلەکی جگەرەوە. حەبێکی بۆن خۆشـــم لە گیرفاندا بوو، دەرم هێنا و دەســـتم کرد بە مژینی. دیســـان خۆم لەبەر ئاوێنەدا دیتەوە. چاوێکم بـــە دەوران دەوری هۆدەکەدا گێڕا. تێکڕای

شتەکان لە شوێنی خۆیان بوون. لە دڵی خۆمدا گوتم ئیدی کار لە کار ترازاوە . سبەینێ ئەفلاتوونیش ناتوانێ زیندووم کاتەوە! جلەکانم لەسەر چرپای تەنیشت نوێن و بانەکە رێک و پێک کرد، لێفەکەم بەسەر خۆمدا دا. بۆنی ئۆدکلۆنی لێدەهات. دوگمەی چراکەم داکێشا. هۆدەکە تاریک داهات. بەشێکی دیـــوار و خوارەوەی تەختەکە بـــە رووناکییەکی لاواز کە لەودیوی شووشـــەی پەنجەرەکەوە دەهاتە ژووری، روون داگەڕابـــوو. ئیتـــر هیچ کارێکم نەبوو. چاک یان خـــراپ کارم گەیاندۆتە ئێرە . خەوتم، تلامەوە، لەوە دەترسام نەکا کەسێ بۆ ئەحواڵ پرسیم بێ و قۆشمەگەری بکا، هەرچەند بە هەمووانم گوتبوو کە چەند شـــەوێکە نەخەوتووم، هەتا لێم گەڕێن، لەو ســـاتەدا زۆرم لە شـــت دەکۆڵییەوە، دەتگوت رووداوێکی ســـەیرم بۆ هاتۆتە پێش، یاکوو سەفەرێکی خۆشم لەبەرە، دەمویست بە باشی مردن بچێژم و هەســـتی پێ بکەم. هۆشـــم جەم کرد. بەڵام گوێم لـــە دەرەوە بوو. لەگەڵکوو دەنگی پێیـــەک دەهات دڵـــم نەدەما، پێڵوەکانم دەقووچاند. دە دەقیقەیەک یا شـــتێک زیاتر رابورد و هیچ هەواڵێک نەبوو، بە بیری جۆراوجۆرەوە سەری خۆم قاڵ کرد، بەڵام لەو کارەی خۆم نەدەترسام و نە پەژیوانیش بووم، تاکوو هەستم کرد گەردەکان دەست بەکار بوون، لە پێشدا قورس بووم، هەستم بە ماندووبوون دەکرد، ئەو هەستە زیاتر لە ناخمدا بوو، وەک ئەو دەمانەی خواردەمەنی بە باشی هەزم نەبێ. دوایی ئەو هەســـتە بەرەو سینگ و سەریشـــم پەرەی سەند. دەستەکانم بزاوت. چاوم کردەوە . زانیم هۆشـــم لەســـەرخۆیە . تینووم بوو، دەمم وشک هەڵاتبوو، بە زۆر تفی دەمم قووت دەدا، لێدانی دڵم کەم دەبۆوە، دوای ماوەیەک هەستم دەکرد هەوایەکی گەرم و خۆش لە تەواوی گیانمەوە دەچێتە دەرێ. زۆرتر لە بەشـــە زەقەکانی لەشەوە بوو. وەک سەری قامکەکان، نووکی لووت و هتد...هەر لەو ساتەشدا دەمزانی دەمەوێ خۆم بکووژم، وەبیرم هاتەوە کە ئەو هەواڵە بۆ دەستەیەک ناخۆشە و بۆ خۆم پێم سەیر بوو، تێکڕای ئەوانە وەک منداڵۆچکە پووچ و پێکەنیناوی بوون. وام بیر کردەوە کە ئێستا ئاسوودەم و بە ئاسوودەییش دەمرم. ئیدی خەڵکی خەفەتبار بن یان نا، بگرین یان نەگرین، چ بایەخێکـــی هەیە . زۆرم پێ خۆش بوو ئەو کارە جێبەجێ بێ، دەترســـام نەبادا جووڵە بکەم یان بیرێک بکەمەوە پێش بە کارتێکردنی تریاکەکە بگرێ. زۆرتر لەوە دەترسام کە نەکا دوای ئەو هەموو تەقەللایە بە زیندوویی بمێنمەوە . دەترســـام ئاویلکە ناخۆش بێ و من لە ناهومێدیدا هاوار بکەم یا بانگی کەســـێک بکەم کە بە فریامەوە بێ. بەڵام هەروەک گوتم هەرچەندەش ســـەخت و ناخۆش بێ، تریاکەکە هێدی دەکاتەوە و من هەست بە هیچ ناکەم. خەوم لێدەکەوێ، ناتوانم لەجێی خۆم ببزووم یان شتێ بڵێم، دەرکەش لە پشتەوە داخراوە...

ئەرێ بە باشی لەبیرمە . ئەو بیرانە لە مێشکمدا سەریان هەڵدا، چرکەی بەردەوامی کاتژمێرەکەم دەبیســـت، دەنگی پێی خەڵکم دەبیســـت کە لە میوانخانەکەدا دەڕۆیشـــتن. دەتگوت گوێم تیژتر و سووکتر بووە . هەستم دەکرد گیانم چڵ دەدا، دەمم ببوە پەڵاس، سەرم وەژان کەوتبوو، وەک بێهۆش کـــەلا کەوتبووم، چاوم نیوە قووچاو بوون، هەناســـەم جارێ توند و جـــارێ هێور دەهاتە دەرێ. لە تەواوی کونەکانی پێستمەوە ئەو گەرما خۆشە هەڵدەقوڵا دەرێ. دەتگوت منیش لەگەڵی دێمە دەرێ. زۆرم پێخۆش بوو رەوتەکە بەپەلەتر بێ، لە دڵخۆشـــییەکی ســـەیردا بووم، چۆنم پێ خۆش با بیرم

دەکردەوە . هەر جووڵابامەوە هەســـتم دەکرد پێش بە هاتنەدەری ئـــەو گەرمایە دەگرم. هەرچەندەی رەحەتتر خەوتبام باشـــتر بوو. دەستی راستەم لەژێر سینگم دەرکێشا، تلامەوە، کەوتمە سەر پشت و راکشـــام. هێندێک ناخۆش بوو. دیسان ئەو حاڵەم لێهاتەوە و کارتێکردنی تریاکەکە خێراتر بۆوە . دەمزانی و دەمویســـت هەســـت بە مردن بکەم. هەستەکانم بەهێز و گەورە ببوونەوە، پێم سەیر بوو بۆچی خەو نەیبردوومەتەوە؟ دەتگوت تەواوی هەســـتم بە شـــێوەیەکی خۆش و بەتام لە لەشـــمەوە دەرژێتە دەرێ. دڵم هێدی ترپەی دەهات. بە هێوری هەناســـەم هەڵدەکێشـــا، پێم وایە دوو ســـێ سەعات تێپەڕی، لەو ماوەیەدا کەسێک لە دەرگەی دا، زانیم دراوسێکەمە، وەڵامم نەداوە و نەمویست لە جێی خۆم ببزووم. چاوم هەڵێنا و دیســـان قووچاندمـــەوە . دەنگی کرانەوەی دەرکەی وەتاغەکەم بیســـت. ئەو دەستی شوشـــت، فیتووی لێدەدا، گوێم لە هەموو ئەوانە بوو. حەولم دەدا بیری خۆش و بە تام بکەمەوە، بیرم لە ســـاڵی رابردوو دەکردەوە، ئەو رۆژەی لە کەشـــتیدا دانیشتبووم، سازیان لێدەدا، شـــەپۆلی زەریا، جۆلانەی کەشـــتی، کیژۆڵەیەکی ژیکەڵە کە رووبەڕووم دانیشتبوو، لەو بیر و فیکـــرەدا مەلـــەم دەکرد، بە دوایدا هەڵدەهاتم، دەتکوت باڵم لێ رواوە و لە حەوادا رمبازێن دەکەم، ســـووک و چالاک بووم، بە شـــێوەیەک کە لەگوتن نایە . جیاوازییەکەی وەک ئەوە وایە پرشنگی ئەو رووناکییە ئاســـاییەی دەیبینین، لە کەیفی تریاکدا وەهای لێدێ کە دەڵێی شەبەنگی رووناکایی لە پشت چلچرایەک یان ئەڵماسێکەوە دەبینی، کە بە رەنگی جۆراوجۆر دابەش دەبێ.

لەو ســـاتەدا ئەو خەیاڵ و بیرە پووچانەی کە بـــە بیر پیاوەوە دێن، هەروەک جادوو پیاو جادوو دەکەن، سەرسوورهێنەرن، هەر خەیاڵێکی سرک و لە خۆوە شێوەیەکی بەشکۆ و لەبەردڵان بەخۆیەوە دەگـــرێ، بێتـــوو تاپۆ یان روانگەیـــەک لە بیری مرۆڤەوە تێپـــەڕ بێ، یەکجار گـــەورە دەبێ، فەزا هەڵدەماسێ، تێپەڕینی زەمان هەست پێناکرێ.

لەو ساتەدا زۆر قورس ببووم. هەستم بەرزتر لە لەشم شەپۆلی دەداوە، بەڵام هەستم دەکرد خەوم لێنەکەوتووە . دوایین هەســـتێک کە لە کەیف و مەســـتبوونی تریاکەوە لە مندا پشکووت و لەبیرمە، ئەوە بوو کە:قاچەکانم سارد و سڕ ببوون، لەشم نەدەبزووت، هەستم دەکرد دەڕۆم و دوور دەکەومەوە، بەڵام لەگەڵکوو کارتێکردنی تریاکەکە تەواو دەبوو خەم و خەفەتێکی بێ ســـنوور گەمارۆی دەدام، هەستم دەکرد هۆشم لەسەر خۆیە . زۆر دژوار و ناخۆش بوو. سەرمام بوو، نیو سەعاتێک زیاتر وەک مێوژۆکە هەڵلەرزیم. دەنگی وێک کەوتنی ددانەکانم دەبیسترا، دواتر یاوم گرت، یاوێکی سووتێنەر، هەموو لەشـــم شەلاڵی ئارەقە بوو، دڵم دەگیرا، پشووم سوار ببوو. یەکەم شتێ بیرم لێکردەوە ئەوە بوو کە هەرچیم رســـتبوو بـــۆوە خوری. نەکرا، ئەو جۆرەی کە دەبوو بلوێ، نەلوا. ســـەرم لە گیان ســـەختی خۆم ســـووڕ مابوو. دەمزانی کە هێزێکی رەش و بەدبەختیەکی لە گوتن نەهاتوو لەگەڵم مەچەکە دەگرێ. بە زۆری لەسەر جێیەکەم هێندێک خۆم راست کردەوە، دوگمەی چراکەم سووڕاند، هەڵبوو، نازانم بۆ دەستم بەرەو ئەو ئاوێنە بچکۆلەیەی لەسەر چرپای پەنا تەختەکە دانرابوو، درێژ کرد. کە روانیم دەم و چاوم هەڵئاوســـابوو، رەنگم بە رووەوە نەمابوو، فرمێسک لە چاومەوە دەرژایە خوار، دڵم زۆر بە توندی لە ترپەدا بوو، بە خۆمم گوت لانی کەم دڵم تێکەڵ هات! چراکەم کووژاندەوە

و لە جێیەکەدا کەوتم.

نـــا، دڵـــم تێکەڵ نەهات، ئەوڕۆ باشـــترە. نا، وەک گوێزی ئازا وام! دکتـــۆر هاتە لام، گوێی دایە ترپەی دڵم، گوێی دایە کوتەی دەمارەکانم، چاوی لە زمانم کرد. پلەی یاوی لەشمی گرت. هەروا لەو کارە ئاساییانەی کە هەموو دکتۆرەکان هەر لە گەڵکوو هاتنە ژوورەوە دەیکەن و لە هەموو دونیاش هەروا باوە.

هێندێکـــی دەوا و دەرمانـــی خۆماڵی دامێ، هەر نەیزانی مـــن چ دەردمە! کەس نازانێ چ دەردێکم هەیە. ئەو دەوایانە دۆدی و بۆدین و هەر بۆ گاڵتە دەبن، ئەوە لە ســـەر ئەو چرپایە حەوت هەشـــت جۆرە دەوایان بۆ ریز کردووم، من لەبەر خۆمەوە پێکەنینم دێ. بە خوای عەجەب شێتخانەیەکە!

چرکـــە چرکـــی کاتژمێرەکە هـــەر وا لە پەنا گوێمەوە دەنگی دێ. دەنگی ســـیگناڵی ماشـــین و دووچەرخە و هارەی ماشینە گەورەکان لە دەرەوە دەهاتنە گوێ. دەڕوانمە کاغەز دیوارییەکە، گەڵای باریک و ئەرخەوانی ســـیر و هێشۆی گوڵی ســـپی پێوەیە، لە سەر چڵەکانی ناو بەناو دوو باڵندەی رەش رووبەڕووی یەک هەڵنیشتوون. سەرم چی تێدا نییە. دڵە کزەمە، لەشم دەڵێی دارکاری کراوە. ئەو رۆژنامانەی فرێم داونەتە سەر کومێدی لیباسەکان، هەر بەو شێوە تایبەتە ماونەتەوە، کە لێیان دەڕوانـــم هەر دەڵێـــی هەموان نامۆ و غەریبەن، خۆم لەبەر چاوی خۆم بێگانەم، پێم ســـەیرە چۆنە زیندووم؟ برسیم دەبێ، بۆچی دەخۆم؟ بۆچی بەڕێدا دەڕۆم؟ بۆچی لێرەم؟ ئەو خەڵکانەی دەیانبینم کێن و چییان لێم دەوێ؟...

ئێســـتا ئیدی خۆم بە باشی دەناسم، هەر بەو شێوەیەی کە هەم، بێ کەم و زۆر. هیچم لەدەست نایە، ماندوو و مردوو لەســـەر تەختەکە کەوتووم. ســـات لەگەڵ سات بیرەکانم لە دەور و خولدان، لە بازنەی ناهومێدیدا. حەوســـەلە و تاقەتم بەسەر چووە. چەندە تاڵ و ترسێنەرە ساتێ مرۆ هەست بە بوونی خۆی دەکا، کە دەڕوانمە ئاوێنە بە خۆم پێدەکەنم، روخسارم لەبەر چاوم هێندە نامۆ و بێگانە و گاڵتەجاڕانەیە هەر نەبێتەوە...

ئـــەوە چەند جار ئەو بیرەم بە زەیندا هات: گوللەبەندم پێوەیە، گوللەبەند کە لە ئەفســـانەکاندا نووســـیویانە، ئەوە بەســـەرهاتی منە. موجیزات بوو. ئێســـتا بڕوام بە هەموو قسەیەکی گەوجانە و درۆ و دەلەســـەیەک هەیە، بیری ســـەیر و سەمەرە بە بەرچاومدا تێدەپەڕن. موجیزات بوو، ئێستاکە بۆم روون بۆوە کە خودا دوو چین گیانلەبەری دروســـت کردووە، بەختەوەر و بەدبەخت. پشـــتیوانی دەســـتەی یەکەمە و جەزرەبە و ئازاری دەســـتەی دووهەمیش هەر بە دەســـت خۆیان پەرە پێدەدا. ئێستا هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە هێزگەلێکی دڕندە و ناچیزە و فریشتەی بەدبەختی لە گەلێ کەس بوونەتە دۆڵپا.

ئاخرەکەی بە تەنیا مامەوە، ئێســـتا دکتۆر رۆیشـــت. کاغەز و پێنووســـەکەم هەڵگرت. دەمەوێ بنووسم، نازانم چی؟ یان ئەوەی کە شتێکی وا شک نابەم، یان لەبەرئەوەی کە یەکجار زۆرن، ناتوانم بنووســـم، ئەوەش بۆخۆی ماڵ وێرانیە. نازانم دەتوانم بگریم یان نا. رەنگە ئەگەر بمتوانیبایە بگریم هێندێک دڵی ئەهوەن کردبامەوە! ناتوانم، وەک شـــێت و شـــوورەکانم لێهاتبوو. روانیمە ئاوێنە، قژم

تێکئاڵابوون. چاوم زەق و بێ جووڵە بوون، پێم وایە هەر نەدەبوو دەم و چاوی من ئاوا بووبێ، زۆر کـــەس رواڵەتیـــان لەگەڵ بیریان جیاوازی هەیە . ئیدی ئەو بیرە جاڕزم دەکا. هەر ئەوەندە دەزانم کە رقـــم لـــە خۆمە . کاتی خواردن رقم لە خۆمە، کە بـــە رێدا دەڕۆم رقم لە خۆمە، بیر دەکەمەوە رقم لە خۆمە . زۆر قۆشمەم!

چەند ترسێنەرم!نا، ئەوە هێزێکە کە لە دەستەڵاتی مرۆ بەدەرە، ئەوە ژاری مار بوو، ئیدی بڕوام بەو جۆرە شـــتانە هەیە! ئیدی هیچ شتێک کارم تێناکا. ســـیانوورم خوارد کاری لێنەکردم، تریاکم خـــوارد هەر زیندووم! ئەگەر ئەژدیهاش پێوەم دا ئەژدیهاکـــە دەمرێ! نا، کەس بڕوا ناکا، ئاخۆ ئەو ژارانە خراپ ببوون؟ ئاخۆ بەڕادەی پێویســـت نەبوون؟ ئاخۆ لە رادەی ئاســـایی زیاتر بوون؟ ئاخۆ لـــە کتێبی دکتۆریدا رادەی خواردنی ژارەکەم بە هەڵە چاولێکردبوو؟ ئاخۆ دەســـتی من ژار دەکاتە نۆشـــاتر؟ نازانم ئەو بیرانە ســـەدان جار لە مێشـــکمدا دێن و دەچن، تازە و سەیر نین. دێتەوە بیرم بیســـتوومە ســـاتێ کە چواردەوری دووپشـــکێک بە ئاور بتەنن بە خۆیەوە دەدا، ئاخۆ دەوراندەورم جەغزی ئاور نیە؟

لە بەر پەنجەرەی وەتاغەکەم، لەســـەر لێواری رەشـــی شیروانییەکە کە ئاوی تێدا کۆبۆتەوە، دوو چۆلەکە هەڵنیشـــتبوون، یەکیان دەنووکی لە ئاوەکە وەردەدا، ســـەری قیت دەکاتەوە، ئەوی تر لە تەنیشـــت ئەوەوە مات بـــووە و خۆی دەدۆزێ. من جووڵامەوە، هەردووکیـــان کەوتنە جریوە جریو و پێکەوە لە شەقەی باڵیان دا. هەور و هەڵایە، جار جار لە پشت پەڵە هەورەکانەوە هەتاو رەنگ پەڕیو دێتە دەر و خۆ دەنوێنێ؛ ماڵە بەرزەکانی رووبەڕوو هەموان دووکەڵاوی، رەش و خەفەتاوین و لە ژێر ئەو هەوا قورس و بارانیەدا ماونەوە . دەنگی دوور و کزی شـــاری دێتە گوێ. ئەو وەرەقە بەدفەڕانەی فاڵم پێ دەگرتنەوە، ئەو وەرەقە درۆزنانەی فریویان دام، لەوێ لە دەخیلەی مێزەکەمدان. لە هەموو شتێ سەیرتر ئەوەیە ئێستاش هەر فاڵیان پێ دەگرمەوە!

چ دەکرێ؟چارەنووس لە من بە خۆوەترە .

خـــۆش دەبوو پیاو هەر بەو ئەزموونانەوە کە لە ژیانی هەیە بیتوانیبا دیســـان لەدایک بێتەوە و ژیانی خۆی سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە! بەڵام کام ژیان؟ ئاخۆ لەدەست مندایە؟ سوودێکی هەیە؟ هێندێ هێزی بێ بایەخ و ترســـێنەر بەسەرماندا زاڵن، هی وا هەیە ئەستێرەیەکی شووم چارەنووسی بۆ دیاری دەکا. لە ژێر باریدا ورد دەبن و دەشیانەوێ ورد بن...

ئیتر نە ئاواتێکم هەیە نە قینیشم لە دڵدایە، ئەوەی لە مندا بۆنی مرۆڤایەتی لێ بێ لەکیس چووە . بۆ خۆم لێگەڕام ون بێ. لە ژیاندا مرۆڤ یان دەبێ ببێتە فریشتە یان ئینسان یان حەیوان. من نەبوومە هیچ کام لەوانە . ژیانم بۆ هەمیشە لێ ون بوو. من خۆ بەزل زان، ناشی و بێ داڵدە لەدایک بووم، ئیدی ئێســـتا مەحاڵە بگەڕێمەوە و رێیەکی تر بگرمە بەر. ئیتر ناتوانم وەشـــوێن ئەو سێبەرە بێ ســـەمەرانە کەوم، لەگەڵ ژیان مەچەکە بگرم، تێک هەڵچم، ئێوە کە پێتان وایە لە راســـتەقینەدا دەژین کام بەڵگەی پتەو و بڕوا پێکراوتان بە دەســـتەوەیە؟ من ئیتر نامەوێ نە کەس ببەخشـــم و نە ببەخشـــرێم. نە بۆ لای چەپ بڕۆم و نە بەرەو راســـت هەنگاو بنێم، دەمەوێ چاو ببڕمە داهاتوو،

دەمەویٚ رابردوو لەبیر بەرمەوە.

نا، ناتوانم لەو چارەنووس و سەربردەیە خۆ بشارمەوە، ئەو بیرە شێتانە و ئاڵۆزە، ئەو خەیاڵاتە سـرک و برووسکە ئاسـایانە بە بیرمدا دێن، ئاخۆ ئەوانە راسـتەقینە نین؟ هەرچییەک بێ لە چاو بیرە بەجێ و رێیەکانی من سروشـتیتر دەنوێنن. پێم وایە ئازادم، بەڵام ناتوانم لە بەر چارەنووسـی خۆم بە حاڵ خۆڕاگری بکەم. هەوسارم لە دەستیدایە، بە ئەولاولام دەکێشێ. هیچ و پووچی، هیچ و پووچی ژیان کە نە دەتوانن لە دەسـتی دەرباز بن و نە دەتوانن لەگەڵی دەسـتە و ئێخەبن، ژیانی گەوج و سەرکوێر.

ئێسـتا ئیتر نە ژیان دەبەمە سـەر و نە خەویشـم لێکەوتووە، نە هیچم خۆش دەوێ و نە رقیشم لە هیچە. من بوومەتە دێوناس و هاودەمی مەرگ. تاقانە هاوەڵمە، تەنیا شتێکە کە دڵخۆشیم دەداتەوە. گۆڕسـتانی مۆناپارسـم وەبیر دێتەوە، ئیتر ئێرەیی بە مردووەکان نابەم، منیش سەر بە دونیای ئەوانم، منیش لەگەڵیانم، من زیندەبەچاڵێکم...

ماندوو بووم، ئەو قسە قۆڕانە چییە نووسیم؟ بە خۆم دەڵێم: برۆ شێتۆکە، کاغەز و قەڵەم توورِ هەڵدە، فرێی دە، قسەی هەڵیت و پڵیت بەسە. نەکا ئەو قسە قۆڕانە بکەونە دەست کەسێک، (ئەگەر وابێ ئەو کەسـە چۆنم هەڵدەسەنگێنێ) بەڵام من رووی کەس نامگرێ. بایەخ بۆ هیچ شتێ دانانێـم. بـە دونیا و ئەوی تێیدایە پێدەکەنم. هەرچەند بیری ئەوان لەبارەی منەوە سـەیریش بێ، نازانن من لەوەو پێش زۆر لەوە سەیرتر خۆم موحاکەمە کردووە. ئەوان بە من پێدەکەنن، ئیدی نازانن من زیاتریان پێ پێدەکەنم، من لە خۆم و لە هەموو خوێنەرانی ئەو قسە قۆڕانە بێزارم.

*ئەو یادداشـتانە لەگەڵ دەسـتەیەک وەرەقە لە جەعبەی مێزەکەیدا بوو، بەڵام بۆ خۆی لە جێیەکەیدا کەوتبوو و هەناسە هەڵکێشانی لەبیر چووبۆوە.

پاریس ۱۳۰۸/۱۲/۱۱

## سەرچاوە:

هدایت، صادق(۱۳۷۷)زنی که مردش را گم کرد؛گزیده داستانهای کوتاه، تهران:انتشارات روزگار

# نەخۆشییەکی سەیر

نووسینی: ئەلبێرتۆ مۆراڤیا
لە فارسییەوە: یاسین عومەر

ڕۆژێک دوو زانا لەو وڵاتە دوورەوە، گەیشتن. دەیانوت بە دوای ڕێگاچارەیەکەوەن بۆ نەخۆشییەکی درم کە لەوێ بڵاو بۆتەوە. هەر یەکسەر دوای گەیشتن، چوونە سەردانی کاربەدەستانی پزیشکیی نەخۆشخانەکان و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە. لە ئەنجومەنی زانایانی ئێمەدا پرسیاریان لێکرا، باسی کام نەخۆشی دەکەن، یەکێکیان ئەم ڕونکردنەوەیەی خوارەوەی ڕاگەیاند:

«نەخۆشییەک لەپڕ دەردەکەوێت، بێ سەرهەڵدانی تا و لەش داهێزران یان نیشانەگەلێکی لەم چەشنە. لەبەرئەوەی نەخۆشییەکە بە شێوەی گۆڕانێکی سەرەکی لە دیدێکی واقیعیانەوە خۆی دەردەخات، بۆیە دەڵێن نەخۆشی واقیعیەت. بە دەربڕینێکی دیکە نەخۆش شەوێک دەنوێت، لە بارێکدا کە دنیا چۆنە ئاوای دەبینێتو بەیانی ڕۆژی دواتر لە خەو هەڵدەستێتو لە بارێکدا دنیا بەو جۆرە نەبووەو نییە دەیبینێت. ئەو کات دەچێتە قۆناغێکی نەخۆشییەکەوە کە پێی دەڵێن قۆناغی بێباوەڕی. نەخۆش بەردەوام چاوانی هەڵدەگلۆفێت، سەری دەجوڵێنێت، چڕنۆک لە خۆی دەگرێت، ئاوی سارد دەپرژێنێت بە دەموچاویدا، تەنانەت خۆی دەسوتێنێت یان خۆی بریندار دەکات، بە کورتییەکەی، کردارگەلێکی لێ ڕوودەدات کە مرۆڤ کاتێک بەو شێوەیە دەیبینێت، باوەڕی پێ ناکات، بە خەیاڵی ئەوەی خەو دەبینێت یان مەستە.

قۆناغی بێباوەڕی زۆر دەخایەنێت، نەخۆش هەموو شەوێک بەو ئومێدەوە دەنوێت کە ڕۆژی دواتر دوای لە خەوهەستان، دوبارە نیگایەکی ئاسوودەو وێنەیەکی ئارامیی هەمیشەیی لە شتەکان بدۆزێتەوە. لەدوای چەند ڕۆژێک نەخۆش بە خەیاڵی ئەوەی کە ئەگەری چارەسەرکردن هەیە، دەچێتە سۆراغی دەواو دەرمانگەلێکی کاتی، لەم ماوەیەدا نەخۆشییەکە وەک قارچک گەشە دەکات.

بەڵام هەروەکو وتم قسە سەبارەت بە دەرمانگەلێکی کاتییە، گەر نەمانەوێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بڵێین دەواو دەرمانی فێڵبازان. نەخۆش زۆر زوو تێدەگات دەرمانەکان بێ سوودنو نەخۆشییەکەش ماوەکەی خۆی تەواو دەکات، ئەو کات بێ هیوا و نائومێد دەبێت. ئیدی نە کار دەکاتو نە پێدەکەنێتو نە نان دەخوات و نە دەیپەرژێتە سەر خێزانەکەی. واز لە هاوڕێکانی دەهێنێت، ڕۆژ و ڕۆژگاری لە ناو پێخەفدا بەسەر دەبات و هەوڵ دەدات بنوێت. دەڵێی مۆتەکەی ناو مۆتەکەیە، مۆتەکەی خەوەکەی لە مۆتەکەی بێداری پێ باشترە. قۆناغی نائومێدی لە قۆناغی بێباوەڕی درێژترە. سەرئەنجامیش نەخۆشەکە دەمرێت. لێرەدا پێویست ناکات باسی ئەوە بکەم کە ئەو بە ویستو ئارەزووی خۆی دەمرێت، لەبەرئەوەی پێیوایە مردن لەبەرامبەر ئەو نەخۆشییەدا هیچە. وەلێ مردنەکەیشی تایبەتمەندیی خۆی هەیە. نەخۆش، ڕێک لە ساتەوەختی مردندا، وابیردەکاتەوە کە چاکبۆتەوە، لەپڕ ڕوخساری ڕووناک دەبێتەوە، چاوەکانی دەدرەوشێنەوەو وەک بڵێی سوپاسگوزاری خوا بکات دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوەو چرکەیەک دواتر دەمرێت.»



بەڵام ئەم ڕوونکردنەوە وردەی نەخۆشییەکە زاناکانی ئێمەی قایل نەکرد. ئەوان ناڕەزایەتییان لەبەرامبەر بێگانەکەدا دەربڕیو وتیان کە ئەو تەنها نیشانە دەرەکییەکانی نەخۆشییەکەی باس کردووەو نەیوتوە کە نەخۆشییەکە چ شتگەلێک دەگرێتەوە و ئەوەی باس نەکردووە کە چ گۆڕانێک لە بینینی واقیعیەتدا ڕودەدات.

بێگانەکەیش، سەرەڕای ئەوەی ڕاستی ئەم قسانەی دەزانی لە وەڵامدا وتی: «وەسفکردنی ئەو گۆڕانانە هێندەی باسکردنی نیشانە دەرەکییەکانی نەخۆشییەکە سادە نییە، لەبەرئەوەی کە ئەم گۆڕانکارییانە بەڕاستی سەیرو نائاسایینو جێگەی باوەڕ نین. بۆ پەی بردنی ئەم گۆڕانکارییانە دەکرێت بەراورد بکرێن بە وەهومی گیانەوەران، بەو دێوو درنجە خەیاڵییانەی کە لەکاتی ورێنەدا لای مەیخۆرە بێ چارەسەرەکان دێتە پێش.» پاشان وتی: «لە ڕاستیدا ئەم نەخۆشییە بە (وشکە مەیخۆریی) ناو دەبرێت، لەبەرئەوەی ئەم جۆرە ژەهراوییبوونە بەواتەی ئەوەی کە نەخۆشەکە بەبێ ئەوەی هەرگیز لێوی لە مەی دابێت یان هەر جۆرە مادەیەکی ژەهرینی تری وەرگرتبێت بەرگەی تەواوی نیشانەکانی ژەهراوی بوونێک دەگرێت.»

لە هەمان کاتدا، بێگانەکە لە ژێر کاریگەری ئەو پرسیارانەدا، دانی بەوەدا نا کە هەروەکو پۆلیزۆ دەڵێت لەم جۆرە شێتییەدا هیچ یاساو ڕێسایەک نییە، واتە سەربباری جیاوازی زۆر لە وەسفکردنی نەخۆشەکاندا، ئەوانیش دەتوانن تەنها لە گروپێکی کلینکیدا بن، هیچ کامێکیشیان لە لۆژیک، ڕێسا و تەرتیبو پێشبینیکردن بێ بەهرە نین. داوایان لەو بێگانەیە کرد کە بۆ نمونە باسی یەکێک لەو ورێنانە بکات، کارێک کە ئەو خێرا بە وردیو وردەکاریی تەواوەوە ئەنجامی دا.

ئەو کات ئەم ڕوداوە ڕویدا: کاتێک بێگانەکە خەریک بوو باسی دەکرد، پرۆفیسۆرەکانی ئێمە بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریان دەکرد، چونکە ئەو شتەی ئەو بە وەهمو مەحاڵو نادیاریی نەخۆشییەکەی دەناساند هیچ نەبوو بێجگە لە چەند لایەنێکی ئاشناو لێکچوو بە دنیای ئێمە، تەنانەت دەتوانین بڵێین هەر دنیاکەی خۆمانە.

بە دەربڕینێکی دیکە، نەخۆشییەکە ئەم حاڵەتانەی دەگرتەوە: نەخۆش لەپڕ لەبری بینینی واقیعیەتی وڵاتەکەی خۆی، واقیعیەتی وڵاتی ئێمەی دەبینی، بە هەمان دابونەریتەوە، هەمان ڕواڵەتی فیزیکیو هەمان تایبەتمەندی. نمونەیەکی بەم شێوەیە: نەخۆش هەندێ جار بانگەشەی ئەوە دەکات کە کۆمەڵە بوونەوەرێکی زەبەلاحی پڕ لە دەنگو هەرا لە ئاسماندا دەبینێت کە ئەم شێوەو ئەو شێوە و ئەم تایبەتمەندی و ئەو تایبەتمەندییەیان هەیە. «فڕۆکە»، زانایانی سەراسیمەی ئێمە یەکسەر بیریان بۆ فڕۆکە چوو. بەڵام لێگەڕان کە ئەو تا کۆتایی قسەکانی بکات، واتە تا کۆتایی وێنەیەکی وردو زیندووی شارستانیەتی جوانی خۆرئاوایی ئێمە بدات بەدەستەوە. پاشان، کاتێک ئەو بێدەنگ بوو، بۆ چەند خولەکێک بێدەنگییەکی قوڵ باڵی کێشا. هیچ کەس زاتی قسەکردنی نەبوو. سەرئەنجام یەکێک لە لاوترینی زاناکان پرکێشی کردو وتی:

«وەسفکردنی ئێوە بۆ نەخۆشییەکە زۆر سەرنج ڕاکێشە.. بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە هاتوویت بۆ ئێرە تا چارەیەکی بۆ بدۆزیتەوە هەڵەیەکی گەورەت کردووە.»

بێگانەکە پرسی: «بۆچی؟»

زانا لاوەکە سەیرێکی ئەملاو ئەولای خۆی کردو کاتێک بینی کە هەموو بە ڕوانینەکانیان هانی دەدەن، زاتی دایە بەر خۆی و وتی: «لەبەرئەوەی ئەو شتەی کە ئێوە بە نەخۆشی ناو دەبەن، لێرە حاڵەتێکی سروشتییەو هیچ کەس تەنانەت لە خەونیشدا نایبینێت کە ئەوە بە نەخۆشی دابنرێت... ئێمە هەموومان لەگەڵ واقیعییەتێکدا دەژین هاوشێوەی ئەوەی کە نەخۆشەکانی ئێوە وێنای دەکەنو لە جیهانی ورێنەدا دەیبینن... بەم پێیەش یان ئەوەتە ئێمە نەخۆشین، لەم حاڵەتەشدا دەبێت خۆمان بەدوای چارەسەرێکەوە بین کە ئەسڵەن بۆ ئەم کارە هەست بە پێویستییەک ناکەین، یان ئەوەتا کە ئێوە نەخۆشنو نەخۆشەکانتان ساغن.»

بێگانەکە هیچ نەگۆڕاو تەنها ئەوەی وت: «ئەگەر ساغ بوونایە، نەدەمردن.»

لەم کاتەدا قەرەباڵغیو جەنجاڵییەک دروست بوو. هەندێک بڕوایان وابوو کە دەبێت بێگانەکە یەکسەر و بێ دواکەوتن لە نەخۆشخانەیەکی دەروونی بخەوێنرێت، ژمارەیەکی دیکە دەیانوت کە ئەو فێڵبازێکەو هیچی دیکە، ژمارەیەکی دیکەش بەناوی شارستانیەتی پایەدارو پڕ شانازیمان،

ڕەخنەیان هەبوو، لەگەڵ تاوانبارکردنی بێگانەکەشدا خوازیاری دەستگیرکردنی دەستبەجێی بوون. بەڵام یەکێک لە زاناکان کە پیرەمێردێکی زۆر بەئەزموون و تا ئەو کاتەیش قسەیەکی نەکردبوو، وتی: «ئەو ئالۆزییەی کە لێرە بەرێمان خستووە، زۆر دزێو و ناشرینە.. لەبری مشتومڕو کۆڵینەوە سەبارەت بەوەی کە ئەم پیاوە شێتە یان ساختەچیو تاوانبار، بەلای کەمەوە با لێی بپرسین واقیعیەتی وڵاتەکەی چۆن چۆنییە... ئایا واقیعیەتیەکە جیاواز لە واقیعیەتی ئێمە.» پاشان بە تانە و تەشەرەوە ئەوەشی بۆ زیاد کردو وتی: «دەتوانین زانیاریمان دەربارەی لێکۆڵینەوەی زانستی نەژادەکان بەرز بکەینەوە... بەبێ دەموەردان لە شانازییەک کە ڕەنگە لەبەر پڕوپاگەندەیەکی جوان بە ناوی «وشکە مەیخۆری» ببێتە نسیبی یەکێک لە ئێمە. ڕەنگە بێئەوەی کە بزانین، ئالودەی ئەلکوهول بین، بەم شێوەیە لانی کەم پرۆفیسۆر بەردەوامی دەدات بە گەشتی لێکۆڵینەوەکەی بۆ وڵاتەکەی ئێمە.»

بەڵام ڕستەکان تەواو نەکرا، بێگانەکە لە وەڵام بە پرسیارە پڕ لە نیگەرانییەکانی زاناکانی ئێمە وتی کە هیچ قسەیەکی بۆ وتن پێ نییە. وڵاتەکەی ئەو زۆر جیاوازە لە وڵاتەکەی ئێمەو لەبەر ئەوەی کە هیچ وشەیەک بۆ پێوان بوونی نییە، ئاستەمە بتوانێت ڕوونی بکاتەوە کە وڵاتەکەی چ جۆرێکە.

یەکێک لە زاناکانی ئێمە وتی: «بەڵام ساتێک ڕامێنن، لانی کەم سروشتێکی یەکسانتان هەیە: درەخت، ڕووبار، چیا، دەریا..»

ئەو لە وەڵامدا وتی: «سروشت؟ ڕەنگە هەمانبێت، بەڵام من هیچ کاتێک هەستم پێ نەکردوە.»

وەڵامی سەرجەمی پرسیارەکانی دیکەش هەر هەموویان وەکو ئەو بوو. سەرئەنجام ڕوون بۆوە کە بێگانەکە نەک هەر تەنها لە وڵاتێکی جیاوازەوە هاتووە، بەڵکو دنیاکەی ئێمەشی بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی کە ئێمە دەمانبینی، دەبینی.

بەم شێوەیە دانیشتنەکە بێ ئەنجام کۆتایی هات. لەگەڵ ئەوەشدا، شوێنی خۆیەتی ئەو ئەنجامگیرییە نیگەرانکەرەی کە بێگانەکە پێی گەیشت بگێڕینەوە. ئەو بەر لە جێهێشتنی ئێرە وتی کە نەخۆشەکانی وڵاتەکەی ئەویش بە نیگەرانییەوە دەپرسن کە واقیعیەتێک سەروەختێک تیایدا دەژیانو زۆر بۆی دڵتەنگن، چۆنچۆنی بووە، دروست یەکێک لە بەڵگەکانی سەختیو ناهەمواریی نەخۆشییەکە، نەتوانینی وەسفکردنی ئەو واقیعیەتە بوو بۆ ئەوان.»

پاشان بەم شێوەیە قسەکانی کۆتایی پێ هێنا: «وەکو ئەوەی بتەوێت بە شێتەکان بڵێیت ئاقڵ بوون چۆنچۆنییەو ئێوەش ئەوە دەزانن کە کارێکی لەم چەشنە ئەستەمە.

## سەرچاوە:

یک-بیماری عجیب ئالبرتو-موراویا 1PEZESHK.COM/ARCHIVES/2010/05

# دەستنووسی یەزدان

خۆرخێ لویس بۆرخیس
و/ سابیر مەلوول

زیندانەکە قووڵ و بەردینە، شێوەکەی نیوە بازنەیەکی تاڕادەیەک تەواوە، تەرک و بنەکەشی کە هەر لە بەرد ڕۆنراوە نەختێک لە بازنەیەکی گەورە کەمترەو ئەمەش جۆرە هەستێکی چەوساندنەوەی شوێن یانی جێفشاریی دەوروژێنێ، دیوارێکیش لە ناوەڕاستەوە دەیکاتە دوو بەشەوە، گەرچی ئەم دیوارە تابلێی بەرز و بڵندە بەڵام بە بەشی سەرەوەی گومبەتەکەی ناگا.

من(تزیناکان)، جادوگەری هەرەمی کاهۆلۆم، کە پیدرۆ دی ئەلڤارادۆ ئاگری پێوەنا و سووتاندی، لەلایەکی زیندانەکە دەژیم و لە لاکەی تریش پڵنگێک کە بە هەنگاوی رێک و نەبیزراو و پەنهان کات و شوێنی دیلی و زیندانییەکەی دەپێوێ.

پەنجەرەیەکی درێژی میلەدار لە دیوارە ناوەڕاستینەکەدا لە ئاستی ئەرزیەکەدا هەیە، لە کاتژمێری بێ سێبەردا-یانی نیوەڕۆ- ڕۆچنە دەلاقەیەک لەسەرێدا دەکرێتەوەو زیندانوانێک کە تێپەرینی ساڵان ئەدگارەکانی روخساری سڕیوەتەوە، چەرخەیەکی ئاسنی دەسوڕێنێ و بەسەری گوریسێکەوە گۆزەگەلێکمان بۆ شۆڕ دەکاتەوە کە ئاو و گڵمتە گۆشتیان تیایە. لەو ساتەدایە کە من دەتوانم نیگای پڵنگەکە بکەم و بیبینم چیتر ژمارەی ئەو ساڵانەم لە یاد نەماوە کە لە تاریکی سیاچاڵدا گوزەراندوومەو تێپەرم کردوون. من کە رۆژانێک گەنج بووم و دەمتوانی لەم زیندانەدا هاتوچۆ بکەم، ئێستا هەر ئەوەم بۆ ماوەتەوە کە لەباری مردندا چاوەڕوانی ئەو کۆتاییە بم کە خواوەندەکان بۆیان هەڵبژاردووم، بە کاردو چەقۆیەکی بەردین سینەی قوربانیەکانم قووڵ قووڵ شەق دەکرد، ئێستاکەش ئەوەتانێ بەبێ یارمەتی سیحر و جادوو ناتوانم لەناو خاک و خۆڵ بڵندبم و هەڵبستم.

لە ئێوارەی سووتاندنی هەرەمەکەدا، ئەو پیاوانەی لە ئەسپە بەرز و بڵندەکانیان دابەزین، بە ئاسنی

داغ ئەشکەنجەیان دام تا پەناگاو حەشارگای گەنجەکانیان پیشان بدەم، لەپێش چاوم بتی خوایان شکاند بەڵام ئەو پشتی تێنەکردم و دەستی لێم هەڵنەگرت، بۆیە بە بێدەنگی بەرگەی ئازار و ئەشکەنجەم گرت و دەمم نەکردەوە وشەیەک بدرکێنم. قەمچی بارانیان کردم، بەند بەند ئێسک و پروسکمیان شکاند، شێواندیانم، دواجار لەم زیندانەدا چاوم کردەوە کە تا عومری فانیم مابێ لێی دەربازنابم.

لەژێر زەبری ناچاریی ئەوەدا کە پێویستە کارێک بکەم، بە جۆرێک لە جۆرەکان وەختەکەمی پێ پڕبکەمەوە ویستم لەم تاریکییەدا هەرچی کە دەمزانی بیهێنمەوە بیر، شەوانێکی بێ شومارم تەرخان کرد بۆ بەیاد هێنانەوەی ژمارە و نەخش و تەکوزیی مارگەلێکی بەردین و شێوەی وردی دارێکی دەرمانگر. بەم شێوەیە ساڵانم گوزەراند و بەم شێوەیە ئەوەم بەدەستهێنایەوە کە هەر لە پێشیشدا موڵکی خۆم بوو.

شەوێک هەستم کرد لە ختوورەو یادەوەریەکی گرانبەها نزیک دەبمەوە: موسافیر پێش بینینی دەریا دڵی دێتە جۆش. چەند کاتژمێرێک دواتر ئەم یادەوەرییە هاتە بەرچاوم. نەریتێک بوو لە نەریتەکانی خودا. ئەو کە لەپێشدا دەیزانی لە کۆتایی دنیادا بەدبەختی وماڵوێرانیەکی زۆر ڕوودەدا، لە یەکەمین ڕۆژی دروستبووندا دەستەواژەیەکی سیحراوی نووسی کە توانای ئەوەی هەیە ئەم بەدکاریانە ڕابماڵێ. ئەوی بەجۆرێک نووسی کە بە دوورترین نەوەکان بگاو ڕێکەوتەکان نەتوانن دەستی تێوەردەن و بیشێوێنن و بیگۆڕن. هیچ کەسێک نازانێ ئەو دەستەواژەیە لەکوێیەو بەچی هێماو پیتێک نووسراوە، بەڵام هیچ گومانێکمان نیە کە لە خاڵێکی پەنهاندا ماوەو ڕۆژێک هەر هەڵبژاردەیەک دێ بیخوێنێتەوە. دواتر بیرم کردەوە کە ئێمە وەک هەمیشە لەکاتی ئاخرزەماندایین و چارەنووسی منیش وەک دوایین ڕاهیبی خودا حەقی ئەوەم دەداتێ کە ڕازی ئەو نووسراوەیە هەڵبێنم. مەسەلەی ئەمەش کە بە دیوارەکانی زیندان دەورەدرابووم نائومێدی نەدەکردم. هەزاران جار دەق و نەخشی کاولۆمم دیتبوو تەنها ئەوەندە مابوو کە قووڵ ببمەوەو لێیتێبگەم، ئەم بیرۆکەیە دڵگەرمی کردم و هێزی دا بە ڕۆحم بەڵام دواتر هەر زوو خستمیە سەرەگێژکە. ئاخر لە سەراپای زەویدا شێوەگەلێکی دێرین هەیە، شێوەگەلێکی ئەبەدیی و جاویدان دەشێ هەر یەکێک لەوانە هێمای دڵخوازێ بۆ ئەو ڕەمزو سومبولەی بەدوایدا دەگەڕام، شاخێک دەیتوانی وشەی خودا بێ، دەکرا ڕووبارێک یان ئیمپراتۆریەک یان شێوەی ئەستێرەکان و قسەی یەزدان بێ، بەڵام بەدرێژایی سەدەکان چیا دەدا لە کەمیی و پاندەبێتەوە، ڕووبار ڕێرەوی خۆی دەگۆڕێ و ئیمپراتۆریەکان دوچاری گۆڕان و نەگبەتی دەبن و لەناو دەچن. شێوەی ئەستێرەکان دەگۆڕێت تەنانەت لە فەزاو کەشکەڵانی فەلەکیشدا گۆڕان هەیە، چیا تاکە، ئەستێرە تاکە تاکەکانیش فانی و ڕاگوزەرو زووتێپەڕن. لە شتێکی پایەدارتر و سەختتر گەڕام. بیرم لە وەچەکانی دانەوێڵە کردەوە، لە ڕەچەڵەکی گژوگیاکان، لە ڕەگەمای باڵندە، لە نەژادی مرۆڤ. پێدەچوو سیحرەکە لە هەنیەو ناوچاوانی من نووسرابێ، لەوانەیە خودی خۆم بووبێتە ئامانجی کۆتایی لێکۆڵینەوەکانم. لەم کەندو کۆژەیەدا بووم کە بەیادم هاتەوە پڵنگەکە یەکێکە لە نیشانەکانی خودا. دڵم سەرڕێژبوو لە تەقوا، ڕۆحم پڕ بوو لە زیکر و خوداپەرستی، یەکەمین سپێدەی جیهانم وێناو بەرجەستە کرد، هەوەڵین گەزیدەی گەردوونم هێنایە بەرچاو. خودایەکم بەرجەستە کرد کە

پەیامی خۆی بە پێستی زیندووی پڵنگانێک دەسپێرێ کە پەیدەرپەی تا ئەبەد لە ئەشکەوتەکاندا، لە چێنکەو کشتزارەکاندا، لەسەر دوورگەکان ئاشقێنی دەکەن و وەچەیەکی زۆر دەخەنەوە تا ئەو پەیامە بە ئاخرین مرۆڤەکان بگا. وێنای ئەو تۆڕە پڵنگانەم دەکرد، ئەو گەرمە تووناوتوونە پڵنگانەم دەهێنایە پێش چاو کە لە چێنکەو مەزراکان و لەناو مێگەلەکان و گاڕانەکاندا ترسیان دەنایەوە تا پارێزگاری لە نەخش و نیگارێک بکەن، نەخشی خودایی لە پڵنگە هاوسێکەمدا نیشانەی راستیی مەزندەکەم و هۆگرییەکی پەنهان و بەهرەیەکی نهێنیم بینی.

سالانێکی درێژم بۆ فێربوونی ڕەهەند و شێوەی پەڵەکان تەرخان کرد. هەر رۆژێکی تاریک تیرێژیک و ساتێکی رووناکی بە من دەبەخشی و دەمتوانی لە بیرگەمدا شێوەگەلێکی ڕەش تۆمار بکەم کە لەسەر تیشکی زەرد نەخشیان بەستبوو و دەدرەوشانەوە. هەندێکیان خاڵ بوون هەندێکیان هێڵی پان لەدیوی ناوەوەی ڕان، هەندێکی دیکەیان بەشێوەی ئەڵقە دووبارە دەبوونەوە. ڕەنگە دەنگێکی ناوازە یان وشەیەکی تایبەت بووبن- زۆربەیان لێواری سوریان هەبوو.

باسی رەنجکێشان و ماندووبوونی خۆم ناکەم. چەندین جار ڕووم لە دیوارەکان دەکرد و هاوارم دەکرد کە دۆزینەوەی هێمای دەقێکی ئاوا ستەم و نەکردە نیە.

وردە وردە ئەو مەتەڵە سەختەی سەری قاڵ دەکردم کەمتر لە مەتەڵە بنچینەییە گشتگیرەکە ئازاری دەدام کە رستەیەک بوو دەستخەتی خودا. لە خۆم دەپرسی: عەقڵی ڕەها چی جۆرە ڕستەیەک ڕەنێو دێنێ؟

بینیم تەنانەت لە زمانە مرۆییەکانیشدا ڕستەیەک نیە بەمانای جیهانێکی تەواو نەبێ. کە دەڵێین پڵنگ یانی ئەو جووتە پڵنگەی کە ئەو پڵنگەیان خستەوە، یان ئەو ئاسک و کیسەڵانەی کە ئەو پڵنگە هەڵیان دەدرێ و دەیانخوات، یانی ئەو گژوگیایەی کە ئاسکەکان دەیخۆن، یانی ئەو زەوییەی کە دایکی گیایەو ئەو ئاسمانەی کە ژیانی بەخشیوەتە زەوی. هەروەتر بیرم کردەوە لە زمانی خودادا هەر وشەیەک دەبێ زنجیرەیەکی ناکۆتا لە کردەوەکان، بەشێوەیەکی ئاشکرا نەک شاراوە، بە ڕەوشێکی ڕاستەوخۆ نەک منجە منجی روون کردنەوە.

بە تێپەڕینی زەمانە چەمکی یەک رستەی خودایی لە دیدی مندا منداڵانەو کفر ئامێز خۆی نواند. بیرم کردەوە خودا دەبێ تەنها یەک وشە بفەرمێ و دەبێ ئەم وشەیە سەرتاپاگیربێ.

هەر وشەیەک کە بەزاری ئەودابێ نابێ کەمتر لە گەردوون یان ناکامڵتر لە کۆی زەمانە بێ.

وشەگەلی هەژار و تەمەداری مرۆڤەکان وەک وشەی —گشت، دنیا و گەردوون — سێبەر و تارمایی ئەم تاقە وشەیەن کە یەکسانە بە زمانێک و هەموو ئەو شتانەی کە زمانێک و هەموو ئەو شتانەی کە زمانێک دەتوانێ لە خۆی بگرێ.

رۆژێکیان یان شەوێکیان — چی جیاوازییەک هەیە لە نێوان رۆژەکان و شەوەکانمدا؟ – خەونم بینی کە دەنکە لمێک لەسەر زەوی زیندانەکەم کەوتووە، بێ گوێپێدان، بێ پەروا خەوتمەوە. خەونم بینیەوە کە بەئاگاهاتوومەتەوەو دوو دانە لمە. دیسانەوە خەوتمەوەو خەونم بینی کە دەنکە لمەکان سێ دانەن. ئەوجار زیادیان کرد تا ئەوەی زیندانەکەیان پڕکرد و من لەژێر ئەو نیمچە بازنە لمەدا دەمردم، زانیم کە خەون دەبینم و بەزەحمەت خۆم ڕاپسکاند و بەئاگا هاتمەوە، بێداربوونەوەم سودی

نەبوو- لم دەیخنکاندم، کەسێک بەمنی گوت: تۆ بەخەبەر نیت بەڵکو لە خەوەکەی پێشووتدا بەئاگا هاتوویتەتەوە کە ئەویش خەونێکە لەناو خەونێکی تردا و بەمجۆرە تا ناکۆتایی کە ژمارەی دەنکە لمەکانە. رێگەی گەڕانەوەت بێ کۆتایی و بێ پایانە و لەڕاستیدا پێش ئەوەی بە ئاگابێیت دەمریت.)) هەستم بە لەناوچوون کرد، لم ددانەکانمی وردوخاش دەکرد، بەڵام هاوارم کرد: نە لمی خەون دەتوانێ بمکوژێ و نە خەون هەیە لەناو خەوندا. تروسکەیەکی روناکی بە ئاگای هێنام لە تاریکایی سەرەوەدا کڵافەیەک رووناکیی ئەڵقە ئەڵقە دادەڕژا. چاوم هەڵێنا دەست و روخساری زیندانوان و بەکرەکە و گوریسەکە و پلە گۆشت و گۆزەکانم بینی. مرۆڤ وردە وردە سەری سوردەمێنێ لەوەی کە چارەنووسی چۆن دەبێ، هەر بنیادەمێک بە تێپەڕینی ڕۆژگار دەبێتە خودی بارودۆخ و هەلومەرجی خۆی.

پێش ئەوەی هێما بین یان تۆڵەسێن بم، پێش ئەوەی کاهینی خودابم زیندانیی بووم. لە وێڵگەی ئەو خەونانەوە کە ماندووبوونیان نەدەناسی گەڕامەوە بۆ زیندانە سەختەکەم، وەک ئەوەی بگەڕێمەوە ماڵێ. ستایشی شێدارێکەییم کرد سوپاسی پڵنگەکەی، سوپاسی رۆژنەکەی، سوپاسی جەستە ئازاردیدە داڕزاوەکەی خۆم کرد، سوپاسی تاریکی و بەرد. ئەو کاتە شتێک ڕوویدا کە نە دەتوانم لەبیری بکەم نە دەتوانم بیگوێزمەوە: یەکێتیم لەگەڵ خودا و لەگەڵ گەردوندا روویدا-یانی لەگەڵ یەزدان و گەردووندا بوومە یەک(نازانم جیاوازی لەنێوان ئەم دوو وشەدا هەیە یان نا) سەرمەستیی هێماکانی خۆی دووپات ناکاتەوە، یەکێک خودای لە ڕەنگدانەوەدا بینیوە، یەکێک لە شمشێردا، یەکێکی دیکە لە ئەڵقەکانی گوڵدا. من گەردوونەیەکی (چەرخەیەکی) زۆر بڵندم بینی، نە لەپێش چاوم بوو نە لە پشتمەوە نە لەلامەوە بەڵکو لە هەمانکاتدا لە هەموو شوێنێک بوو. ئەم گەردوونەیە لە ئاو دروستکرابوو هەروەها لە ئاگریش بوو.

گەردوونەیەک بوو بێکۆتایی گەرچی لێوارەکانیشی دەبینرا. چەرخێک کە هەموو رابردوو، ئێستا و ئاییندە تیایدا چووبوون بەیەکدا و ئاڵۆسکابوو. گلۆڵەیەک بوو کە من تاڵێک بووم لێی و- پیدرۆ دی ئەلڤارادۆی — جەلاد ئەشکەنجەدەرمیش، تاڵێکی تر. هۆکان و ئەنجامەکان لەوێدا بوون ئەوەندە بەس بوو نیگای چەرخەکە بکەم تا بەشێوەیەکی ناکۆتا لە هەموو شتەکان تێبگەم. ئای لە شادیی تێگەیشتن و درەوشانەوەی چەند مەزنترە لە شادیی وێناکردن و نیعمەتی هەستەکان. من گەردوونم بینی و شێوە مەحرەمەکانی گەردوون، من جیهانم بینی و نیشانە نهێنییەکانی جیهان. ئەو پرەنسیپانەم بینی کە کتێبی (پۆپۆلڤۆ) ناویان دێنێ، ئەو شاخانەم بینی کە لە ئاو دەڕسکین، ئەو یەکەمین مرۆڤانەم بینی کە لە گەوهەری درەخت بوون، ئەو گۆزانەم بینی کە بنیادەمەکان شاڵاویان بۆ دەبرد، ئەو سەگانەم بینی کە دەموچاوی مرۆڤەکانیان هەڵدەدڕی، خودایەکی بێڕوخسارم بینی لە پشتی خوداکانەوە، نە بەردگەلێکی بێ پایانم بینی کە تەنها شادییە ئەزەلیەکانیان دەنەخشاند. لە هەموو شتێک تێگەیشتم و توانیم لە نووسینی پڵنگەکەش حاڵی بم. شێوگێک، فۆرمولەیەک بوو لە چواردە وشەی بێ سەروبەرو ناڕێک پێکهاتبوو( نە ساز و رێکەوتیی دەهاتنە بەرچاو) هەر تەنها ئەوەندە بەس بوو کە بە دەنگی بەرز گۆم کردبان تا ببمە دەسەڵاتداری ڕەها، هەر ئەوەندە بەس بوو بمهێنایانە سەر

زمان تا ئەم زیندانە بەردینە خاپورو وێران بێ، تا ڕۆژ شەوگارم بسمێ تا لاوو جوان ببمەوە تا نەمر و جاویدان بم تا پڵنگ — ئەلڤارادۆ- هەڵبدرێ تا چەقۆ و سیکاردی موقەدەس لە سینەی ئیسپانییەکان رۆبچێ. بۆ دروستکردنەوەی هەرەمە پەرستگاکەو بۆ ڕۆنانەوەی ئیمپراتۆری، چل برگە، چواردە وشە و من تزیناکان)) دەتوانم لە سەرزەمینێکدا حوکمڕانیی بکەم کە ( مۆکتۆییما) فەرمانڕەوایی کرد. بەڵام دەزانم کە هەرگیز ئەم وشانە ناهێنمە سەر زمان چونکە چیتر تزیناکانم نایەتەوە یاد!!

دە با ڕازی سەر پێستی پڵنگەکان لەگەڵ مندا بمرێ و گڵەبان کرێ ئاخر ئەوەی گەردوون بەیەک نیگا ببینێ ئەوەی چەرخە پڕ شۆڕەکانی جیهان بە تاکە نیگایەک دەبینێ چیتر ناتوانێ بیر لە تاقە مرۆڤێک و خۆشبەختییە ناچیزەکانی یان کوێرەوەرییەکانی بکاتەوە گەرچی ئەو مرۆڤە خودی خۆشی بێ ئەم ئینسانە — خۆی بوو — بەڵام ئەمێستە چی گرینگی و بایەخێکی بۆی هەیە؟ چارەنووسی ئەوەکەی دی، هۆز و کۆز و میللەت و نەتەوەی ئەویدی بە ئەو چی ئەگەر ئێستا ئەو خۆی هیچکەس نەبێ؟

لەبەرئەوەی شێوگەکە ناهێنمە سەر زمان لەبەر هەندێ لێدەگەڕێم ڕۆژگار بەمشێوەیە کە لە تاریکیدا ڕاکشاوم لەبیرم بکات و بە فەرامۆشیم بسپێرێ.

## سەرچاوەکان:


١- کتابخانه بابل و ٢٣ داستان دیگر انتشارات نیلوفر

٢- الالف: ترجمە/ محمد ابوعطا دار الشرقیات للنشر/ مصر

٣- مراه الحبر: ترجمە/ محمد عید ابراهیم دار علاء الدین / سوریا


## فەرهەنگۆک

١- هێمابین: ڕەمزدۆ/ کاشف الرموز

٢- گەردوونە — چەرخ- دولاب عجلە

٣- شێوگ: فۆرمۆلە: صیغە/ترکیبە

٤-پلەگۆشت: گڵمتە گۆشت

٥-ڕۆژنە/ ڕۆچنە/ دەلاقە

٦- دەرسکێن: شین دەبن — پەیدا دەبن

٧- پۆپۆڵ ڤۆ: کتێبی پیرۆزی نەتەوەی مایا

٨- میلەدار: شیشدار

٩- تەرک: الارضیە

١٠-رۆنراوە: دروستکراوە

١١- ڕەگەما: ڕەچەڵەک

١٢- کەندوکۆژە: تحریات

١٣- کارد: چەقۆ




# هانریش هاینە
# شاعیرو بیرمەند

نوسینی: هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئەم کتێبە هەردوو توێژەری فەرەنسی «جان کریستۆف هوشیڵد»و «میکائیل ویرنز» نوسیویانە، یەکەمیان پسپۆڕە لە ئەدەبی ئەڵمانی سەدەی نۆزدەهەم، دووەمیان پسپۆڕێکی باوەڕپێکراوە لە ئەدەبی «هێنریش هاینە»دا. ئەم دوو دانەرە لەم کتێبە تازەیەدا، قسەوباس لەسەر گەورەترین شاعیری ئەڵمانیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەکەن کە « هێنریش هاینە»یە. ئاشکرایە «هێنریش هاینە» ساڵی ١٧٩٧ لە شاری دیسلدۆرف لەدایکبووەو ساڵی ١٨٥٦ بە کەساسیو غەریبی لە پاریس، لە تەمەنی شەست ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووە. خێزانەکەی هەر لە سەرەتاوە هەوڵیان دا خەریکی کاری بازرگانی بێت، چونکە پارەیەکی باشی تێدایەو دێوەزمەی نەبونیو هەژاری دووردەخاتەوە. بەڵام «هێنریش هاینە» بەهۆی سروشتە ڕۆمانسییەکەیو مەیلە ئەدەبیەکەیەوە، لەم بوارەدا، بواری بازرگانی، دوچاری شکستێکی زۆر گەورە بووە. ئەو حەزی لە کاری ئەدەبی بوو، بەمپێیەش هەژار بوو.

پێویستە بزانین «هێنریش هاینە» لە خێزانێکی جوولەکە لەدایکبووە، باوکی دوای بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسیو لە ڕۆژگاری «ناپلیۆن»و لەژێر سایەی داگیرکردنی فەرەنسا بۆ ئەڵمانیا، لە کاروباری بازرگانیدا کاریکردووەو سەروەتو سامانێکی باشی کۆکردوەتەوە. بەڵام «هێنریش هاینە» بڕیاردەدا ئاینی خۆی بگۆڕێتو بچێتە سەر ئاینی مەسیحی لە مەزهەبە پرۆتستانتیەکەیدا کە لە ئەڵمانیا مەزهەبێکی باڵادەستبووە، لەو کاتەدا ئەم قسەیە دەکات: (بڕیارم دا بچمە سەر ئاینی مەسیحی، تاکو دەرفەتی ئەوەم بۆ بڕەخسێت پاسپۆرتێک وەربگرم کە ڕێگەم پێدەدات لە فراوانترین دەروازەوە، بێمە ناو ڕۆشنبیری ئەوروپیو تێیدا ببمە ئەندامێکی چالاک، نەک ببمە ئەندامێکی

پەراوێزخراوی کەمینەیەکی نەفرەتلێکراو).

ئاشکرایە یاساو ڕێساکانی ئەڵمانیا لەو سەردەمەداو لەناو شارەکانی ئەڵمانیادا، کۆتوبەندێکی توندو دڵڕەقانەیان خستبووە سەر جوولەکەکان. ئەو یاسایانە زۆرجار ڕێگربوون لەوەی جوولەکەکان بگەنە پلەوپایەکانی زانکۆ. «هێنریش هاینە» دەیویست ببێت بە مامۆستای زانکۆ لە بەشی ئاداب، بەڵام بەهۆی ڕەچەڵەکە ئاینیەکەیەوە شکستی هێنا. کەچی هەنووکە بارودۆخو حاڵەتەکە زۆر گۆڕاوە! ئێستا عەرەب یاخود موسڵمان ڕەزاقورسو چەوساوەو گوماناوین، ئێستا ئەوان لەم وەزیفەیەدا جێگای جوولەکەیان گرتۆتەوە، ئەگەر ئەو دەربڕینە شیاوبێت. بەڵام هەرچی جوولەکەیە، ئەوا لە هەمو ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا–ئەمریکا بەرزو بەڕێزە. ئێستا جوولەکە ئەوانی دیکە دەچەوسێنێتەوە، بگرە دەیانترسێنێتو ئەگەر پێویستیشی کرد دەدا بەسەریاندا. بێگومان مەبەستم لەم قسانە جوولەکە داخ لەدڵەکانە، نەک بەشێوەیەکی گشتی جوولەکە وەک میللەتێک.

وەلێ «هێنریش هاینە» هەرچەندە دەستبەرداری جوولەکەبوونی خۆی بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی ئامانجەکەی بێنێتەدی. ئەو بەدرێژایی ژیانی بەسەر خودی خۆیدا دابەشببوو، لەنێوان شوناسە جوولەکەکەیو ئینتیما ئەڵمانیەکەی یان بەشێوەیەکی گشتی ئەوروپییەکەی پەرتببوو. ئێمە ئەمە دەڵێین ئەگەرچی ئەو هیوایەکی زۆری لەسەر فەلسەفەی ڕۆشنگەری گەردونی هەڵچنیبوو، لە ئینتیما تایفییەکەی زۆر دوورکەوتبووەوە. بگرە هەوڵی دا بە تەواوی بیسڕێتەوە، تاکو لەگەڵ ئەوانی دیکەداو لەسەر پانتاییەکی هاوبەشی فراوانتر پێکبگەن، نەک پانتاییەکی تائیفی. ئەمە هەمان شتە کە «کارل مارکس»ی هاوسەردەمی ئەنجامی دا، «مارکس»یش لە خێزانێکی جوولەکە بوو، خێزانەکەی پێش لەدایکبونی «مارکس» ئاینی خۆیان گۆڕیو چوبوونە سەر ئاینی مەسیحیو مەزهەبی پرۆتستانت.

ئاشکرایە «مارکس» هەڕەشەیەک ئاراستەی جوولەکە دەکاتو تێیدا دەڵێ: (ئەی جوولەکەکان، ئێوە بەوەی تەنها لە پێناو خۆتاندا داوای یەکسانیو ڕزگاربوونو ئیمتیازات دەکەن، ئەنانین. پێویستە لەسەرتان، وەک ئەڵمانەکان، لەپێناو ڕزگارکردنی ئەڵمانیا تێبکۆشن. هەروەها پێویستە لەسەرتان، وەک مرۆڤ، لەپێناو ڕزگارکردنی هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی تێبکۆشن، نەک تەنها لەپێناو ڕزگارکردنی ڕەگەزی جوولەکە تێبکۆشن).

ئەم هەڵوێستە سەربەرزانەیەی «مارکس» هەمان هەڵوێستی «هێنریش هاینە»ی هاوڕێیەتی کە نزیکەی بیست ساڵ لەو گەورەتربوو. «هێنریش هاینە» دەیویست لە ناوەندیەتی ڕەسەنایەتی جوولەکە بێتەدەرەوە، واتە لە عەقڵیەتی گیتۆکانو ترس لەوانی دیکەو داخرانە بەناوبانگەکەی جوولەکە بەسەرخۆیاندا. لەبەر ئەم هۆکارەیە ئێستا ئەویش وەک «مارکس»، لە چەندین ناوەندی جوولەکەدا، بەتایبەتی لە ناوەندی ڕاستڕەو ڕاستڕەوی توندڕەودا، کەسێکی خۆشەویست نییەو نەویستراوە.

لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستەی «مارکس» بەسەر هەموو کەمینەکانی دیکەدا، نەک بەتەنها جوولەکە، پراکتیز دەکرێت. چارەسەر بەلای کەمینەوە، بەپێچەوانەی ئەوەی لێیتێگەشتووە، لە

دەمارگیری تایفیدا نییە کە دەترسێتو بەسەر خۆیدا دادەخرێت، بەڵکو لە کرانەوەدایە بەسەر ڕەگەزە دینامیکییە ئازادەکانی زۆرینەدایە، لەوەدایە لەگەڵ ئەو ڕەگەزە ئازادانەدا پێکەوە کاربکەن لەپێناو سەردەمێکی ڕۆشنگەری تازە، تێیدا هەموان لەبەردەم دەوڵەتی یاساو دەزگاکاندا، لە مافو ئەرکەکان یەکسان بن. هەر ئەمەش بوو لە ئەڵمانیا، دوای مردنی «هێنریش هاینە» بە نەوەیەک یان دوو نەوە ڕویدا.

ئەمە مانای وایە فیکرەی پێشکەوتن فیکرەیەکی مومکینەو مەحاڵ نییە، دواتر ئەم پێشکەوتنە، ئێستا لە تەواوی ئەوروپای مۆدرێندا چەسپیوەو جێگیربووە. ئێستا ئەگەر ئەڵمانییەک لە دەرەوەی ئەڵمانیا بۆ یەکەمجار ئەڵمانییەکی دیکە ببینێ، لێی ناپرسێت: ئایا تۆ کاسۆلیکی یان پرۆتستانتێکی لۆسەریت یاخود جوولەکەی.. هتد؟ بەڵکو تەنها لێیدەپرسێت: ئایا تۆ ئەڵمانیت؟ هەروەها فەرەنسییەکیش هەمان شت دەکات..هتد. بەم شێوەیە هاوڵاتیبوون، بە مانا تازەکەی وشەکە، بە تەواوی لە تایفەگەری جیابوەتەوەو تایفەگەری تێپەڕاندووە. بەڵام پێش ئەوەی ئەوان بگەنە ئەم چارەسەرە ئەفسوناوییە، چەند جەنگی فیکریو سیاسییان لەگەڵ یەک بەرپاکرد، بگرە لەسەر شوناس، چەند کوشتارگای خوێناوییان دەرحەق بە یەکتر نایەوە؟

«هێنریش هاینە» ساڵی ١٨٣١ بڕیاردەدا ئەڵمانیا بەجێبێڵێتو لە فەرەنسای پایتەختی شارستانیەتو ڕۆشنبیری ئەوروپی ئەو سەردەمە جێگیرببێت. جا کێ عاشقی پاریس نییەو حەزناکات ڕۆژێک لە ڕۆژان تێیدا بمێنێتەوە، وەک ئەوەی «همنگوای»و «جۆیس»و «بێکت»و دەیان داهێنەری دیکە کردیان؟

پاریس پێویستییەکە بۆ هەناسەدانو داهێنانو ژیانی بوەیهیمیو گەڕیدەیی، بەتایبەتی گەڕیدەییەکی بێ هۆو بێ ناونیشان. «هێنریش هاینە» بەپێ زۆر دەگەڕا، بەپێ گەڕانیش لە شارێکی وەک پایتەختی ڕوناکی، کۆتاییینایەت.

«هێنریش هاینە» پێش «بۆدلێر» لەگەڕەکی لاتینی، لەگەڵ سۆزانییەکانی ئەو گەڕەکەدا نوستووە، دواتر ئافرەتێکی فەرەنسی دەناسێت، ئافرەتەکە «هێنریش هاینە»ی زۆر خۆشدەوێتو یارمەتی زۆری دەداو وایلێدەکات جێگیرببێت. ئافرەت کلیلی نیشتیمانە، بگرە ئافرەت بۆخۆی بە تەنها نیشتیمانە. «هێنریش هاینە» زوو زوو شوێنی نیشتەجێبوونەکەی دەگۆڕی، بەڵام هەرگیز پێی لە گەڕەکی (مۆنمارتر)ی میللی نەدەبڕی، مەگەر زۆر بە کەمی نەبێت. لەسەر گردی (مۆنمارتر) کڵێسایەکی جوان بە ناوی (دڵی پیرۆز) هەیە، بەشێوەیەکی زۆر قەشەنگ بەسەر پاریسدا دەڕوانێتو هونەرمەندانو ئەو وێنەکێشانەی (پۆترێت) یان وێنەی کەسی دەکێشن، لە دەوروبەری ئەو کڵێسایە کۆدەبنەوە. «هێنریش هاینە» لەو سەردەمەدا زوو زوو سەردانی سۆشیالیزمە تۆباوییەکانی دەکرد، لە پێشی هەمویانەوە بیرمەندی گەورە «سان سیمۆن».

«هێنریش هاینە» ساڵی ١٨٤٣ لە سەردانێکی تایبەتدا دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی ئەڵمانیا، وەلێ دەسەڵاتداران ڕێگەنادەن کارە ئەدەبی یان فیکریەکانی بڵاوبکاتەوە. لەو سەردەمەدا کتێبێکی بە ناونیشانی (خەونێک لە چلەی هاویندا) بڵاوکردبوەوە، پاشان کتێبێکی دیکە بە ناونیشانی

(ئەڵمانیا: چیرۆکێکی زستانە) بڵاودەکاتەوە. سەرەڕای ئەوە لەو گۆڤارەی کە بڵاویدەکردەوەو ناوی (بۆ پێشەوە) بوو، وتارێکی «کارل مارکس»ی هاوڕێی بڵاودەکاتەوە. ئاشکرایە لەو رۆژگارەدا «مارکس»یش وەک هاوڕێکەی دوورخرابووەوەو دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا بەدوایەوەبوون.

«هێنریش هاینە» پێش هەموو شتێک شاعیرێکی ڕۆمانسی بوو، دواتر بانگەشەی تێپەڕاندنی قوتابخانەی ڕۆمانسیەت دەکات. ڕەوایەتی بەخشییە بەکارهێنانی زمانی میللی لە شیعردا، بەڵام جگە لەوە «هێنریش هاینە» ڕۆژنامەنوسو بیرمەند بوو، ڕۆچوبووە ناو خەمو کێشەکانی سەردەمەکەیەوە، شیعرو فیکری پێکەوە کۆکردبوەوە. کودەتاکەی بەسەر ڕۆمانسیەتدا ئالێرەدایە، چونکە ڕۆمانسیەت لە لایەنی فیکرییەوە کۆنەپەرست بوو، بانگەشەی گەڕانەوەی بۆ دواوە دەکرد: واتە گەڕانەوە بۆ پێش سەردەمی ڕۆشنگەریو پرنسیپە گەردونیەکانی. دواتر کتێبێکی نایاب بە ناونیشانی (دەربارەی ئاینو فەلسەفە لە ئەڵمانیا) بڵاودەکاتەوەو تێیدا گوزارشت لە بیروڕاکانی دەکات. فەرەنسییەکان ساڵی ١٩٩٣ ئەم کتێبەیان وەرگێڕا، واتە دوای سەدەو نیوێک لە بڵاوبونەوەی. پێویستە ئەوە بزانین لەو ڕۆژگارەدا پاریس پایتەختی ئازادی بوو، ئەگەر لەگەڵ شارەکانی دیکەی ئەڵمانیادا بەراوردمان کرد کە لەلایەن دەرەبەگو ستەمگەرو فێندەمێنیتاڵیزمی تایەفەگەرییەوە بەڕێوەدەبران. پاریس دوای نیو سەدە لە شۆڕشی فەرەنسی، تاڕادەیەکی باش ئازادی بیرکردنەوەو بڵاوکردنەوەو گوزارشتکردنی بۆ نوسەر دەستەبەرکردبوو.

وەلێ دەسەڵاتدارە کۆنەپەرستەکانی ئەڵمانیا، دژی کۆمەڵەی (ئەڵمانیای لاو)بوون کە «هێنریش هاینە»و ژمارەیەکی زۆری دیکە سەر بەو کۆمەڵەیە بوون. ئەو کۆمەڵەیە بانگەشەی تازەکردنەوەی ئەدەبو ژیانی سیاسی ئەڵمانیای دەکرد، وەک ئەوەی لە فەرەنسا ڕویدابوو. کۆمەڵەی ئەڵمانیای لاو، ئاراستەیەکی لیبرالی ڕوونو ئاشکرای هەبوو کە دژ بە تایفەگەریو عەقڵیەتی دەرەبەگایەتی کۆن بوو. ئاشکرایە تورکیا لاسایی هەمان ئەم کۆمەڵەیەیان کردووە، کاتێ کۆمەڵەی (تورکیای لاو)یان دامەزراند. پەیوەندی نێوان تورکەکانو ئەڵمانەکان پەیوەندییەکی کۆنە، وەک پەیوەندی نێوان مەغریبییەکان، بە مانا فراوانەکەی وشەکە، لەگەڵ فەرەنسییەکان. « هێنریش هاینە» دوای ئەوەی لە پاریس جێگیردەبێت، ئیدی ڕۆڵی نمایندەیەکی ڕۆشنبیری لەنێوان ئەڵمانیاو فەرەنسادا دەگێڕێت. فەرەنسییەکانی بە فیکری ئەڵمانی ئاشناکردو ئەڵمانییەکانی بە ڕەوتی فیکریو ئەدەبی فەرەنسی ئاشناکرد.

لەمڕۆدا ئێمەی ڕۆشنبیرانی عەرەب کە لە فەرەنسا یان لەندەن دانیشتوین، هەمان کار دەکەین. ئێمەش پردێکی ڕۆشنبیرین لەنێوان دوو زمانو دوو ئەدەبو دوو جیهاندا.. ئای پردەکان چەند جوانن! چەند خۆشە لە کارەکتەرتدا دوو زمانو دوو ڕۆشنبیریو دوو کەسایەتی کۆبکەیتەوە! چەند هەژاریت کاتێ کاراکتەرەکەت کورتدەبێتەوە بۆ تەنها یەک کەسایەتی!

بەم شێوەیە « هێنریش هاینە» ڕۆڵێکی پۆزەتیڤی هەبوو لە نزیککردنەوەی گەلانی ئەورووپی کە لەو ڕۆژگارەدا دەمارگیربوونو لەلایەنی نەتەوەییەوە شۆڤێنی بوونو زۆرجار لەگەڵ یەکدا لە جەنگو شەڕکردندا بوون. ئاشکرایە ئەو کتێبێکی گرنگی لەسەر مێژوی ئاینو فەلسەفە لە ئەڵمانیا نوسی،

تاكو فەرەنسییەكان ئاگاداری ئەوەبن. هەروەها چەندین وتاری دەربارەی ژیانی ئەدەبیو شانۆییو سیاسی فەرەنسا نوسی، تاكو ئەڵمانەكان ئاگاداری ئەوەبن. لە ڕاستیدا « هێنریش هاینە» هەموو ئەو بەهرانەی تێدابوو كە وادەكات مرۆڤێك ببێت بە نوسەر. ئەو زۆر هەستیاربوو، هەستو سۆزێكی ئاگراوی هەبوو، لێزانبوو لە شێوازی نوسین، پێدەچێت دایكی كاریگەری لەسەر تەبیعەتو ڕێڕەوی ژیانی هەبوبێت.

ئاشكرایە دایكی « هێنریش هاینە» خانمێكی ڕۆشنبیر بووەو چەندین زمانی زانیوە، لەوانە فەرەنسی، ئینگلیزی، لاتینیو ئەڵمانی. زۆر كاریگەر بووە بە «جان جاك ڕۆسۆ»و كوڕەكەی لەسەر خۆشەویستی «ڕۆسۆ» گەورەكردووە. پێدەچێت خانەوادەی دایكی خانەوادەیەكی جوولەكەی لیبرالی بوبن، بە پێچەوانەی باوكی كە لە خانەوادەیەكی جوولەكەی ئەرسەدۆكسی بوو، واتە خانەوادەیەكی فێندەمێنیتاڵیزم كە بەشێوەیەكی ڕەها پابەندی سروتو ڕێوڕەسمە ئاینیەكان بوون.

بەڵام منداڵەكەیان زۆر هەستیار بووە، هەر ئەمەش بوو دواتر دووچاری نەخۆشییەكی دەرونی دەكاتو بە درێژاییی نیوەی دووەمی ژیانی بەدەستیەوە دەناڵێنێت. « هێنریش هاینە» ئەگەر گوێی لە قیڕەقیڕێك یان دەنگێكی بەرز بوایە، ئەوا بەتوندی هاواری دەكرد. وەلێ ئەو نەخۆشییە جەستەییەی لە كۆتاییەكانی ژیانیدا توشیهاتو وایلێكرد بەشی زۆری كاتەكانی لەناو جێگادا بمێنێتەوە، بووە هۆی قووڵتربونەوەی فیكرو فەلسەفەكەی لە ژیاندا. بەم شێوەیە نوسینو شیعرەكانی، پانتاییەكی مرۆڤانەی جوانیان لەخۆگرت. هەندێجار نەخۆشی ناخی مرۆڤ گۆشەگیر دەكاتو وایلێدەكات زیاتر مرۆڤدۆستانەبێت. نەخۆشی هەر هەمووی دیاردەیەكی نێگەتیڤ نییە!

« هێنریش هاینە» لە پاریسەوە قەسیدەیەكی پڕتاسە بۆ ئەڵمانیا دەنوسێتو تێیدا دەڵێ: (ئاە ئەی ئەڵمانیا، خۆشەویستە دوورەكەم، كاتێ بیر لەتۆ دەكەمەوە، چاوانم پڕ دەبێت لە فرمێسكو فەرەنسای خۆشو قەشەنگ، بۆ من خەمبار دەردەكەوێت، میللەتە باشەكەی، بۆ من وەك بێزاركەرێكی قورس دەردەكەوێت. تەنها هەستێكی ساردو وشك لە پاریسدا دەنگدەداتەوە. ئاە ئەی زەنگەكانی شێتی! ئاە ئەی زەنگەكانی ئیمان، دەنگی لێدانەكانتان لەسەر دڵم چەند خۆشە! پێموابێ لە دوورەوە شاوری پاسەوانی شەو دەبیستم، ئەو دەنگە چەند ماڵیو پڕ تاسەیە. گۆرانییەكانی پاسەوانی شەو، لەگەڵ چریكەی بولبولدا تێكەڵ دەبێ، پاشان مەسافەكان دەبڕێتو دەگاتە دڵم).

بەم شێوەیە تێبینی دەكەین « هێنریش هاینە» نەیتوانیوە ئەڵمانیا لەبیر بكات، گەرچی ئەڵمانیا ئیهانەی ئەوی كردو ئازاری دا، بگرە دەریكرد. بیرەوەرییەكانی منداڵیو سەرەتای گەنجی ئەستەمە لەبیربكرێن. شاعیری غەریبو نامۆ، هەرچەندە لە تاراوگەكەیدا دڵخۆشو كامەران بێت، ئەوا هەر بە غەریبو نامۆ دەمێنێتەوە، هیچ شتێك قەرەبوی نیشتیمان ناكاتەوە تەنها نیشتیمان نەبێت. بەڵام نیشتیمانی ئەڵمانیا لەو سەردەمەدا، پێشوازی لە نوسەرو شاعیرەكانی نەدەكرد، دروست وەك ئەوەی ئێستا لە نیشتیمانەكانی عەرەبدا ڕوودەدات..

ئەڵمانیا لەو ڕۆژگارەدا، هێشتا ستەمگەربووەو ڕقی لە ڕۆشنبیران بوو، دژی مەیلی ڕۆشنبیران بووە بۆ ئازادیو كرانەوەو لەو مەیلەیان تێنەگەشتووە. لەو سەردەمەدا ژمارەی ڕۆشنبیرە دوورخراوەكانی

ئەڵمانیا، ژمارەیەکی زۆر گەورە بوو، دروست وەک ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆی عەرەب. زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەوکاتی ئەڵمانیا، یا دەڕۆشتن بۆ پاریس یاخود بۆ لەندەن. گەورەترین نمونە بۆ ئەوە «کارل مارکس»ە، کە سەرەتا ڕایکرد بۆ پاریس، پاشان لە لەندەن نیشتەجێ بوو.

« هێنریش هاینە» وەک «گۆتە»و «شیلەر»و «هۆڵدەرلین»و دەیانی دیکە، شاعیرێکی ڕۆمانسی بوو، بەڵام هەوڵی دا ڕۆمانسیەت لە ڕووی زمانو شێوازو ماناوە تازەبکاتەوە. هەروەها هەوڵی دا نێوان شیعری کلاسیکیو شیعری ڕۆمانسی ئاشتبکاتەوە. جارێکیان بۆ هاوڕێیەکی دەنوسێو دەڵێ: (لە ژیانمدا بۆ ماوەیەکی درێژ نەخۆشو نابوت بووم. بەڵام ئێستا وانیم، یاخود بڵێ ئێستا تەنها نیو ئەوەندە نەخۆشو نابوتم. لەوانەیە ئەم حاڵەتە ئەوپەڕی خۆشبەختی بێت لەسەر ئەم گۆی زەویە، ناکرێت لەمە زیاتر داوا بکەین. وەلێ سەبارەت بە شیعر، ئەوا باشترم. من هەر لە سەرەتای منداڵیمەوە، لەژێر کاریگەری گۆڕانییە میللییەکانی ئەڵمانیادا بووم. دواتر «ویلهام شلیگڵ»م ناسی کە هونەری شیعرو ڕێکخستنی فێرکردم. من لەژێر کاریگەریی ئەو و بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی ڕۆمانسیەتدا بووم. بەڵام هەوڵم دا ئەوە تێپەڕێنمو شێوازی شیعری دیکە بنوسم).

مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، سەفەرەکان کاریگەریان بەسەر شیعری « هێنریش هاینە»وە هەبووەو دەوڵەمەندیان کردووە. ئاشکرایە ئەو هەر لە ساڵی ١٨٢٧ دەستی بە سەفەرێکی دووردرێژ بۆ دەرەوە کردووە، یەکەمجار ڕۆشت بۆ لەندەن، بەڵام تێیدا زۆر بێزاربووەو لەندەنی خۆشنەویستووە. لە ڕاستیدا ئینگلتەرە دوور بووە لە دڵیەوە، ئەو پێی ناخۆش بووە ئینگلتەرە زیاد لە پێویست ڕقی لە «ناپلیۆن»ە، « هێنریش هاینە» لەبەر ئەوەی لایەنگری شۆڕشی فەرەنسی بووەو «ناپلیۆن»ی خۆشویستووە، بۆیە کێشەکانی لەگەڵ ئینگلتەرەو عەقڵیەتیان گەورە بوو. پاشان ڕۆشتووە بۆ شاری میونخ لە خواروی ئەڵمانیا، لەوێ لە یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا کە پێیدەوترێت (الحولیات السیاسیە) کاریکردووە. دواتر سەفەری کردووە بۆ ئیتالیاو شارەکانی جەنەواو فلۆرەنساو بۆلۆنیاو بوندوقیەی ناسیوە. ساڵی ١٨٢٩ گەڕاوەتەوە بۆ شاری هامبۆرگ لە باکوری ئەڵمانیا.

بەم شێوەیە « هێنریش هاینە» خەونە گەورەکەی بە ڕۆشتن بۆ ئیتالیا بەدەستهێنا، ئەو خەونە هەمان ئەو خەونەیە کە هەمو شاعیرە گەورەکانی ئەڵمانیا هەیان بووە، وەک گۆتەو ئەوانی دیکە. هەمویان لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیاندا، ویستویانە سەردانی وڵاتی سەردەمی ڕۆشنگەریو خۆری هەڵهاتووە فێنکەکەی خواروی ئەوروپا بکەن.

« هێنریش هاینە» دوای ئەوە وتارێکی گرنگ دەنوسێو تێیدا دەڵێ: (هەر سەدەیەک لە سەدەکان، پەیامێکی گەورەی لەسەر شانەو دەبێ تەواوی بکات. لێرەوە ئەو پرسیارەی دەبێ بکرێت ئەمەیە: ئەو ئەرکەی لەسەر سەدەی ئێمەو نەوەی ئێمەیە چییە؟ وەڵام: ڕزگارکردنی میللەتە چەوساوەکانە لە هەمو شوێنێکی جیهاندا. میللەتانی ئەوروپا تامەزرۆی ڕزگاربونیانە لە ئاگری دەرەبەگو کۆیلایەتیو ئیمتیازات کە چینە ئەرستۆکراتیەکان چەندین سەدەیە بۆخۆیانی دەبەن، ئەمەیە شۆڕشی فەرەنسا لە پاریس جێبەجێی کرد. ئەمەیە دەبێ لە هەموو شوێنێکدا ڕووبدات).

لە ڕاستیدا هەموو فەلسەفەکەی « هێنریش هاینە» ئالێرەدایە: ئەو ڕۆڵەی سەردەمی ڕۆشنگەرییە

کە بووە هۆی بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسیو ڕوخاندنی زیندانی باستیلو هەڵتەکاندنی تەواوی سەردەمی دەرەبەگایەتی فێندەمێنیتالزم. ئەگەر ئەم خاڵە لەبەرچاونەگرین، ئەوا ناتوانین لە نوسینە شیعریو پەخشانەکانی تێبگەین. ئەو سەر بە نەوەی سوتاندنو پەڕینەوەیە: واتە ئەو نەوەیەی ئیشی لەپێناو گۆڕانکاریدا کرد، بەڵام دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخسا لە بەرەکەی بخوات.

« هێنریش هاینە» لە بەراوردکردنی نێوان فەرەنسییەکانو ئەڵمانیەکان، ئەم پەرەگرافە قووڵو پڕ ئاماژەیە دەنوسێ: (ئەڵمانەکان لەسەر ئاستی فیکری فەلسەفی، شۆڕشێکی گەورەیان دژ بە سەردەمی کۆنی دەرەبەگایەتیو تیۆلۆژیا بەرپاکرد، ئەوەش لەسەر دەستی کانتو فیختەو شیلنگو هیگڵ ئەنجامدرا. ئەمەیە ڕۆحی فەلسەفەی ئایدیالیزمی ئەڵمانی کە گەورەترین فەلسەفەیە لە سەدە تازەکاندا. بەڵام فەرەنسییەکان لەسەر ئاستی عەمەلیو واقعی، شۆڕشیان دژ بە سەردەمی کۆن بەرپاکرد، ئەویش بریتییە لە شۆڕشی فەرەنسی کە گەورەترین کودەتای سیاسی یان گەورەترین هەژانە لە مێژوی سەدە تازەکاندا. لێرەوە ئەم دوو شۆڕشە دوو شۆڕشن یەکتر تەواودەکەن: شۆڕشی فیکرو شۆڕشی واقع، یان شۆڕشی گۆڕانی عەمەلی لە ڕێگەی جێبەجێکردنی فیکری تازە لەسەر ئەرزی واقع. ئەمەش نەمری ئەڵمانەکانو نەمری فەرەنسییەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە).

بەڵام وادیارە پێش مردنی بە دوو ساڵ، وتارێکی بە ناونیشانی (دانپیانانەکانی شاعیر) بڵاوکردوەتەوە، تێیدا بێ ئیمانییەکەی پێشتریو هەڵچونە شۆڕشگێڕانەییەکانی ڕەتکردۆتەوە.

شیعرێک
بەهارێکی تازە
دەچمە نێو گوڵەکان
منیش وەک ئەوان دەکرێمەوە
دەچمە نێو خەونەکان
لە هەر هەنگاوێکدا لاردەبمەوە
ئاە! خۆشەویستەکەم بمگرە
نەبادا وەک سەرخۆشێک
بکەوم بەسەر پێیەکانتاو
باخچەکەش پڕە لە خەڵک.

## سەرچاوە:

ماڵپەڕی الاوان، ٢٦ /٨/ ٢٠١٠

# مۆزەخانەی بتهۆڤن

نوسینی: ئەشرەف ئەبو زەید
لە عەرەبیەوە : دڵنیا عەبدوڵڵا

لە ڕێگەدا بۆ مۆزەخانەی بتهۆڤن لە شاری بۆنی ئەڵمانی، شوێنی لەدایک بوونی مۆسیقاری مەزن، لە هەموو سوچێکدا هەست بە بوونو یادی بتهۆڤن دەکەیت، چونکە لە هەموو ئاوڕدانەوەیەکدا دەیبینیت، پەیکەرەکەی لە گۆڕەپانی بەریدا، یاخود وێنەیەکی ڕوخساری لەسەر دیواری خانوویەک، یان دوکانێک دەبینیت کە کتێب دەربارەی ئەو دەفرۆشێت، یاخود کچێک دەبینیت کراسێکی لەبەردایە یادگاری ئەو کەڕەی لەسەرە کە وایکرد هەموو جیهان گوێی لێ بگرنو خۆشیان بوێت.

شاری بۆن دەکەوێتە باشوری ولایەتی نوردراین — فیستڤالن لە خۆرئاوای ئەڵمانیای یەکگرتوو، نزیک لە شاری کولۆنیا، شاری بۆن لە ساڵی ڕابردودا ژمارەی دانیشتوانەکەی ١١٦,٣١٣ کەس بوو. بۆن تاکو ساڵی ١٩٩٠ پایتەختی کۆمار بوو، پێش ئەوەی بەرلین بکرێتە پایتەخت بۆ ئەڵمانیای یەکگرتوو. بە کۆشکی بوبلسدورڤدا تێدەپەڕم کە بە خۆیو باخچەو ڕووەکە تایبەتەکانییەوە خراوەتە سەر زانکۆ، لەو باخچەیەدا گوڵی (تیتانینفۆرز) هەیە کە لە سۆمەترەوە هێنراوەو لە ساڵی ٢٠٠٣ دا نازناوی درێژترین گوڵی لە جیهاندا وەرگرت، درێژییەکەی لەکاتی کرانەوەیدا دەگاتە ٢٧٤ سم. من کرانەوەی ئەو گوڵە سەیرەم نەبینی کە لە ساڵێکدا تەنها یەک ڕۆژ بە کراوەیی دەبینرێت، ئەم گوڵە لەنێو گوڵە بۆندارەکانی خانەوادەکەیدا، بەکراوەیی کورترین تەمەنی هەیە. بەڵام ئەو گوڵانەی دیکە کە بە تەنیشت ڕێگای مۆزەخانەکەوە بوونو گوڵەکانی سەر بەلەکۆنەکان، بە ڕەنگو بۆنەوە پێشوازیان لێدەکردی.

لە بۆن (ڕۆژانە بازاڕ) پڕە لە جموجووڵ, ئەم ڕۆژانە بازاڕە دەکەوێتە بەردەم بینای شارەوانی کە لە ساڵی ١٧٣٧ دا لەسەر شێوازی باروک دروستکراوە. لە بەرامبەر بازاڕەکەدا ئەو شەقامە بچووکە

دەست پێدەکات کە پێی دەڵێن کۆڵانی بۆن, لەم کۆڵانەو لە خانوی ژمارە بیستو لەساڵی ١٧٧٠ مۆسیقاری بلیمەت لودڤیگ ڤان بتهۆڤن لەدایک بووە.

ئەو خانووە یەکێکە لەو خانووە دەگمەنانەی شێوازی سەدەی هەژدەیان پێوە ماوەتەوە، پاش تێپەڕبوون بە دەرگایەکی مێژوویی تەختەدا، دەگەیتە بەرهەیوانێک کە بێستانێکی بچووک و ترومپایەکی کۆنی ئاوی تێدایە، دواتر بەهۆڵێکدا تێدەپەڕم ژمارەیەک سەرە پەیکەریی بەردینی لەخۆگرتووە، لە باخچەی نهۆمی یەکەمی ئەوماڵەدا ڕادەوەستم کە بتهۆڤنی مۆسیقاری تێدا لەدایک بووە , لەبەردەم پەیکەری سەری «بتهۆڤن»دا ڕادەوەستم کە دەکەوێتە ناوەڕاستی بێستانەکەوە.

زەردەخەنەی پاسەوانەکە خەریکە دەبێتە سەمفۆنیایەکی دیکە کە خاوەن ماڵەکە نەینوسیوە. پاسەوانەکە تۆزقاڵە خۆڵەکەی سەر دەسکی دەرگاکە دەسڕێت , وەک ئەوەی پەنجە بەو پیانۆ بچووکەدا بنێت کە پاش کەمەکێکی دیکە دەیبینین، کاتێک بەسەر پلیکانەیەکی تەختەدا سەردەکەوین. لەسەر دیوارەکانی خانووەکەو لەدەوری دەرگاو پەنجەرەکان، تەختەکان کەڕووەکە سەوزەکانیان پێدا هەڵگەڕاوە، لەگەڵ دێڕەکانی نۆتەی مۆسیقادا لەیەک دەچنو کاتێک بە پەیژەکانی مۆسیقادا سەردەکەوێت خەریکە وەک ئاوازێک سەما دەکات.

پێش سەرکەوتن و لەنهۆمی خوارەوە کە دەڕوانێت بەسەر باخچەکەدا، بەلای مێزێکدا تێدەپەڕم کە بەسەرهاتی بتهۆڤنو مێژوی بنەماڵەکەیان دەگێڕێتەوە. لەبەردەم مێزەکەدا دوو نەخشە بە کراوەیی دانراوە، یەکێکیان نەخشەی شاری لەدایکبونەکەیەتیو ئەوی دیکەیان نەخشەی شاری ناوبانگە هونەرییەکەی، ڤییەنایە. لەوێدا ئەوە دەخوێنمەوە کە بتهۆڤن لە ساڵی ١٨٠٢ دا، چۆن دوچاری کەڕییەکی سادە بووە، بەمەش وردە وردە دەستیکردووە بە دوورکەوتنەوە لە ناوەندە هونەرییەکان. لەگەڵ زیادبوونی حاڵەتی کەڕییەکەی کە دووچاری ببوو، لە ئاهەنگە گشتییەکاندا واز لە ژەنینی مۆسیقا دەهێنێتو لە ژیانی کۆمەڵایەتیش دووردەکەوێتەوەو ڕوودەکاتە تەنیاییو گۆشەگیری، بەمەش بەرهەمەکانی کەمدەبنەوەو تابێت ئاڵۆزتر دەبن. تەنانەت ئاوا وەڵامی ڕەخنەی ڕەخنەگرەکانی دەداتەوە: (ئەو مۆسیقا بۆ نەوەکانی داهاتوو دەژەنێت).

ئەوە ڕاستیە تا ڕۆژی ئەمڕۆش کارەکانی بتهۆڤن، هێشتا گرنگترین بەرهەمە کە مۆسیقای کلاسیکی جیهانی بەرهەمیهێناوە. دوان لە سەمفۆنیاکانی کە لە کاتی کەڕبوونیدا نووسیبوونی، زۆرترین جەماوەریان هەیە، ئەوانیش سەمفۆنیای پێنجەم و سەمفۆنیای نۆیەمە. هەروەها بتهۆڤن گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەر مۆسیقادا هێنا، گۆرانیو وشەی خستە نێو سەمفۆنیای نۆیەمیەوەو ئەم پەیامەی بۆ جیهان نارد: (لە ئایندەدا هەموو مرۆڤەکان دەبنە برا).

## گەنجینەکانی بتهۆڤن:

ماڵئاوایی لە پاسەوانی خوارەوە دەکەم، سەردەکەومە سەرەوەو دەچمە لای ژنە پاسەوانی دوو نهۆمەکەی سەرەوە. ئا لێرەدا منداڵە پەرجووەکە لەدایکبووەو ژیاوە، کەلوپەلەکانی مۆزەخانەی بتهۆڤن گەنجینەیەکی ڕاستەقینەن. لێرەدا گەورەترین کۆمەڵەی شوێنەوار دەبینین کە تایبەتن بە

مۆسیقارە مەزنەکە، لەوانە هەزار هێڵکاری ئەسڵی لەگەڵ چەند نوسخەیەکی ئاشکرا لەو کارانەی کە بەدەستوخەتی خۆی نوسیونی، ئەمە لەپاڵ کۆمەڵێ پارە بۆ یادگاری، تابلۆی زەیتی، ئامێری مۆسیقا و چەند کەلوپەلێکی تر کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەکاریهێناون، هەروەها ئەو ڕێبەرە دەبینین کە ئەو منداڵە لێوەی فێربووە چۆن ئۆکۆردیۆن بژەنێت. کورسی و پیانۆ گەورەکەی دەبینین کە بەر لە مردنی بۆ دواجار لە ڤییەنا مۆسیقای لەسەر ژەندوە. بەڵام ئەمانە هەموو شتێک نین!

لە ژووری پێنجەمی یەکەم نهۆمی سەرەوەدا، لەلای چەپی دەرگاکەوەو لەژێر سەرقاپێکی شووشەییدا، چەند ئامێرێک دانرابوون کە لە ناوەوە ئازاریان پێگەیاندم، ئامێرەکان بریتیبوون لەو ئامێرانەی منداڵەکە لەکاتی توشبوونیدا بە کەڕی بەکاریهێنابوون، تا بەهۆیانەوە گوێ لە کەسانی دی بگرێت، ئەو ئامێرە مسیانە چەندە قورس بوون کە لە دوولایەوە بە تەلێکی کانزایی لەسەرەوە دەبەسرێن. سەرچاوەی ئازارەکە تەنها سەختی ئامێرەکان نەبوو، بەڵکو سەختی لەدەستدانی ئەو هەستە بوو کە تادەهات وردە وردە زیادی دەکردو دواجار هەموو هەستی بیستنی لەدەستدا. مایناردسولون لە کتێبەکەیدا (بتهۆڤن لە ساڵانی کۆتاییدا) کە ساڵی ڕابردوو دەرچوو، باس لەوە دەکات لۆدفیگ بتهۆڤن هەر لە سەرەتاوە شەیدای مۆسیقا بووە، باوکە مۆسیقارەکەی دوای ئەوەی بەهرەی گەورەی کوڕەکەی بۆ دەردەکەوێت، ڕۆژانە هونەری مۆسیقای فێردەکاتو بڕیاردەدات بیکات بە «مۆزارت»ێکی تازە، بێگومان ئەمەش خەونێکی گەورەبوو، چونکە مۆزارت لەو کاتەدا لوتکەی مۆسیقا بوو.

لە ساڵی ١٧٧٨ دا، بتهۆڤن یەکەمین ئاهەنگە مۆسیقیە ناسراوەکەی پێشکەش کرد، لەوکاتەدا تەمەنی هەشت ساڵ بوو، (لە کانونی یەکەمی ١٧٧٠ دا لە ژوورێکی سەرەوەی ماڵەکەدا لەدایک بووە). دایکە باشو بەسۆزەکەی لەو حەوت منداڵەی کە ببووی، چوار منداڵی مردبوو، ئەو منداڵانەی مابوونەوە هەموویان کوڕ بوون، گەورەکەیان مۆسیقارە بەناوبانگەکەمانە. بتهۆڤن لە ساڵی ١٧٨٢دا، کە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو، یەکەم کارە مۆسیقییە ناسراوەکەی بڵاو کردەوە، لە ساڵی دوایدا ١٧٨٣، مامۆستاکەی لەبارەیەوە دەنوسێتو دەڵێت: (ئەگەر ئەو بەم شێوەیە بەردەوام بێت، ئەوا دەبێتە مۆزارتی سەردەم). بتهۆڤن لە ساڵی ١٧٨٤دا، لەسەر ئامۆژگاری (نیڤ )ی مامۆستای وەک ئەندامێک لە تیپی مۆسیقای سەر بە کۆشکی شازادەی کۆلۆنیا دامەزرا، لەو کاتەدا تەمەنی چواردە ساڵ بوو.

## ئامێرە پزیشکیەکان:

ماڵ — مۆزەخانەکە بەباشی مێژووی ئەو سەردەمە دیاریدەکات، نەک تەنها بۆ ئەو ئامێرە پزیشکیانەی یارمەتی بیستن دەدەن، نەک تەنها بۆ ئەو ئۆکۆردیۆنە تەختە سەرەتاییەش کە بتهۆڤن لە تەمەنی دە ساڵیداو لە کڵێسای (ڕاسپاردە بچوکەکان) کە ئێستا بووەتە کڵێسای قەدیس ریمیجیوس، مۆسیقای پێلێدەدا، بەڵکو لەپاڵ ئەوانەدا ئامێری کەمانچەکەو جانتاکەشی دەبینین کە بتهۆڤن لەگەڵ ئۆرکسترای (بۆن) مۆسیقای پێلێداوە. بتهۆڤن گەورە دەبێت و دەبێتە هاوڕێیەکی مامۆستای منداڵانی خێزانەکەیان، لەسەر ژەنینی پیانۆ مەشقو ڕاهێنانیان پێدەکات. لە نهۆمی

دووەم و لە ژووری ژمارە (٨)دا، بەپێی بەڵگەکانی مۆزەخانەکە، وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەو پیانۆیە دەبینین کە هونەرمەند تۆماس برودوود پێشکەشی بتهۆڤنی کردبوو، تۆماس برودوود ساڵی ١٨١٧ ناودارترین دروستکەری ئامێرەکانی پیانۆ بووە لە لەندەن. لەبەردەم ئەم پیانۆیەدا، پیانۆیەکی دیکە دانراوە کە هونەرمەندی بەناوبانگی نەمسا کونراد گراف دروستیکردوە، ئەم هونەرمەندە دروستکەری ئەو پیانۆیە بوو کە بتهۆڤن بۆ دواهەمین جار لە ڤییەنا مۆسیقای لەسەر ژەند.

بتهۆڤن لە ماڵەوە وردە وردە جێی باوکی گرتووەتەوە، ئەمە دوای ئەوەی باوکی تادەهات سەرخۆشتر دەبوو، ئەرکەکانی ناوماڵی لەبیردەچووەوەو کارەکەشی لە کۆشکی پاشایەتیدا پشتگوێدەخست. بەمەش بتهۆڤنی بچکۆلە لە لایەنی داراییەوە خێزانەکەی بەڕێوە دەبردو هەردوو برا بچوکەکەی تاکو تەمەنێکی زۆر بەخێوکرد. کاتێک شازادە ماکسمیلیان فرانز هەست بەمەزنی بەهرەکانی بتهۆڤن دەکات، لە ساڵی ١٧٨٧دا، بڕیار دەدا بتهۆڤن بنێرێت بۆ ڤییەنا، تاکو خوێندنەکەی لە دنیای ئەدەبو هونەری مۆسیقادا تەواوبکات. لەوێ مۆزارت گوێی لە ئاوازەکانی بتهۆڤن دەبێتو بە هاوڕێکانی دەڵێت: (ئەم ناوەتان (بتهۆڤن) لەبیرنەچێت، چونکە لە ئاییندەدا دەبێتە خاوەن پلەوپایە).

لە شاری بۆنەوە نامەیەک بە بتهۆڤن دەگاتو پێیڕادەگەیەنێت کە دایکی لەسەرە مەرگدایە، ئیدی بتهۆڤن دەگەڕێتەوە تا بۆ دواجار دایکی ببینێت. دوای پێنج ساڵ لەو بەرواره، واتە لە ساڵی ١٧٩٢ دا، بتهۆڤن دەگەڕێتەوە بۆ ڤییەنا تاکو پێکهاتە مۆسیقییەکەیو خوێندنە باڵاکەی تەواو بکات، لەوێ تا کۆتایی ژیانی دەمێنێتەوە. لەسەر دیواری هەموو ژوورەکاندا، ئەو تابلۆ زەیتیانە دەبینیت کە وێنەی بتهۆڤن و خێزان و هاوڕێ و مامۆستاکانی دەردەخەن، لەوانەش وێنەی لۆدڤیگی باپیرە گەورەی (١٧١٢ — ١٧٧٣)، مۆسیقاژەن جۆزیف هایدن، کوڕە بچووکەکەی ئیمپراتۆر ماری تریزا، هەروەها ئۆرکستری شاری بۆن دەبینیت کە لە ئاهەنگێکی دەمامکداردا (تنکری) مۆسیقا دەژەنن!

## یەکەمین مۆسیقاری سەربەخۆ:

بتهۆڤن لە میانەی ساڵی ١٨٠٩ لە لوتکەی سەرکەوتنیدا، لەسەر بانگهێشتی جیرۆم بۆناپارت، برای ئیمپراتۆر ناپلیۆن، بیر لە جێهێشتنی ڤییەنا بۆ فەرەنسا دەکاتەوە. بەڵام هاوڕێ کچە ئۆرستۆکراتیەکەی (ئانا ماری ئیرۆدی) لە ڤیینا لێنەگەڕا بڕوات، هاوڕێ دەوڵەمەندەکانی ماری، بۆ ئەم کارە یارمەتیانداو پارەو بەخششێکی زۆریان خستەبەردەست، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی ساڵانە بڕە پارەیەکی زۆر بدەن بە بتهۆڤن، تاکو وایلێبکەن پێویستی بە هیچ نەبێت یان هیچ خەمێکی دارایی نەبێت. تەنها مەرجیان ئەوە بوو کە ڤییەنا بەجێنەهێڵێت و بۆ هیچ وڵاتێکی دی نەڕوات، ئەم موچە ساڵانە زۆرە وای لە بتهۆڤن کرد لەڕویی مادییەوە ببێتە مۆسیقارێکی سەربەخۆ، بەمەش بووە یەکەم مۆسیقار کە بەهۆی کارەکەیەوە بژی. پێش ئەو باخ و مۆزارت و هایدن لە کۆشکی یەکێک لە ئەرستۆکراتەکاندا کاریان دەکردو لەسەر بەخششو خەڵاتەکانی ئەو ئەرستۆکراتە دەژیان، بەم شێوەیە سەردەمێکی نوێ لە مێژووی مۆسیقادا هاتەئارا، ئیدی مۆسیقار بووە کەسێکی سەربەخۆ، هەرکاتێک، هەرچییەکی بیەوێت دەینوسێت.

ئێمە لە کۆتایی مانگی ئابی ساڵی ١٨١٢ داین، لەم مانگەدا بە ڕێکخستنو ئامادەکاری خاتو بیتینا برنتانۆ، چاوپێکەوتنە بەناوبانگەکەی نێوان بتهۆڤن و گۆتە ڕوویدا، هەریەکە لەو دوو پیاوە مەزنە زۆر سەرسامبوون بەیەکتر، بەڵام لێکتێنەگەیشتن. بتهۆڤن بۆی دەرکەوت کە گۆتە زۆر مەرایی بۆ دەستەڵات دەکات تاکو بەخششەکانی دەسەڵاتی دەستکەوێت. وەلێ گۆتە پێیوابوو بتهۆڤن زیاد لە پێویست کەسێکی لوتبەرزە. لە ڕاستیدا بتهۆڤنی مۆسیقار زۆر سەرسامبوو بە گۆتەی شاعیر، شیعرەکانی وەردەگێڕایە سەر پارچە مۆسیقای ناوازە. بتهۆڤن لە کۆتاییەکانی ژیانیدا هیچی نەدەبیست، لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو بۆ تێگەیشتن لەگەڵ ئەو کەسانەی دەیاندواندو بۆ قسەکردن لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە شەقامەکان یاخود لە چاخانەکاندا، لەسەر دەفتەر شتەکانی دەنوسی. ئەمە دوای ئەوە دێت لە سەرەتای توشبونی بە نەخۆشی کەڕی، نکوڵی دەکرد لەوەی دوچاری ئەو نەخۆشییە بووە. بە سەیرکردنی دەمولێوی ئەو کەسانەی قسەیان لەگەڵ دەکرد تێدەگەیشت چی دەڵێن. کەچی ئەوەتا ئێستا شت دەنوسێت و ئەوانەی دەیدوێنن، بەنوسینی وەڵامەکانیان وەڵامی دەدەنەوە.

بتهۆڤن لە ڤییەنا و دێهاتەکانی دەوروبەری، بە تەنها دەمایەوەو خۆی دەخستە ئامێزی سروشتەوە، بۆنی گوڵەکانی دەکرد، تەماشای کلوی بەفری دەکرد کە هێدی هێدی دەباریو ڕوخساری گوڵەکانی دەسڕی، بتهۆڤن بەخۆشەویستیەوە دەستی لە نۆتە مۆسیقیەکانی دەدا، بەڵام نەیدەتوانی گوێ لە ئاوازەکانی بگرێت، دیمەنێکی رۆمانسی بوو، تەنها مۆسیقایەکی بەرجەستەی کەمبوو.

## ماڵئاوا بتهۆڤن:

بتهۆڤن لە ٢٦ ی مارتی ساڵی ١٨٢٧ دا کۆچی دوایی کرد، مۆزەخانەکەی لەمیانی دوو کاری هونەریدا کە موچڕکەیەکی کەم بە جەستەدا دەهێنن، دیمەنی مردنەکەی لەخۆدەگرێت. کاری یەکەم لەژووری نۆیەمدا هەڵواسراوە بەرامبەر بە ژمارەی سەمفۆنیە بەناوبانگەکەی، کارەکە بە فلْچەی نیگارکێش جۆزێف دانهاوسەر دروستکراوەو بریتییە لە تابلۆیەکی لیتۆگرافی مۆسیقار کە لەسەر جێگەی مردنە. بەڵام کاری دووەمیان لە ژووری یانزەیەمدا دانراوەو کاری هەمان هونەرمەندەو بریتییە لە دەمامکێک بۆ دەموچاوی بتهۆڤن پاش ١٢ کاتژمێر لە مردنی!

لە ڕێورەسمی بەخاک سپاردنی «بتهۆڤن»دا ٢٠ هەزار کەس ماڵئاواییان لێکرد، (ڕۆژی ٢٩ ی مارت بەخاک سپێردرا، هونەرمەند فرانز ستوبر لە تابلۆیەکدا بە ڕەنگی ئاوی وێنەی کێشاوە). بیست هەزار کەس لەگەڵ تەرمی مۆسیقارەکەدا بوون، بەڵام هەمو ساڵێک بە ملیۆنەها کەس یادی دەکەنەوە. بەتایبەتی لەو فیستیڤاڵە مۆسیقییەدا کە بەناوی خۆیەوەیە و شارەکە لە ٣١ ی ئابەوە تاوەکو ١ ی تشرینی یەکەم سازیدەکات.

# نامە بۆ میلنا




نووسینی: فرانز کافکا
لەفارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

## مران ١٠ ژوین ١٩٢٠ پێنج شەممە

ئێستا بێجگە لە شتێک نامەوێت باسی هیچی تر بکەم ( هێشتا نامەکانتم بە وردی نەخوێندۆتەوە، تەنیا ئەوە نەبێت وەک پەروانەیەک چۆن بەدەوری مۆمدا گڕ دەخوات خۆم بە دەوریاندا گێڕاوەو چەند جارێکیش سەری خۆم سووتاندوە، تا ئەو شوێنەی من تێی گەیشتووم ناوەرۆکی ئەم دوونامەیە دوو ناوەرۆکی جیاوازن. یەکێکیان ئەوەیە تا دوا دڵۆپ سەرمەستی پەیمانەکەی بم و ئەوی تریش پێویست بەوە دەکات کە دووبارە هوشیاربیمەوە). دەبێت ئەمەی دوەمیان دواتر نووسرابێت.

ئەگەر بەهاوڕێیەک بگەین و بەتاسەوە لێی بپرسین دوو کەڕەت دوو دەکاتە چەند پرسیارێکی بێ ئەقڵانەو شێتانەمان لێ کردوە. بەڵام هەمان پرسیار بۆ پۆلی یەکی سەرەتایی ماقووڵ و دروستە. وائێستا، میلنا، پرسیاری من لە تۆ ئەوەیە کە ئەو جۆرە شێتایەتیە لەگەڵ حاڵەتی قوتابخانە سەرەتاییەکەدا تێکەڵ بەیەک بون. هیچ لەم حاڵەتە تێ نەگەیشتم کاتێک کەسێک لە گەڵما تێکەڵ دەبێت، (بۆ نموونە وایس)[1] کە بە هۆی پێکهاتەی لۆژیکی خۆمەوە تێکم دا، ئەو مەیلەی هەمە کە کەسی دووەم هەڵەی کردوە، کەمتر و کەمتر بڕوام بە موعجیزەیە، بەتایبەتی لە پەیوەندیی لەگەڵ خۆمدا، من هەمیشە لە دەرک کردنی چۆنایەتی و چەندایەتی ئەم ڕەوتە دەستەوستان بووم.

نازانم بۆ دەبێت بەم شتانە ئاوی ژیان بشڵەقێنین کە خۆی لێڵە. لەبەردەممدا، پانتایی ڕێگایەک دەبینم و دەزانم چ ڕێگایەکی سەختە. پێش ئەوەی فریوی چرکەساتی نیگایەک بخۆم (لە خۆمەوە بیگرە تاکەسانی دی، چونکە ئەگەر باشی لێی وردبیتەوە ئەم قسەیەی من لە خاکیەتیەوە نیە بەڵکو لە خۆناسینەوەیە) دەبێت لەم بارەی کە ئێستا منی تێدام بۆ سەفەرکردن بەرێگایەکدا کە نەدەتوانم بیبڕم و نە دەست گیرم بێت وازبێنم. وا ئێستا میلنا، نامەکانی تۆم پێ دەگات، چۆن دەتوانم جیاوازیەکانیان

باس بکەم؟ مرۆڤێک کە لە نێو گەناو و پۆخڵی ناو جێگای مردندا پاڵ کەوتوە، فریشتەی مەرگ، کە لە هەموو فریشتەکانی دی پیرۆزترە دێتە ئێرەو دەیبینێت، ئایا کەسێکی لەم جۆرە دەوێرێ بمرێت؟ کەسێکی وا خۆی لوول دەکات، ئەم دیو ئەو دیو دەکات و تەنانەت زیاتر خۆی لەناو جێگاکەدا دەشارێتەوە، ئەو کەسە توانای مردنی نیە، هیچ کەسیش بە هیچ ڕێگایەک ناتوانێت بڕوای ئەوەم پێ بکات و پێم بسەلمێنێت. (کەسییش نەیتوانی ئەو شەوە ئەمە بۆ دۆستویفسکی بسەلمێنێت، ژیانی منیش بریتیە لە یەک شەو) بۆیە تەنیا خۆم دەتوانم ئەوە بۆ خۆم بسەڵمێنم، چونکە خۆم لە ئاستی ئەو تێگەیشتنەدام ( وەک چۆن تۆ جارێک بە خەون مرۆڤێکت لەسەر کورسیی سەفەریەکەیدا بینی) من لای خۆمەوە ناتوانم بڕوا بەوە بکەم، لەبەر ئەوە ئەم پرسیارە پێکەنین هێن بوو.

بێگومان تۆ زوو ئەوەت زانی — بە تەواویی لەوە دەچێت کە مامۆستایەک لەبەر نەخۆشی و ماندووبوون بەمەبەست بیەوێت قوتابییەک بیخەڵەتێنێت. واتا باوەڕ بکات کە قوتابییەکە مەسەلەکە بە چاکی تێ گەیشتوە، لە کاتێکدا قوتابییەکە هیچ لە مەسەلەکە نەگەیشتوە، چونکە بەناجۆری و نادروستی وەریگرتوە. لەبەرئەوەی بە چاکی تێگەیاندنی قوتابی تەنیا لە ریگای مامۆستاوە دەبێت، نەک لە ریگای ناڵەو شیوەن کردن، یان بەلاواندن یان پەنا بۆبردن یان خەو و خەون ( ئایا دوا پێنج شەش نامەی منت پێ گەیشتوە، هەموو ئەم شتانەیان تیایە).-با ئەم مەسەلەیە بەکراوەی بهێڵینەوە) نامەکەتانم دیسان بەسەر کردەوە، ئاماژەیەکت (بەو کچە)[2] دابوو. بۆ دڵنیایی و نەهێشتنی هیچ گومان و دوودڵیەک (دەبێت بڵێم) ئەوەی تۆ بۆ ئەو کچەت کردوە، بەچاو پۆشین لەو رەنج و ئازارە کاتیەی کە بۆت داوە گەورەترین خزمەتت کردوە. بۆ ئەوەی لە دەست من رزگاری بێت هیچ رێگایەکی دی بێجگە لەمە بەدی ناکەم. لەڕاستیدا ئەو کچە هەستێکی تایبەتیی تێ گەڕابوو، پێشبینی نەگبەتی و ئازاری دەکرد. بەڵام بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لەوە بگات کە ئەو گەرماییەی لەپاڵ مندا هەستی پێ دەکرد (گەرماییەکی شووم بوو بێگومان بۆ ئەو نەبوو) سەرچاوەکەی لە کوێوەیە؟ لەبیرمە لەسەر قەنەفەیەک و لە باڵەخانەیەکی یەک ژووریدا بەپاڵ یەکەوە لەویرشویس[3] دانیشتبووین. (پێ دەچێت مانگی نۆڤەمبەر بووبێت، بڕیاربوو تاهەفتەیەکی تر باڵەخانەکە ببێت بەهی خۆمان) ئەو دڵخۆش بوو کە دوای زەحمەتێکی زۆر ئەو باڵەخانەیەمان دەست کەوتبوو، مێردی ئایندەی لەپاڵیادانیشتبوو (دووبارەی دەکەمەوە کە من بەتایبەتی لەسەر هاوسەرگیریەکە زۆر سوور بووم، ئەو تەنیا قبووڵی کردبوو، بێزاربوو، بەڵام وردە وردە بەم هەستەوە خۆی ڕاهێنابوو) کاتێک ئەم شانۆییە بە هەموو وردەکاریەکانیەوە، بەچەند جارێکی زیاد لەژمارەی لێدانی دڵی نەخۆشێکی تا لێهاتوو دێنمەوە بەرزەینی خۆم، زیاتر لەوە دەگەم کە من لە ناسینی هەر جۆرە وەهمێکی مرۆڤ، هەر جۆرە وەهمێک کە بتوانرێت وێنای بکرێت بەهرەمەندم(لەم لایەنە تایبەتیەوە، منیش بە مانگ گیرۆدەی ئەو وەهمە بووم. ئەگەرچی لای منەوە تەنیا وەهم نەبوو، بەڵکو وێنەیەکی تری دڵنەوایی و بایەخ پێدان بوو. دووریيش نیە کە ئەم هاوسەرگیریە بەمانای تەواوی وشە هاوسەرگیریەکی ئاقڵانە دەربچوایە) من لەوە دەترسم کە پەرداخە شیرەکە لە دەمم نزیک بخەمەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە ئەم پەرداخە دەتوانێت (نەک بەرێکەوت بەڵکوو هەر بەمەبەست) لەبەرچاوما بتەقێتەوەو پڕیشکەکانی بەرسەروو چاوم بکەون.

پرسیارێک: ئەو تانەو تەشەرانەی بەسەرتا دەبارێن دەربارەی چین؟ راستە. منیش هەندێک جار خەڵکیم بێزار کردوە، بەڵام ئەوان بەدڵنیاییەوە دوای ماوەیەکی درێژ لەسەر ئەو بابەتە سەرکۆنەی من ناکەن. تەنها ئەوەیە کە ئەوان بێدەنگن و روو بەولاوە دەکەن و بڕوایشم وایە لەناوەوەی خۆیاندا تەنانەت سەرزەنشتیشم ناکەن. من لەنێو خەڵکیدا لەم بابەتە ئاوارتەیە بەهرەمەندم.

وەلێ هەموو ئەمانە بەبەراورد لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەی کە ئەمڕۆ بەیانی لەکاتی لەخەوهەستاندا بەرۆکی گرتم، بایەخی نیە. ئەو بیرۆکەیە سیحرێکی وای لێ کردم کە ئیدی نەمزانی چۆن حەمامم کرد و چۆن خۆم پۆشتە کردەوە، ئەگەر میوانێک نەهاتایە (میوانەکە ئەو پارێزەرە بوو کە گۆشت بە خۆراکێکی پێویست دادەنێت) هەر بەو نەزانکاریەوە ریشیشم تاشیبوو. بیرۆکەکەی من بە کورتی بەم جۆرەیە: بۆ ماوەیەک واز لە مێردەکەت بهێنە، ئەمە شتێکی تازە نیە، چونکە پێشتریش روویداوە، لەبەر ئەم هۆیانە: نەخۆشیەکەی تۆ، تووڕەیی ئەو (ئەم کارە سوودی ئەویشی تیایە) پاشانیش ئەو هەلومەرجەی ئێستای ڤیەنا، نازانم تۆ دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟ یەکێک لە گەڕەکەکانی بۆهێمیا دەشێت بۆ تۆ چاک بێت. وایش چاکترە من شەخسی نە خۆمی تێ هەڵبقورتێنم و نە دەربکەوم. پارەی سەفەرەکەت (لەبارەی دانەوەیەوە دەگەینە ئەنجام) لەمن وەربگرە (قسەی خۆمان بێت لەم لایەنەوە من ئیمتیازێکی تریشم بەردەکەوێت. من بەهۆی ئەوەوە کە کارمەندێکی چالاک و هەڵسووڕاوم پلەکەم بەرزدەبێتەوەو ئەمەیش مەستم دەکات، کاری من بەگاڵتە جاڕیەکەیەوە تاڕادەیەک ناسک و ئاسانە. بیری لێ بکەرەوە، من نازانم بۆ چ کارێک مووچەم دەدەنێ) ئەگەر رێکەوت وای کرد ئەم پارەیە بەشی مانگێکی نەکرد، تارادەیەک بۆ ئێوە ئاسانە لەبەرئەوەی زۆر نیەو دەتوانن فەراهەمی بێنن. بەڕاستیی لەمە زیاتر لەسەر چاکەو بەرز راگرتنی ئەم بیرۆکەیە نارۆم. بەهەرحاڵ ئەمە دەرفەتێکە بۆ تۆ تا لەبارەی بیرۆکەکەی منەوە بڕیاربدەیت و بەو بڕیارەیش بۆ منی دەردەخەیت کە ئایا من دەتوانم لەبارەی شتەکانی تری خۆمەوە پشت بە بڕیارەکانت ببەستم یان نا (چونکە من گەیشتوومەتە ئەوەی کە ئەم بیرۆکەیە بەنرخە).

### مران سێیەمی ژووین ۱۹۲۰

ئێستا کە ئەم نامە ترسناکەی- ئەگەرچی بە هیچ جۆرێک بە قووڵی ترسناک نیە- تۆم خوێندۆتەوە، ئاسان نیە سوپاسی ئەو شادی و خۆشیە بکەم کە لە سەرەتادا و لەکاتی گەیشتنی نامەکەتدا بۆم رەخسا، ئەمڕۆ پشوە، رەنگە پۆستی ئاسایی ئیتر نەگات. لەوەیش دوو دڵم کە بەیانی هەیدنیەو نازانم نامەی تۆم پێ بگات یان نا. جۆرە بێدەنگیەکی زاڵمانە لەئارادایە، هەرچەندە تا ئەو شوێنەی پەیوەندیی بە تۆوە هەبێت ئەم بێدەنگیە هەرگیز خەمهێن نیە. تۆ لە دوانامەدا هێند بەتوانابوویت کە من تەماشام دەکردیت، وەک چۆن لەسەر کورسیە سەفەریەکەمەوە تەماشای شاخەوانەکان دەکەم بۆ ئەوەی بزانم دەتوانم لەو سەرەوەو لەناو بەفردا دەست نیشانیان بکەم یان نا، وا ئێستایش پێش نیوەڕۆ نامەکەت گەیشت. من دەمتوانی نامەکە لەگەڵ خۆمدا بەرم، لە گیرفانم دەری بهێنم، بیخەمە سەرمێزەکەم و دیسانەوە بینێمەوە گیرفانم، بەم جۆرەیە کە دەست پێی خۆشە یاری لەگەڵ نامەدا بکات. تەماشایان دەکەیت و لەو منداڵانەت رازی دەبیت، تەواوی ئەو ماوەیە من سەر

لەشکرو ئەندازیارم لە بەرانبەری خۆمدا دەدی (ئەگەرچی ئەوانە خەڵکانێکی هێژاو یەکدڵن) تەنانەت لەوەیش کەمتر گوێبیستیان نەبووم. ئەو خۆراکەی دیسانەوە ئەمڕۆ خواردم نیگەرانی نەکردم. دوای نان خواردن وتووێژ لەسەر ماتماتیک بوو کە مەسەلە کورتەکان بۆ من رووناکتر بوو لە چارە دوورو درێژەکان. هەر لەو کاتەدا و لە پەنجەرە کراوەکەوە دیمەنێک بەرانبەرم بوو. دیمەنێک لە دارسنەوبەر، خۆر، چیاکان، گوندەکان و لە هەموو ئەمانەیش گرنگتر دیمەنی ڤیەنا بوو.

پاشان نامەکەم بەوردی خوێندەوە، مەبەستم ئەوەیە نامەی رۆژی یەکشەمەم بەوردی خوێندەوە، خوێندنەوەی نامەی رۆژی دووشەممەتم تاگەیشتنی نامەیەکی تری خۆت دواخست. مەسەلەکە وایە کە من بەرگەی بەوردیی خوێندنەوەی ئەو نامەیەم نیە. هێشتا بەتەواویی چاک نەبوومەتەوە. بێجگە لەوە ئەو نامەیە ئیدی کۆن بوە. بەپێی حساباتی من دەبێت پێنج نامە بەرێگاوە بێت، لانی کەم سیان لەو نامانە دەبێت ئێستا بە دەستت گەیشتبن، تەنانەت ئەگەر نامەیەکی تر ون بووبێت یان بە هۆی ڕاسپێریەوە درەنگ بگات، ئیدی هیچ بۆ من نامێنێتەوە بێجگە لەوەی داوات لێ بکەم هەر ئێستا وەڵامم بدەیتەوە. قسەیەکیش بکەیت هەرباشە، بەڵام دەبێت قسەیەک بێت کە هەندێک لە سەرکۆنەکانی نامەی رۆژی دووشەممە کەم بکاتەوەو وابێت قابیلی خۆێندنەوە بێت. هەروەها بەدرێژایی ئەو دوو شەممەیە من تووشی کێشەیەکی سەخت (بەڵام نەک نائومێدانە) لەگەڵ ئەقڵی خۆمدابووم.

وائێستا نامەیەکی تر- وەلێ درەنگە- ئەمڕۆ دوای چەندجار بەڵێنی بێ هوودە، بڕیارمداوە بڕۆم بۆ بینینی ئەندازیارەکە. تەماشای نیگارکێشانی منداڵەکانی بکەم کەلەبەر گەورەیی ناهێندرێنە ئێرە. بەزەحمەت دەزانرێت تەمەنی لەمن گەورەتر بێت. خەڵکی باڤاریایە. پیشەگەرو زۆری خوێندوە، بەڵام لەهەمان کاتدا پڕدەماخ و ماقووڵە. لە پێنج منداڵ دوانی بۆماوەتەوە ( بەهۆی نەزۆکیی هاوسەرەکەیەوە منداڵێکی تری نابێت) کوڕەکەی ١٣ساڵ و کچەکەی ١١ ساڵە. دنیایەکی سەیرە! ئەو لەم هاوکێشەیەدا سەرکەوتوە. نا، میلنا، نابێت تۆ دژی هاوکێشە قسە بکەیت.

### کافکاکەت

سبەیش نامەیەک دەنووسم، بەڵام ئەگەر کەوتە دووبەیانی دیسانەوە خۆت بێزارمەکە، تکایە.

جارێکی تر نامەی رۆژی یەک شەممەم خوێندەوە، ئەمجارەیان تەنانەت لە خوێندنەوەی یەکەم جار ترسناکتربوو. میلنا، پێویستە دەم و چاوت بەهەردوو دەست بگیرێت و ڕێک تەماشای ناوچاوت بکرێت، بۆ ئەوەی خۆت لە (ئاوێنە)ی چاوێکی ترەوە بناسیتەوە، تالەوەو دوا نەتوانیت ئەو بیرو بۆ چوونانەی لەم نامەیەدا نووسیوتن بیانخەیتە مێشکتەوە.

### مران، ژووین ١٩٢٠ هەینی

ئاخۆ کەی کەسێ دێت و ئەم دنیا شێت و وێتە تۆزێک ڕاست دەکاتەوە؟ هەرکاتێک من بەپەرۆشەوە بەملاو ئەولادا دەگەڕێم، لێرەو لە هەموو جێگایەکدا وێرانەیەکی جوان بەسەر چیاکانەوە هەیەو دەتوانم هەست بەوە بکەم کە پێویستە منیش بەهەمان ئەندازە جوان بم. بەڵام لەناو جێگادا، مرۆڤ لەباتی خەو زۆرباش بیردەکاتەوە. بۆ نموونە ئەمڕۆ بەدەر لە پێشنیازەکانی دوێنێ- ئەوەم بەبیرا هات کە تۆ دەتوانیت هاوین بڕۆیت بۆ لای ستازا[٤]، وەک خۆت نووسیبووت ئەو لە گوند دەژی. دوێنێ من

قسەی گەوجانەم کرد. وتم ڕەنگە هەندێک مانگ پارەکە بەش ناکات، ئەم قسەیە بێ مانایە، بەردەوام پارە هەیە. نامەی بەیانی و عەسری سێ شەممە پێی سەلماندم کە پێشنیازەکەم بەنرخە، بێگومان زەحمەتە ئەمە ڕێکەوت بێت، چونکە هەموو شتێک ئەوە دەسەلمێنێت، هەموو شتێک بە شێوەیەکی ڕەها-ئەگەر فێڵبازیەک لەدوای پێشنیارەکەوە هەبێت، کە نیە،- ئایا لە کاری ئەم جانەوەرە گەورەیەدا کە دەتوانێت بەپێی پێویست خۆی تەواو بچووک بکاتەوە، شوێنێک هەر دەست دەکەوێت کە لە پیلان بەدووربێت. کەواتە من دەتوانم سنوورێکی بۆ دابنێم، تەنانەت مێردەکەیشت لەم بارەیەوە دەتوانێت پشت بە من ببەستێت. ڕەنگە بمەوێت زێدەڕۆیی بکەم بەڵام دەشێت پشتم پێ ببەسترێت. من هەرگیز نامەوێت تۆ ببینم، نە ئێستا و نە لە ئایندەدا، هەر گوندێکت پێ خۆشە دەتوانیت تیا بژیت، (لەم ڕووەوە من و تۆ هاوڕاین) گوندێکی پڕ لە هەوراز و لە هەمان کاتدا شاخاوی نەبێت و کوێستان و دارستان و دەریاچەی تیابێت) من جێگایەکی لەم جۆرەم لەهەموو شوێنێکی دی پێ چاکترە.

میلنا: تۆ لە کاریگەریی نامەکانت کەم دەکەیتەوە، من هێشتا نامەکانی دوو شەممەی تۆم[٥] (jen strachoras) بەتەواویی نەخوێندۆتەوە (تەنیا ترسێکە لە تۆ) (ئەمڕۆ من ئەمەم تاقی کردەوە، تاڕادەیەک سەرکەوتوو بووم) هەرچەندە ئەم پێشنیازە نامەکانی تۆی کۆن کرد، بەڵام هێشتا نەمتوانی تا کۆتایی نامەکەت بخوێنمەوە، لەگەڵ ئەوەدا بەرهەمی خوێندنەوەی نامەکەی ڕۆژی دووشەممەت شەوێک بێ خەویم بوو، نامەی سێ شەممەت ( هەروەها کارتە سەیرەکەت- ئایا لە کافتریادا نووسیبووت؟ ئایا دەبێت من وەڵامی ورفل[٦] بدەمەوە لەبارەی ئەو تۆمەتبارکردنانەوە کە تۆ دەیڵێیت؟ ببوورە من وەڵامی ئەوە نادەمەوە کە هی تۆیە، تۆ خۆت زۆر باشتر وەڵام دەدەیتەوە، ئەمەیش چاکترە) ئەو نامەیە بە تەواوی دڵنیایی و ئارامیی پێ بەخشیم، بێگومان نامەکەی سێ شەممەیشت بێ سەرزەنشت و دڕک نیە، بەڵام ئیتر ئەوە تۆیت کە وادەکەیت و (هەڵبەت ئەمە هەقیقەتە، هەقیقەتی تەزوویەکی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی) هەرچیەکیش لە تۆوەبێت زۆر زەحمەتە بتوانیت بەرگەی بگریت.

## پەراوێزەکان:

١- ERNST WEISS (١٨٨٢-١٩٤٠) شاعیر و نووسەری خەڵکی پراگ. کافکا لەساڵی ١٩١٢ هاوڕێی بوە، بەڵام پێش ئەم نامەیە پەیوەندیی خۆی لەگەڵدا بڕیوە.

٢- بەڕای ماکس برود لە نامەکانی میلنادا، لەهەر جێگایەکدا ئاماژە بە ((ئەو کچە کرابێت))، مەبەست دەزگیرانی دووەمی کافکا-ژولی وریزک-ە لەساڵی ١٩١٨ لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا کافکا ئەو کچەی ناسی، چەند سەفەرێکی کورتیان پێکەوە کرد. ساڵی ١٩١٩ دەبێتە دەزگیرانی و ساڵی ١٩٢٠ کافکا پەشیمان دەبێتەوە.

3-WRSCHOWIZ

٤-STANISLAVA JILOVSKA ناسراو بە STASA ژنێکی هاوڕێی کافکایە.

٥- بەزمانی چیکی واتا ( تەنیا نیگەرانی تۆم).

٦-FRANZ WERFEL (١٨٩٠-١٩٤٥) نووسەری خەڵکی پراگ و لە هاوڕێکانی کافکا و ئەرنست پولاگی مێردی میلنا.

**سەرچاوە:** کتێبی: نامەهایی بە میلنا



# وێستگەکانی سەردەم

## جەنگی ڕۆشنگەرانو فێندەمێنتالیستەکان لە ئەوروپا

لە عەرەبییەوە: سەردەم

## عیراق، سێکسو میدیا

لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

## زیندانو مەسەلەی داهێنانو ئازادی بیرورا

لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

## ڕۆبنسۆن کروزۆ ڕۆمانێکی زیندوو

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

## تونسو بازدانی مێژوو

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# جەنگی ڕۆشنگەران و فێندەمێنتالیستەکان لە ئەوروپا

لە عەرەبییەوە: سەردەم

تەوەری ئیشکردنی هاشم ساڵح لەم کتێبەیدا، بریتییە لە ناسینی گرنگی سەردەمی ڕۆشنگەری، لەلای نەوەکانی دواتری ئەوروپا. چونکە ئەو نەوانە نەیاندەتوانی چێژ لە ئازادییە فیکرییەکان وەربگرن، ئەگەر ئەو جەنگە بڵێسەدارانە نەبوایە کە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، پێش دووسەد ساڵ لەمەوبەر بەرپایانکرد. ئەم مەسەلەیە ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرە فەرەنسییە هاوچەرخەکان دانیپێدادەنێن، لەوانە "میشێل لۆنی" پێیوایە ئەگەر لە سەردەمی ئێستاماندا کڵێسا لەگەڵ شارستانیەتی مۆدێرن ئاشتبوەتەوە، ئەوا ئەمە بۆ ئەو هەوڵو تێکۆشانە دەگەڕێتەوە کە هەریەک لە "ڤۆڵتێر"و "جان جاک ڕۆسۆ"و ئەوانی دیکە، پێش دوو سەد ساڵ لەمەوبەر، پێیهەستان. لێرەوە نەوەی ئەمڕۆ ئەوە دەدورێتەوە کە نەوەکانی پێشوو چاندیان.

فەیلەسوفەکان فیکرەی (دینێکی عەقڵانی)یان چاندو لەبەرامبەر توڕەیی‌و ناڕەزایی کڵێساو فێندەمێنیتالیستەکانی ئەو سەردەمەدا ڕاوەستان. ئێستا لە ئەوروپای ئەمڕۆدا فێندەمێنیتاڵیزم چیتر هیچ مەترسییەکی نییە، هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە مەسیحیەتی عەقڵانی‌و، عەقڵانیەت کە "ڤۆڵتێر"و "ڕۆسۆ" خەونیان پێوەدەبینی‌و لەپێناویدا تێکۆشان، لە ئێستادا بووەتە حەقیقەتێکی واقیعی. هەنووکە چیتر کڵێسای کاسۆلیکی فشار ناخاتە سەر عەقڵەکان یاخود سەرکوتیان ناکات، وەک ئەوەی لەسەردەمی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەریدا دەیکرد.

هاشم ساڵح پێوایە پیاوانی ئاین لە فەرەنساو لە وڵاتانی دیکەی پێشکەوتوی ئەوروپادا، لەمڕۆدا، سەبارەت بە مەسەلەی موعجیزە، هەمان هەڵوێستی "ڕۆسۆ"یان لەسەر موعجیزە هەیە کە لەو سەردەمەدا دنیای لێهاتەدەنگ. پیاوانی ئاین ناچارن گەشەی زانستو پێشکەوتنی عەقڵانی

لەبەرچاو بگرن، ئەوان لە ئێستادا ناتوانن هەمان هەڵوێستی کۆنەپەرستانە وەربگرن کە کاهینەکانی هاوپیشەیان پێش دوو سەد ساڵ لەمەوبەر هەیانبوو، دژ بە گەشەکردنو پێشکەوتنو بیروڕا فەلسەفییەکان بوون. لێرەوە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، پیاوانی ئاینیان ناچارکرد عەقیدە لە خڵتەو خاشاکە ناعەقڵانییە زۆرەکەی پاکبکەنەوە.




ئێستا پیاوی ئاین لە ئەوروپادا، لە هەندێ لایەنەوە، لە فەیلەسوف دەچێت، بەتایبەتی لە لایەنی گومانی عەقڵانی، ئێستا پێش ئەوەی باوەڕ بە مەسەلەکان بێنێت، بە وردی تاوتوێیان دەکاتو میتۆدی ئەزمونگەری بەکاردەهێنێت. لێرەوە ئیمانی کوێرانە یان دەمارگیر یاخود ناعەقڵانی، لەبەردەم بەرژەوەندی ئیمانی تازەو فراوانو کراوەدا کە پرسیارە عەقڵانیو فەلسەفییەکان لەبەرچاو دەگرێت، پاشەکشەی کردووە.

وەلێ فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، لە ڕەوتە پانو بەرفراوانەکەیدا، دەستیان بۆ ئەزمونی ڕۆحی ئاین نەبردو نەیانکردە ئامانج، تەنانەت دەستیان بۆ بیرۆکەی خودای بەرزو بڵند نەبرد، هەروەها دەستیان بۆ عەقیدەی ئەخلاقی ئەم ئاین یاخود ئەو ئاینی دیکە نەبرد. بەڵکو ئەوان ئامانجیان قسەکردن بوو لەسەر کۆنترۆڵی پیاوانی ئاین بۆ دەسەڵاتو حوکمڕانی یان تێکەڵکردنی سیاسەتو ئاین یاخود جێگیرکردنو چەسپاندنی سیستمێکی سیاسی تایفەگەری یان مەزهەبی یاخود بڵاوکردنەوەی بیروڕای دەمارگیری کوێرانە. بەمانایەکی دیکە، فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئامانجیان ڕەتکردنەوەی ئاین نەبوو، یان ئامانجیان بێبەشیکردنی خەڵکی نەبوو لە ئاینەکانیان، بەڵکو ئامانجیان ئەوەبوو وابکەن خەڵکی لە تێگەشتنو جێبەجێکردنی ئاینەکانیان، زیاتر لێکبوردەبن. هەروەها ئامانجی هەرە سەرەکییان بریتی بوو لە چەسپاندنی ئازادی بیروڕاو ویژدان بۆ یەکەمین جار لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا.

دەکرێ بڵێین ڕۆشنگەری، وەک پەرچەکردارێک دژ بە دەمارگیری ئاینی هات کە هەموو ئەوروپای داگیرکردبوو، لانی کەم تاکو سەدەی هەژدەهەم، ئەوروپا لەبەرامبەر ململانێ ئایینییەکان یان ململانێ مەزهەبی یاخود تایفییەکاندا، باجێکی زۆر گەورەی دا. بە درێژایی هەردوو سەدەی شازدەهەمو حەڤدەهەم، چەندین شەڕی ناوخۆی تێدا هەڵگیرسا، ئەم شەڕانە، دوای ئەو مێژوە، لە هەندێ ناوچەی تایبەت هەر بەردەوام بوو.

دواتر دانەری کتێبەکە ئاماژە بە وتەیەکی "تۆدۆرۆف" دەکاتو دەڵێ یەکەم شت کە فەیلەسوفانی

ڕۆشنگەری ئازادیان کرد بریتی بوو لە کاری مەعریفە، چونکە لە سەدەکانی پێشتردا، ئەوەندە بەس بوو کە پیاوانی کلێسا هەرچییەکیان بویستایە دەیانوتو خەڵکیش بێ گفتوگۆکردن باوەڕیان پێدەکرد. لەو ڕۆژگارەدا مەعریفە پشتی بە شانوشکۆو هەیبەتی پیاوانی ئاینی بەستبوو. بەڵام لەگەڵ هاتنی سەردەمی ڕۆشنگەری، چیتر مەرجەعی مەعریفە وەک خۆی نەمایەوە، بەڵکو عەقڵو تاقیکردنەوەی زانستی بوونە سەرچاوەی مەعریفە. ئەوەی عەقڵ دەیسەلمێنێت دەبێتە شتێکی لۆژیکی، یاخود ئەوەی تاقیکردنەوەی زانستی دەیسەلمێنێت، دەبێتە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر.

لێرەوەو لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا، عەقڵ بووە یەکەم ئامرازی مەعریفەو بەمەش شوێنی شانوشکۆو هەیبەتی پیاوانی ئاینی گرتەوە. ئیدی جیهانی پانو فراوان بووە مەرجەعی بەرزی مەعریفە، نەک پاپا یان کاردینالْ یاخود مەتران.

"ئیسحاق نیوتن" لە سەدەی هەژدەهەمدا ڕۆڵێکی گەورەی بینیو کاریگەری لەسەر هەموو فەیلەسوفەکان هەبوو بەبێ ئاوەرتە، پاشان لە سەدەی نۆزدەهەم "داروین" هاتو هەمان ڕۆڵی گەورەی بینی. بەم شێوەیە مەعریفە لە دەسەڵاتی غەیبانی پیاوانی ئاینی مەسیحی ڕزگاری بوو، هەموو دۆزینەوە تازەکانو داهێنانە تەکنەلۆژییەکان بوونە ئەگەرێکی شیاو، لەوانە دۆزینەوەکانی فیزیاو پاشان کیمیاو زیندەوەرزانی، تەنانەت زانستی کۆمەڵناسیو دەرونشیکاریش.

بەمجۆرە مەعریفە لە دەسەڵاتی تیۆلۆژیای مەسیحی ڕزگاری بوو کە بۆ چەندین سەدە بەرتەسکیکردبووەوەو جڵەوی گرتبوو، ئیدی فەلسەفەی عەقڵانی بووە خاوەن بڕیار، ئەمە دوای ئەوە دێت کە پێشتر نۆکەرێکی ڕیسوای زانستی تیۆلۆژیای مەسیحی بوو.

ناوی کتێب: جەنگی ڕۆشنگەرانو فێندەمێنتالیستەکان لە ئەوروپا

نوسینی: هاشم ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای الساقی بێروت ٢٠١٠

ژمارەی لاپەڕە: ٣٨٤ لاپەڕەی گەورە

## سەرچاوە:

عمر كوش، ڕۆژنامەی البيان، ٢٠١٠/١١/٢٠

# عیراق، سێکس و میدیا

کێلی ئۆلیڤەر
لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

لە ڕابردوودا ژنە ئەمریکیەکان بەتایبەت لە شەڕی کۆریا و ڤێتنام و شەڕی دووەمی جیهان وەک برینپێچ، وەک ژنگەلێکی بەبەزەیی لە دواوەی بەرەکانی جەنگەوە دەردەکەوتن، بەڵام لە شەڕی عیراقدا ژنە ئەمریکیەکان لە زیندانی ئەبووغرێب سوکایەتی بە زیندانیەکان دەکەن. ئەمەش بەو مانایە دێت کە گۆڕان بەسەر سیاسیەتی ئەمریکادا دێت لە پەیوەندی سەربازەکانی بە جەنگە جیاوازەکانەوە. چی وادەکات ئەمریکا لە شەڕی عیراقدا مارێنزە ئافرەتەکان بەکاربێنێت؟

ڕەنگە بەشێکی پەیوەندی بەوەوە هەبێت شەڕکردنی مارێنزەکان لە عیراقدا پێشەوەو پاشەوەی نیە، ئەمریکا و چەکدارە یاخیەکان بەرەی جەنگیان نیە و ئەگەری ئەوە هەیە لە هەرشوێنێکی عیراقدا ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە. ڕەنگە دەرکەوتنی ژن لە شەڕەکاندا و بەشداری کردنی مێینە پەیوەندی بەم دیاردەیەوە هەبێت، بەڵام خاتوو کێلی ئۆلیڤەر شتەکە هەروا نابینێت. ئەو دەیەوێت لەسەر ئەوە بوەستێت کە ژن پارچەیەکە لە سۆز و بەزەیی چۆن چانس بەخۆی دەدات سوکایەتی بە زیندانیان بکەن و تەنانەت ئازاری جەستەییشیان بدەن. سەرباری ئەوەی ئایدۆلۆژیا و ڕژێمە تۆتالیتارەکان ژنیان بۆ شەڕ و ئازاردانی زیندانیان بەکار هێناوە لەوانە بەشداری بەرچاوی ژنانی نازی لە قەسابخانەی جولەکەکاندا و ئازاردانی زیندانیانی کەمپەکان و بەشداری بەرچاوی ژنانی سۆڤیەت لە شۆڕشی سوری خوێناوی ئەو وڵاتەدا ئەوە دەخاتە ڕوو کە ژنان کراونەتە کەرەستەیەک بەدەست ڕژێمە شمولی و تۆتالیتارەکانەوە. بەڵام خاتوو کێلی ئەوە ناشارێتەوە کە بەکارهێنانی ژن بەو شێوە بەرچاوە لە ئازاردانی زیندانیان لە ئەبوغرێب دیاردەیەکی تەواو نوێیە.

لەم کتێبەدا خاتوو کێلی بەکارهێنانی ژن لە سوکایەتیکردن بە زیندانیە نێرینەکانی عێراق بۆ

ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە مەبەست لە بەکارهێنانی ژن بۆ ئەم کردەوەیە ئەوەیە کە ئەمریکیەکان لە عیراقدا دەیانەوێت ڕەگەزی مێینە وەک چەکە کوشندەکان lethal weapons بۆ تێکشاندنی مۆرالی ئەو زیندانیانە بەکاربهێنێت کە سەر بە گروپە تیرۆریستیەکانن و بڕوایان بە حەلاڵ و حەرامی جەستە هەیە. بەمانایەکی تر ئەم تێکەڵبوونە بەبێ جلوبەرگ لەگەڵ زیندانیە عیراقییەکان کە زۆربەیان سەر بە گروپە فەندەمێنتاڵە دینیەکانی عیراقن مەبەست تەنها تێکەڵبوونی جەستەیی و سێکسی نیە، بەڵکو وەکو خاتوو کێلی بۆی دەچێت مەبەست لە لاقەکردنی بیروباوەڕە ئاینی و کەلتوریەکانیشە.

نوسەر لەم کتێبەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی و باس لەوە دەکات زۆرێک لە کچان فێر دەکرێن خواردن دروست بکەن، خەونی کچانیش بە منداڵی هەرچییەک بێت خەونێک نیە بۆ پەیوەندی کردن بە گروپە چەکداریەکانەوە. زۆرێک لە خەونی مێینە لە دامەزراوە مۆدێرنەکاندا خەونی بوون بە مامۆستایە. بەلام لە ئێستادا زۆرێک لە ژنانی ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکا ڕەگەزی مێینە پەیوەندی دەکەن بە سوپاوە و خۆیان پڕچەک دەکەن.

ئەم کتێبە لە چوار بەش پێک هاتووە لەگەڵ سەرەتا و کۆتایی:

سەرەتا: سێکس، مادەی بێهۆشکەر

بەشی یەکەم: ژن، چەکێکی نهێنی لە بەرەی جەنگی مۆدێرندا

بەشی دووەم: ئازادی سێکی وەک ئازادی جیهانی

بەشی سێیەم: جەنگی بەردەوام، ڕاپۆرتی ڕاستەقینە و زیندوو

بەشی چوارەم: بێگوناهی، بێبەرگری و توندوتیژی

کۆتایی: دوبارە ڕەگەزەکان وەک شایەتحاڵ.

ئەم نوسەرە پێمان دەڵێت توندوتیژی خەسڵەتێکی سروشتی نیەو ئەوە پەیوەندی بە کۆمەڵگەوە هەیە کە مرۆڤەکان لەسەر توندوتیژی ڕادەهێنێت. ئەو پێی وایە ژنگەلێکمان هەن لە پیاوان توندوتیژترن. مارگرێت تاتچەر کەم پیاو خۆی لەشانی دەدا لە زبری و توندڕەویدا.

بەلام ئەوەی نوسەر لەم کتێبەدا کاری لەسەر دەکات بەر لە هەرشت ئەوەیە کە دەسەلات لە ئەمریکا شەرعیەت بە سیاسەتەکانیان دەدەن لەڕێی بەکارهێنانی مێینەوە بەوەی وا پیشان بدەن ئەوە ئەمریکایە بڕوای بە جیاوازی جێندەری هەیە. هەر بۆیە لامان سەیر نەبێت کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆندۆلیزا ڕایس وەک ژنێک ئەو پۆستە وەردەگرێت و « وەزیری دەرەوەی ئێستای ئەمریکا هیلاری کلینتۆن بەهەمان شێوە. وەرگێڕ». هیچ کێشەشی نیە گەر ژنان لە عیراق و ئەفغانستان ببنە قوربانی دەستی شەڕی نەخوازراوی خۆرئاوا لەو دوو وڵاتە.

هەرچۆنێک بێت ئەوەی کێلی ئۆلیڤەر لەم کتێبەدا هەڵوێستەی لەسەر دەکات جۆرێکە لە بەشداری ژن لە پرۆسە سەربازیەکاندا و لاسایکردنەوەی ئەو کردەوە توندوتیژییەی پیاوان لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا ئەنجامی دەدەن. بینینی جگەرەیەک بەدەم یەک لە مارێنزە ئافرەتەکانەوە کە

زیندانیەکی ڕووت کردۆتەوە و دەست بۆ ئەندامی زاوزێی ڕادەکێشێت، هیچ نیە جگە لەوەی کە بڵێین ئێمە لەبەردەم سەدەیەکداین گەر خۆشحاڵ بوبین بەوەی ژیان جوانە لەبەرئەوەی مێینەی تێدایە ئەوا دوای ئەم ڕووداوە مەترسی ئەوە لەئارادایە جیهان ئەوەندە بەرەو دڵڕەقی هەنگاو بنێت کە ژنانیش بەشدار بن لەم پرۆسەی ئازاردانەی ئینسان لە کۆمەڵگە جیاوازەکان.

Women as Weapons of War: Iraq, Sex, and the Media
,Kelly Oliver
Copyright © ٢٠٠٧ Columbia University Press





# زیندان و مەسەلەی داهێنان و ئازادی بیروڕا

لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

ئایا کەسێک تەواوی ژیانی لە زینداندا بەسەرببات، ئازادی بیروڕاو داهێنانەکانی بۆ هەتاهەتایە کۆتوبەند دەکرێت؟ ئایا دەرونی مرۆڤ لەنێو پێچاوپێچە تاریکەکانی گرتوخانەکاندا وندەبێت. ئاخۆ مرۆڤ لەنێو زیندانەکاندا کە وەک بەردی سەرەڕێ، تێپەڵدەدرێ، تەسلیم بەو واقیعە ناهەموارە دەبێت. ئایا سالانی نێو گرتوخانەیەکی ساردو شێدار، سیماو ڕوخساری ئەو مرۆڤە دەسڕێتەوەو هەنگاوەکانی لە پەلوپۆ دەخاتو تەمەنی بەفیڕۆ دەڕوات؟

ئازادی مرۆڤ ملکەچی ئاگرو ئاسن نابێت، چونکە مرۆڤ بە ئازادی دەژیو لەگەڵیشیدا دەمرێت. نە بێدەنگیو تاریکی شوێن، نە مانەوە لە پشتی شیشەکاندا بۆ کاتی دووردرێژ، ناتوانن ئازادی فیکرو بیروڕا لەناوبەرن. مرۆڤ ئازادی خۆی هەڵگرتووەو لە هەر شوێنێکو لە هەر زەمەنێکدا بێت لەگەڵیدایە.

ڕەنگە هەندێجار مرۆڤ بەڕاستی پێویستی بەوەبێت بۆ ماوەیەک زیندانی بکرێت، تاکو لەنێو زیندانەکەدا داهێنانەکانی بنوسێتەوە. ئەو جۆرە لە مرۆڤ پێویستیان بە تەنهاییەکی تەواو، تەنهاییەکی ڕەها هەیە، تاکو ئەو وێنە ناتەواوەی لە عەقڵو ویژدانیدا، سەبارەت بە چەندین کێشەو گرفت هەیە، تەواوی بکات. ئەوانە خاوەنی ئەو کێشانەن کە لەسەر دڵیانەو خاوەنی ئەو ئازادییەن کە لە عەقڵیاندا چەسپیوەو وەک خوێن بەنێو جەستەیاندا دێتودەچێت. ئەو زیندانییە (ئازادانە) هەرگیز هێرشیان نەکردوەتە سەر ئەوانەی زیندانیان کردوون. بەڵکو سوپاسیان کردوون کە ئەو دەرفەتەیان بۆ ڕەخساندون تاکو بە تەنها لەگەڵ خۆیاندا بمێننەوە، دوور لە دڕندەیی کۆمەڵگاو هاتوهاواری سیاسەتو قیرەقیری ژیان.

نمونەی عەرەبیو جیهانی بۆ ئەو مەسەلەیە زۆرە، بەناوبانگترین نمونە لەسەر ئاستی جیهانی عەرەبی، نوسەری گەورەی عەرەب «عەقاد»ە، ئەم نوسەرە لەبەر ئەوەی لە نوسینەکانیدا دەستدرێژی

کردووەتە سەر مەلیک «فوئاد» زیندانیکراوە. لە زیندانەکەیدا ڕایگەیاندووە کۆمەڵێ کاری گەورەو بایەخدار ئەنجامدەدات، لەوانە لێکدانەوەی ماناکانی قورئان، بەڵام نەخۆشی لێنەگەڕاو تەمەن دەرفەتی ئەوەی پێنەدا.

میسر لەسەردەمی «جەمال عەبدولناسر»دا ناودارترین زیندانی سیاسی بەخۆیەوە بینی، ئەویش نوسەرو ڕۆژنامەنوسی کۆچکردوو «مستەفا ئەمین» بوو، ئەم نوسەرە بەوە تۆمەتبار کرابوو گوایە سیخوڕی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردووە، بۆیە فەرمانی زیندانیکردنی هەتاهەتایی بۆ دەرچوو. «مستەفا ئەمین» ماوەی مانەوەی لە زیندانیدا قۆستەوەو ژمارەیەک لە بەناوبانگترین کتێبەکانی نوسی، لەوانە یاداشتەکانی لە زنجیرە کتێبێکدا بە ناونیشانی: (ساڵی یەکەمی زیندان) پاشان (ساڵی دووەمی زیندان)و چەندین کتێبی دیکە.

یەکێک لە دیارترین زیندانە سیاسییەکان، سەرۆکی کۆچکردوی میسر «محەمەد ئەنور سادات» بوو کە لە زیندانیدا ژمارەیەکی زۆر یاداشتی نوسیوە، هەر هەموو ئەو یاداشتانەی، بە تایبەتی ئەو ڕۆژانەی لە زیندانیدا بووە، لە کتێبە ناسراوەکەیدا (گەڕان بەدوای خود)دا تۆمارکردووەو تێیدا باس لەوە دەکات لەنێو زیندانیدا تیپێکی شانۆیی ئاست بەرزی پێکهێناوە، هەروەها ئیزاعەیەکی ناوخۆییشی دروستکردووەو هەر خۆشی ئیشی پێکردووە. لە زیندانەکانی ئەو ڕۆژگارەی میسردا، شتی لەو جۆرە ڕێگاپێدراو بووە.

لەسەر ئاستی جیهان، زیندان لە ژیانی چەندین نوسەردا هێزێکی پاڵنەر بووە بۆ داهێنان، لەوانە فەیلەسوفی شیکردنەوەی لۆژیکی «برتراند ڕاسل»، ئەم فەیلەسوفە لەبەر ئەوەی لەمیانەی جەنگی جیهانی یەکەم بانگەشەی ئاشتی دەکرد، زیندانی کراو لە زیندانیدا کتێبێکی لەسەر فەلسەفەی ماتماتیک بە ناونیشانی (پرنسیپەکانی ماتماتیک) نوسی.

«هێتلەر» لە میانەی زیندانیکردنەکەیدا، بەسەرهاتی ژیانی لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (کفاحی) نوسییەوە. ئەدیبی بەناوبانگی ئیسپانیا «سێرفانتس» لە زیندانیدا شاکارە مەزنەکەی (دۆن کیخۆت)ی نوسی. شاعیری ئینگلیزی ناودار «ڕالی» لە زیندانیدا کتێبێکی سەبارەت بە مێژوی جیهان نوسی، پاشان ئازادکرا تاکو لە جێبەجێکردنی ئەرکێکی نهێنیدا بەشداربێت کە بریتی بوو لە گەڕان بەدوای زێڕدا لە ئەمریکای باشور، وەلێ لە ترساندا گەڕایەوەو دواتر لەسێدارەیان دا.

بەڵام جۆرێکی دیکە لە زیندانی (سجین) هەیە کە بە درێژایی ژیانیان خۆیان لەناو خودی خۆیانداو لە تاریکییەکی هەتاهەتایدا زیندانیکردووە، چونکە کوێرن‌و هیچ نابینن. بەڵام بەهۆی ئەو بینینە ناوەکییەوە کە خودای مەزن پێیبەخشیبوون، بونەتە فەیلەسوف‌و بلیمەت‌و بە ئازادی ژیاون، لەوانە «تەها حسێن»و «مەعەری»و «هۆمیرۆس»و «بابینی»، کارەکانی ئەوانە بە نەمری ماونەتەوەو ناوبانگیان تاکو ئەمڕۆ تاکو سبەینێیەکی دوور هەر بە نەمری دەمێنێتەوە. کارەکانیان کۆمەڵە کارێکی کلاسیکی ناوازەیەو هەندێجار ئەوانەی چاویان هەیەو دەبینن، ناتوانن وەک ئەوان بنوسن.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بیرۆکەی بەربڵاو سەبارەت بە باردۆخی گرتوخانەکان، بیرۆکەیەکی خراپ‌و نێگەتڤەو لەوە تێناپەڕێت کە ئەو گرتوخانانە شوێنی ئەشکەنجەو ئازارو سوکایەتیپێکردنن،

شوێنێکە تێیدا بە دڵڕەقیو بە ئاگرو ئاسن مامەڵە لەگەڵ زیندانییەکاندا دەکرێت. وەلێ ئەم دیاردەیە لە ئێستادا کەمەکێک باشتربووەو بارودۆخی ناو زیندانەکان تاڕادەیەک باشتربووە. هەنووکە لە زیندانە هەمە جۆرەکانی میسردا، وەک زیندانی (طرة)و زیندانی ئافرەتان لەناوچەی قەناتیرەی خەیریو زیندانی (ئەبو زەعبەل)، بەشێوەیەکی مرۆڤانە مامەڵە لەگەڵ زیندانییەکاندا دەکەن، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەو زیندانیانە وەک هاوڵاتییەکی ساڵح لە زیندانەکان بێنە دەرەوەو سودیان بۆ خۆیانو بۆ کۆمەڵگا هەبێت. ئێستا لەنێو ئەو زیندانانەدا وانەی خوێندنی ئاسنگەریو تۆڕنەو بەرگدروییو چەندین وانەی دیکە دەخوێنرێت، لەوانە هەڵکۆڵین لەسەر تەختەو مسو وەرشەی دارتاشی هەیە، هەروەها هۆڵی گەورە هەیە بۆ وتنەوەی وانە لەسەر بابەتە هەمەجۆرەکان، سەرەڕای ئەوانە یاریگای وەرزشیو سینەماو هەندێ مەسەلەی دیکەی ڕۆشنبیری تێدایە. هەر هەموو ئەوانەش لە تەنهایی زیندانییەکانو لە مامەڵەی خراپ کەمدەکاتەوە کە تا ئێستا لە هەندێ گرتوخانەدا هەر ماوە.

دیارترین نمونە لەسەر گرتوخانەی نمونەیی، چ لەسەر ئاستی شێوەی گرتوخانەکەو چ لەسەر ئاستی ناوەڕۆکو جەوهەری گرتوخانەکە، گرتوخانەکانی سویدە. سوید ئەو دەوڵەتەیە لە ئەدەبیاتیدا هەرگیز زیندانی بە کەسێکی تاوانبارو مەترسیدار دانانێت. توانای سیاسییەکانو وەزیرو سەرکردەکانی ئەم دەوڵەتە، بۆ پێشخستنو تازەکردنەوەی گرتوخانەکان خراونەتەگەڕ، بەتایبەتی دەستەبەرکردنی ئارامیو پێداویستییەکانی (مرۆڤ)ی زیندانیکراو. کەسی زیندانی بە هەموو جۆرێک بایەخی پێدەدرێتو مامەڵەیەکی دروستی لەگەڵدا دەکرێت، بەتایبەتی لە ڕووی تەندروستیو لایەنی دەروونییەوە. ئەم گرتوخانانە لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنیو بایەخدان بە گیراوەکانی، لە ڕێگەی توێژینەوە زانستیەکانەوە پەرەیانپێدراوە. لە سوید بە زیندانییەکان دەڵێن (میوان-نزیل) نەک زیندانی، گوزارشتی زیندانی ناوترێت.

لە سوید، لە چوارچێوەی ڕێکخستنو گەشەکردنو بەرزکردنەوەی ئاستی زیندانەکانو ئەوەی پێی دەوترێت (زیندانی شەوانە)، لەم چوارچێوەیەدا زیندانییەکە بەیانیان بەبێ پاسەوان لە زیندانەکەی دێتەدەرەوە، ئێوارە دەگەڕێتەوە بۆ زیندانەکەی، موچەیەکی مانگانە وەردەگرێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی شتێک نییە ناوی زیندان بێت، بەڵکو ژورێکی گەورە هەیە کە گەرماوی تایبەتی خۆی هەیەو هەموو پێویستییەکانی (میوان)ی تێدا دەستەبەرکراوە. لەوانەیە ئاست بەرزی زیندانەکانی سوید بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لە سویدا زیندانیو تاوانە هەمە جۆرەکان کەمەو دەگاتە ڕادەی نەبوون. ئەمانە زمانی ئەم مەملەکەتە ئارامو یەکسانەیە. لەوێ هەژارو نەخۆشێک نییە کە یەکسەر سەرچاوەیەکی بژێوی دەستنەکەوێت، پزیشک هەیە بە خۆڕایی چارەسەری ئەوانە دەکات. لەم وڵاتەدا تاڕادەیەکی زۆر نەخۆشییە دەروونییو عەسەبییەکان کەمە، تەنها هەندێ حاڵەتی ئاوارتە نەبێت.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی البیان، ٢٠١٠/٩/٤، نوسینی منی مذکور.

تێبینی: ئەم بابەتە درێژەو ئێمە تەنها ئەوەندەمان لێوەرگرت.

# ڕۆبنسۆن کروزۆ
# ڕۆمانێکی زیندوو

**لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف**

یەکەمین نوسین کە بە یەکەم ڕۆمانی ئینگلیزی دادەنرێت ڕۆمانی ڕۆبنسۆن کروزۆی دانیاڵ دیفۆیە.

ڕۆمانی ڕۆبنسون کروزۆی دانیاڵ دیفۆ سەرباری ئەوەی بە سەرەتایەک بۆ دروستبوون و سەرهەڵدانی ڕۆمان لە ئەوروپا ئەژماردەکرێت، بەڵام ڕووداوەکانی ناو ئەم ڕۆمانە ناکرێت تەنها وەک گیڕانەوەیەک لە کتێبێکدا هەژمار بکەین. ئەم کتێبە چەندە وەک ڕۆمانێک نوسراوە بەڵام لایەنە ئابووری و سیاسی و ئاینی و کۆمەڵایەتیەکانی بوونەتە سەرەتایەک بۆ چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی گرنگ لە خۆرئاوادا.

ئەم ڕۆمانە لە ساڵی ١٧١٩ نوسراوە و باس لە دابڕانی مرۆڤێک دەکات بەناوی ڕۆبنسۆن کروزۆ و گیرسانەوەی لە دورگەیەک بۆماوەی ٢٨ ساڵ. هەموو ئەم ڕووداوە گرنگانە لە دورگەیەکدا ڕوودەدەن و هەموو هەوڵ و کەوتن و هەستانەوەکان پابەندن بە کروزۆری کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە.

زمانی گێڕانەوە و ئاستی تەکنیکی نوسین لەم ڕۆمانەدا یەکجار سادەیە. ئەوەی گرنگە لەم ڕۆمانەدا سەرباری ئەوەی بوعدێکی مێژوویی دەگێڕێتەوە، ئەوەیە کە لێکۆڵەرەوەکان لە هەر کۆتەیشنێکی ئەم نۆڤڵەدا دیراسەیەک دەکەن. بەگشتی ئەوەی ئەم نۆڤڵەی بە زیندوویی هێشتۆتەوە ئەوەیە کە بارتەقای کتێبخانەیەک کێتێب لەسەر ڕۆبنسۆن کروزۆ نوسراوە.

ئەوەی دانیاڵ دیفۆ لەم ڕۆمانەدا بۆمان باس دەکات لەڕووی ئاینیەوە ئەوەیە کە مرۆڤ لە تەنیایدا بیر لە بوونی خودا God دەکاتەوە. بە مانایەکی تر مرۆڤ وەک کائینێکی کۆمەڵایەتی لەبەردەم دیالۆگ و مشتومڕێکی بەردەوامدایە لەگەڵ ئەویتردا. بەڵام تەنیایی وا لە ئینسانەکان دەکات

هەمیشە لە بیرکردنەوەیەکی بەردەوامدابێت، بیرکردنەوە لە جیهان، بیرکردنەوە لە خودا و لە ئاسمان. ڕاستە کارەکتەرێکی وەک ڕۆبنسۆن کروزۆ بە ناسنامە ئاینی بووە و لە بنەماڵەیەکی تەواو ئاینی پەروەردە بووە، بەڵام هەڵهاتنی لە ماڵ وەک تاوانێک و دورکەوتەوە و ژیانی لە دورگەیەکدا بەتەنهایی وایلێدەکات بەشێوەیەکی فراوان باس لە خودا بکات.

پشتبەستنی کروزۆ بە خودا، لەو ڕوانگەیەوەیە کە ئەو دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگە. بەڵام کە ناتوانێت بەلەمەکەی لە سەر ڕۆخی دەریاکەوە بباتە نێو دەریا، ئەوا، پەنا بۆ خودا دەبات. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوەیە کە بیرکردنەوەی مرۆڤ لە ئایین، لەلایەکەوە بێدەسەڵاتی ئەوە لە سروشتدا و هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە کە هێزێک هەیە ئەم هەموو دەریا و دورگە و بیابانەی دروست کردووە. سەرباری ئەوەی مرۆڤ لەتەنهاییدا دەبێت پەناباتە بەر مۆدۆلۆگ و بۆئەمەش قسەکردنی تاکلایەنە لەگەڵ خوادا باشترین ڕێگەیە بۆ قوتاربوون لە تەنهایی (بەبۆچوونی دانیاڵ دیفۆ).

ئەوەی ئەم نۆڤڵەی دانیاڵ دیفۆ پێمان دەڵێت ئەوەیە کە ( پێداویستی دایکی داهێنانە). واتە مرۆڤ بۆ وەدەستخستنی پێداویستیەکانی پشت بەخۆی دەبەستێت. کروزۆ مادام لە دوورگەیەکدا بەتەنها ژیان دەگوزەرێنێت، ئەوا هیچ ڕێگەیەکی تری نییە دەبێت پێداویستیەکانی خۆی دابین بکات. مانەوەی کروزۆ لە دورگەکەدا وەک هاتنی ئادەم و حەوایە بۆسەر زەوی. ئەوانیش کە بەدەستی خاڵی دێنە سەر زەوی دەبێت ژیان بگوزەرێنن و بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت کار بکەن.

کارکردنی بەردەوام لەم ڕۆمانەدا یەکێکە مەبەستەکانی دانیاڵ دیفۆ بەوەی کە مرۆڤ بۆ ئەوەی بژێت دەبێت لە کارکردنێکی بەردەوامدابێت. خاڵێکی تر کە دانیاڵ دیفۆ لەم ڕۆمانەدا باسی دەکات مەسەلەی مانەوەیە لە شوێندا. کروزۆ مادام لە دورگەکەدا دەمێنێتەوە، ڕێگەی تری نییە جگە لەوەی کە خانوو دروست بکات، چونکە ئەو کارەکتەرێکی کۆچەری نییە، سروشت سەپاندویەتی بەسەریدا کە دەبێت لەم شوێنەدا بمێنێتەوە. سەرباری ئەوەش کە کروزۆ مادام دەمێنێتەوە ئەوا دەبێت نان پەیدا بکات، بۆیە پەنا دەباتە بەر چاندنی گەنم. چاندنی گەنم لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بریتیە لە مانەوەی مرۆڤ لە شوێنێی دیاریکراودا. چاندنی گەنم واتە گواستنەوەی مرۆڤ لە سەردەمی ڕاوکردن و پەیداکردنی خواردندا بە بەردوام لە گۆڕینی شوێنەکاندا بۆ مانەوە لە شوێنێکی دیاریکراودا. دانیاڵ دیفۆ لەم ڕۆمانەدا دەیەوێت لەسەر ئەو پنتە گرنگە بوەستێت کە مرۆڤ بۆ مانەوەی لە شوێنێکی دیاریکراودا دەبیێت پشت بە دوو شت ببەستێت: خانوو دروستکردن و جێهێشتنی ئەشکەوتەکان، چاندنی گەنم و دارودرەخت بۆ ئەوەی هەم پارێزگاریان لێبکات و هەم ژیانی لە بەربەریەتەوە بگوازێتەوە بۆ شارستانیەت، هەم دەبێت لەم ڕێگەیەوە سروشت ڕام بکات.

هەرچۆنێک بێت پاش ٢٨ ساڵ کروزۆ دەگەڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگە، سەرباری ئەوەی کە دەزانێت گەڕانەوە بۆناو کۆمەڵگە بەمانای ململانێ و تەماح و شەڕ و فەرامۆشکردنی خودا دێت.

**سەرچاوە:**

Bookreview.com

# تونس‌و بازدانی مێژوو

نوسینی:عەبدالوهاب المودب
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئای جووڵەی مێژوو چ جووڵەیەکی سەرسوڕهێنەری خێرایە! مانگێکی تەواو بەسەر خۆسوتاندنی «محەمەد بوعەزیز» لە سیدی بوزێدو لە ١٧ کانونی یەکەم تێنەپەڕی، لە ١٤ کانونی دووەم «بن عەلی» ڕایکرد. کەمتر لە مانگێک! بەڕاستی ئەوە ڕوداوێکی سەیرە. ئەو ڕوداوە، ئەگەرچی بەشێوەیەکی کتوپڕیش بوو، پیشانمان دەدات تەواوی میللەتێک، چۆن لەسەر شانۆی مێژوو، ئاواتەکانی بەدیدەهێنێت. ئەوە سەرکەوتنێکی جوانە چونکە دادپەروەرانەیە، دادپەروەرانەیە چونکە جوانە.

ئەم ئەڵقە ئاوارتەیە لە ئەڵقەکانی مێژوو، پڕبوو لە دەرهێنانی شانۆیی خۆماڵی‌و تەواو گەنجانە، پڕ بوو لە بەرائەت‌و خۆڕسکی. ئەوە شۆڕشێک بوو لە بنچینەدا لەڕێگەی ئەنترنێتەوە بەدیهات. لەبەر ئەوە خێرایی شۆڕشەکە هاوتایە لەگەڵ خێرایی شۆڕشی زانیاری کە شوێنکاتەکان کەمدەکاتەوە. لێرەوە ئێمە لە ئێستا بەدواوەو بەهۆی ئەم شۆڕشی یاسەمینەوە، لە مێژودا بەرجەستەکردنێکی تازەمان بۆ زەمەن هەیە. ئەم مێژووە لەمەولا ملکەچی چرپییەکە کە لە ئەنجامی بازدانی ڕایەڵەکانی شوێنکاتەوە بەرهەمهاتووە.

ئێمە ساتەوەختێکی مێژوویی ژیاین، تێیدا (نادیار-المجهول) لە تەنها چرکەیەکدا تێکەڵ بە (دیار-المعلوم) بوو، دوور هاتەوەیەک تاکو ببێت بە نزیک. لێرە بەدواوە مرۆڤایەتی لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە، بە شێوەیەک لەگەڵ ئاسۆی قەدەرو چارەنوسی ڕادێت کە نزیکە لە چەمکی لاهوتی خوداوەند کە ئاگاداری هەموو شتێکە. ئیدی ڕۆژانە لەسەر حسابی تایبەتی خۆی لەگەڵیدا دەژی، کەواتە ئاخۆ ئەنتەرنێت ئاگاداری هەموو شتەکانی دەوروبەریەتی؟

ئەم ئامرازە تازەیە، مەبەستم ئەنتەرنێتە، لەڕووی بابەتییەوە بێلایەنە، مەبەستم ئەوەیە خودی

ئەنتەرنێت هیچ نیەتێکی پێشوەختی نییە، نە بەم ئاراستەیەو نە بەو ئاراستەیەی دیکە. لێرەوە دەکرێ هەم خێرو هەم شەڕ، هەم باشو هەم خراپی لێبێتەدەرەوە. ئەنتەرنێت هیچ ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە ملکەچی حەزو ئارەزوی بەکارهێنەرەکانیەتی، هەروەها تەکنەلۆژیای تازەش هەمان ڕۆڵ دەبینێت. لەسەرەتاکانی ئەم سەدەی بیستو یەکەداو لە جیهانی ئیسلامییەوە، خراپترینو باشترین ڕوداومان بۆ هات کە بەرهەمی ئەنتەرنێتو تەکنەلۆژیای تازە بوون. مەبەستم لە ڕوداوی یەکەم تاوانی نەگریسی ١١ سێپتێمبەرە کە لەلایەن تاقمی قاعیدەوە ئەنجامدرا. ڕوداوی دووەمیش شۆڕشی یاسەمینی پیرۆزە. بەم شێوەیە شۆڕشی زانیاری وەک خودی خۆمانو وەک لێدانی دڵمان لەگەڵماندایە. بەم شێوەیە لە چەند ڕۆژێکی کەمدا، کەوتنی دیکتاتۆرێکو گەیشتنی تەواوی میللەتێک بە ئازادی-مان بینی. ئەوە میللەتێکە لە ناوچەیەکدا بەرەو بەرجەستەکردنی دیموکراسیەت هەنگاودەنێت کە لەلایەن شارەزایانی ڕۆژئاواوە، بە ناوچەیەکی مەحاڵ دادەنرێت بۆ پیادەکردنی دیموکراتی.

من ئەمە دەڵێمو زیادەڕۆیی ناکەم لە شێوازی دیموکراسی کە یەکێکە لە شێوازەکانی حکومڕانیو بە شانوباڵیدا هەڵنادەمو نایگۆڕم بۆ ئەفسانە. بەڵام لەگەڵ هەموو ناتەواوییەکانی دیموکراسیەتدا، کەچی دیموکراسیەت باشترین شێوازی سیاسییە بۆ ڕێکخستنی ژیانی پێکەوەیی. دیموکراسیەت تەنها شێوازێکە ڕێگە بە فرەییو گفتوگۆو جیاوازیو مشتومڕی دۆستو دوژمن دەدات، لەگەڵ پارێزگاریکردن لە ڕەوەشتبەرزی لەکاتی مشتومڕەکانو هێشتنەوەی لە چوارچێوەی سنوری عەقڵدا. بەڵێ ئەوە سیستەمی دیموکراسییە دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ لەڕێگەی گفتوگۆو دانوسانو ئەرگۆمێنت گۆڕینەوەوە مامەڵە لەگەڵ یەکتردا بکەین، لە ڕێگەی وشەکانەوە نەک فیشەکەکانەوە، قەناعەت بەیەکتر بکەین. دیموکراسیەت تەنها سیستمێکی سیاسییە کە فەزایەکی سیاسی کراوەمان بۆ دەستەبەر دەکات تاکو تێیدا بەوپەڕی ئازادییەوەو بەبێ ترس لە جەستەمان یان لە ڕۆحمان، گوزارشت لە بیروراکانمان بکەین.

لە چوارچێوەی ئەم تێڕوانینەدایە، دەبێ لەوە تێبگەین کە بەمدوایانە لە تونس ڕوویدا. ئەم ڕوداوە پێویستە لە ئاستی زەمەنی جیهانیدا جێگای بکەینەوە. نابێت کورتی بکەینەوە بۆ پۆلێنکردنە کۆنو بەسەرچووەکانمان، ئەو پۆلێنکردنانەی بەشێوەیەکی بنبڕو کۆتایی جیهانی بۆ ناوچەی شارستانیەتو ناوچەی دواکەوتوو دابەشدەکرد. ناتوانین لە بێدەنگی سیاسییەکانو ڕۆشنبیرانی فەرەنسی تێبگەین، تەنها لەژێر ڕۆشنایی خەسڵەتە سەرسوڕهێنو لەناکاوو کتوپڕەکەی ئەم ڕوداوە گەورەیەی تونسدا نەبێت. لە چوارچێوەی ئەم تێڕوانینەدا، دەکرێ لەو بێدەنگییە تێبگەینو پاساوی بۆ بهێنینەوە، بەڵام ئەمەش تەنها لە دوو هەفتەی یەکەمی شۆڕشەکەدا ئەو بێدەنگییە پاساوی هەیە. چونکە پاش ئەوە زەحمەتە لەو بێدەنگییە یان لە پاساوەکەی تێبگەین.

ئەو تراژیدیایەی لەو ناوچە دوورەدەستو پێشتگوێخراوەدا کە پێیدەوترێ سیدی بوزێد دەستیپێکرد، دەکرێ بەیەکێک لە شۆڕشەکانی برسییەتی بچوێنین کە لە سیستمە دیکتاتۆریەکاندا بەخێرایی بەرپادەبێتو بەخێراییش دەکوژێتەوە. ئەو سیستمە دیکتاتۆریانەی سەر بە جیهانێکی دیکەیە، جیهانێکی دوور، بیانی، نامۆ، جیاوازو لەناو بونیادێکی ئابوری دیکەو کەلتورێکی تایبەتمەندا کە قابیلی ئەوە نییە لەگەڵ شارستانیەتی ڕۆژئاوادا تێکەڵ ببێت. واتە ناوچەکانی ئیسلامو ئەفریقا.




دەکرێ بێدەنگی سیاسییەکانو ڕۆشنبیرانی فەرەنسا لە چوارچێوەی ئەو تێڕوانینە باوکسالارییە خۆبەزلزانەدا دابنێین کە کۆڵۆنیالیزمی پێشوو بەرامبەر موستەعمەرەکەی هەیبووە، چونکە ئەو موستەعمەرەیەی لە لایەنی ئابورییەوە سەرکەوتو بووە لەوەی ژیانی مادیی دانیشتوانەکەی مسۆگەر بکات.

هەموو ئەوانە ڕێی تێدەچێت، بەڵام بەردەوامبونی بێدەنگی ڕۆشنبیرانی فەرەنسا، چیتر پاساوی بۆ نییە، بەتایبەتی دوای بەردەوامی شۆڕشی یاسەمینو درێژبونەوەی بۆ نزیکەی مانگێک. دوای ئەوەی خۆپیشاندانەکانمان بینیو دوای ئەوەی گوێمان لە دروشمەکانی بوو: ئازادی، کار، کەرامەت، یان بن عەلی بۆ دەرەوە! دوای ئەوەی هەموو ئەو نوسینانەمان لەسەری خوێندەوە کە لێرەو لەوێ نوسران، چیتر بێدەنگی ئەو ڕۆشنبیرانە نە قبوڵدەکرێو نە پاساوی هەیە. چۆن دەکرێ ئەم بێدەنگییە لێکبدرێتەوە؟ ناوەڕۆکو ئامانژەکانی چین؟ ئایا ئەوە لە گوێنەدان بە تونسو میللەتەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە؟ یاخود ئەو بێدەنگییە هێشتا گوزارشتە لەو دابەشکردنەی جیهان بۆ ناوەندو کەنار دابەشدەکات؟ ئاشکرایە ناوەند، واتە ڕۆژئاوا، ئەوە بڕیاردەدات ئەگەر ڕوداوێک گرنگو بایەخداربێت یان نا. ناوچە پەراوێزخراوو کەنارەکان هیچیان لەسەر نییە بیکەن تەنها ئەوەنەبێت گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە بن کە لە ناوەند دەردەکرێت.

لەوبڕوایەدام ڕوداوەکانی تونس، پێویستە وامان لێبکات نەکەوینە دوو هەڵەی بەربڵاوەوە، ئەوانیش هەڵەی ویسایەی ئەبەدی کۆڵۆنیاڵیزمەکانی پێشتر، لەگەڵ هەڵەی ئەو تێڕوانینە باڵادەستەی جیهان بۆ ناوەندو کەناری پەراوێزخراو دابەشدەکاتو کەنارەکان دەبێ لە ئاسمانی ناوەنددا بسوڕێنەوە. ئەو

شۆڕشەی کە سەحنەی ڕوداوەکانی، لەو شوێنەدا کە پێشتر ڕۆمانەکان پێیاندەوت ئەفریقا ڕویدا، لەلایەن کەسێکی هەژارەوە هەڵگیرسا کە ئاگری لە جەستەی خۆی بەرداو خۆی کرد بە قوربانی. لە ناوچەی سیدی بوزێد ڕویدا کە لە ناوخۆی تونسدا ناوچەیەکی پەراوێزخراوە، چ جای فەرەنسا!

لێرەوە شۆڕش لە ناوچەیەکی پەراوێزخراوەوە دەستی پێنەکرد، بەڵکو لە ناوچەیەکی پەراوێزخراوی پەراوێزخراوەوە دەستپێیکرد. پاشان بە هۆی ئەنتەرنێتو ئامرازە تازەکانی زانیارییەوە فراوان بوو، واتە لە ڕێگەی پانتاییەکی کراوەوە کە دەتوانێت هەر پەراوێزخراوێک بکات بە ناوەند. ئەوەی لە تونس ڕویدا، هەمو وتەزاو پۆلێنکردنەکانی پێشترمان تێکوپێک دەدا. ئەگەر بمانەوێ لە جیهان، وەک خۆی یان وەک ئەوەی کە ئێستا هەیە تێبگەین، ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی باشتر تێیدا جێگیرببین، ئەوا پێویستە لەسەرمان لە ئێستاوە بۆ داهاتوو، حسابێکی باش بۆ ئەم ئامێرە چالاکە بکەین کە ناوەندەکان دەکات بە کەنارو کەنارەکان دەکات بە ناوەند. ئەوە ئامێرێکە نە نیشتیمانی هەیە نە زەویەکی دیاریکراو، تەنها ئەو پانتاییە کراوەیەی هەیە کە بەسەر هەموو جیهاندا دەڕوانێت.

کەواتە لەنێوان شۆڕشی یاسەمینو شۆڕشی زانیاری، پەیوەندییەکی تۆکمە هەیەو پێویستە لەسەرمان دان بەوەدا بنێین لە تونسی بچوکەوە سەریهەڵدا، کە زۆرجار شوێنی سەرنجو بایەخی زلهێزەکان نییە. ئەوە ڕوداوێکی مەترسیدارەو بەڵگەی وەرچەرخانێکی چۆنایەتییە لە مێژودا. بۆ ئەوەی باش لەم وانە تونسییە تێبگەین، پێویستە لەسەرمان لەو حەتمییەتە دەربچین کە لەناو جیاوازییەکی ڕادیکاڵیدا بەندیکردوین. پێویستە ئەم مرۆڤە شەهیدە «محەمەد بوعەزیز» بچێتە ناو خەیاڵدانی دەستجەمعیمانەوە، تەواو وەک چۆن «ئایان بالاش» لە ڕێگەی خۆسوتاندنییەوە بەهاری پراگی دەستپێکردو چووە ناو خەیاڵدانی دەستەجەمعیمانەوە. بەڵام لە پشت ئەم ڕوداوانەوەو لە پشت ئاسۆی عەرەبییەکەو قوڵاییە ئەفریقییەکەیەوە، پێویستە ڕەهەندە جیهانیو گەردونییەکەی ببینین.

ئەم شۆڕشە شۆڕشێکی هێمن، خاوەن کەرامەت، لەخۆدڵنیا، ئاشتیخواز، بەرپرسیار، پێگەیشتوو بوو. ئەگەر لە سیاقە جوگرافیو ڕۆشنبیرییەکەیەوە تەماشای بکەین، دەبینین بەڵێنێکی جوانە بۆ میللەتانو مۆتەکەیەکی ترسناکیشە بۆ ستمگەرە چەوسێنەرەکانو وانەیەکیان پێدادەدا هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە. بەڵام ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی جیهانیو گەردونییەوە لێیبڕوانین، ئەوا ئەم حەقیقەتەی خوارەوەمان بۆ دەسەلمێنێت: هەموو میللەتانی سەر گۆی زەوی تامەزرۆی دیموکراسیەتو ئازادین. لەبەر ئەم هۆیەیە دەڵێم ئەوەی لەمڕۆدا لە تونس ڕودەدات، پێویستە لەلایەن ئێمەوە پاڵپشتو کۆمەکی چالاکانەی لێبکرێت. ئێمە بەتایبەتی ئەوە دەڵێینو بەم نزیکانە مشتومڕی گەورە سەبارەت بە بارودۆخی تونس، لەنێوان ڕەوتە جیاوازەکاندا دێتەئارا. بێگومان تێزە توندڕەو و پەرگیرەکان ئامادەییان دەبێتو بەدڵنیاییەوە گوزارشت لەخۆیان دەکەن، بەڵام ئێمە ئەو ئامرازە فیکریو سیاسیانەمان هەیە کە ڕوبەڕویان ببینەوەو لە سنوری خۆیان ڕایانوەستێنین.

**سەرچاوە**:

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، لاپەڕی بیروڕا، ژمارە ١١٧٤٥، دووشەمە ٢٤/ ١/ ٢٠١١

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لە ماوەی ڕابردودا دەزگای سەردەم کۆمەڵێ کتێبی دیکەی خستە نێو کتێبخانەی کوردییەوە، کتێبەکان هەمەجۆرو هەمەڕەنگ بوون، لە دیوانی شیعرەوە بۆ ڕۆمان، لە فیکرو فەلسەفەوە بۆ هونەری بەڕێوەبردنی کەناڵە تەلەفزیۆنیەکان و بۆ شارەزابوون بە دنیای یۆگاو شێوازەکانی. ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین ڕانانی هەندێ لەو کتێبانە بکەین.

## بیرمەندان..بنیاتنەرانی فەلسەفەی هاوچەرخ




ئەم کتێبە کە کتێبێکی گەورەیەو ژمارەی لاپەڕەکانی ٥٠٥ لاپەڕەیە، یەکێکە لەو کتێبە دەگمەنانەی باس لە فەلسەفەی زمانو قوتابخانە فەلسەفییەکانی خۆرئاوا دەکات، لەوانە قوتابخانەی فرانکفۆرتو مارکسیزمو ئێگزیستانسیالیزم دەکات. لەپاڵ ئەوانەشدا باس لە هەندێ بواری دیکەی فەلسەفە دەکات، وەک فەلسەفەی مۆراڵو فەلسەفەی سیاسیو...هتد. هەروەها لەم کتێبەدا ئاشنادەبین بە کەسە دیارو ناسراوەکانی ساڵانی دەیەی حەفتاو هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، ئەو کەسانەی کە لە خۆرئاوادا گوێیان لێگیراوەو کاریگەریان لەسەر ناوەندە ڕۆشنبیریو ئەکادیمیەکانی ئەوروپا هەبووە، لەوانە «ئایزینا بێرلین» کە ژیاننامەی کارل مارکسی نوسیوەو ئەندامی لیژنەی زانستی کۆلیژی ئۆل سۆلیزە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. «چارلێز تیلێر» کە خەڵکی

کەنەدایەو پێشتر مامۆستای فەلسەفەو زانستە سیاسییەکان بووە لە زانکۆی میگل لە کەنەدا، بەڵام هەنوکە مامۆستای تیۆرە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. «مارکۆزە» کە یەکێکە لە بیرمەندە گەورەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، لەم کتێبەدا وتووێژێکی بەپێزی مارکۆزەو دانەری کتێبەکە دەخوێنینەوە، خوێندکارانی شۆڕشی خوێندکارانی فەرەنسا لەساڵی ١٩٦٨، مارکۆزەیان وەک ڕابەری خۆیان دەبینیو کاریان لەسەر تێزو بیروبۆچونەکانی دەکردو وەک لە کتێبەکەدا هاتووە: شۆڕشگێڕانی ساڵی ١٩٦٨ مارکۆزەیان لە هەموو کەس زیاتر بە پێشڕەو و پێشەوای خۆیان ڕادەگەیاندو واتاگەلێکیان لە کتێبەکانی مارکۆزە دەردەهێناو لەسەر دیوارەکان دەیانوسی تا بەدنیا بڵێن مەبەستیان بە پراکتیزەکردنی بیرۆکەکانی ئەوە.

ئەم کتێبە بریتییە لە ١٦ وتووێژی بەپێزو نایاب کە لەگەڵ کۆمەڵێ لە عەقڵە ڕۆشنگەرەکانی ئەوروپادا سازکراوە، هەموو ئەوانەی کە لەم کتێبەدا هێنراونەتە قسەو گفتوگۆ، مامۆستای زانکۆ ناودارەکانی ئەوروپاو ئەمریکانو شارەزاییان لە کایە فرەڕەنگو جیاواز جیاوازەکانی فەلسەفەدا هەیە. ئەم کتێبە وەک وەرگێڕەکەی لە پێشەکیەکەیدا کە بۆ کتێبەکەی نوسیوە دەڵێ: (بۆیە دەتوانم بەرپرسیارانە بڵێم بۆ کەسێکە کە دەیەوێت زانیاریو شارەزایی سەرەتایی لەسەر قوتابخانە فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوا هەبێت). تیراژی کتێبەکە هەزار دانەیەو نرخی ٧٥٠٠ دینارە.

## هەستو نەست

دیوانێکی تازەی «شێرکۆ بێکەس»ی شاعیرە، بابەتەکانی نێو ئەم دیوانە هەمەجۆرو هەمە ڕەنگن، لە خۆشەویستو عەشقەوە بۆ لاواندنەوەی ئەو هاوڕێو ئازیزانەی ماڵئاواییان کردووە، لە ڕۆژگاری منداڵیو کۆلارەهەڵدانەوە بۆ ڤالانتاین، بۆ قسەکردن لەگەڵ نەوەی تازەو زۆر بابەتی دیکە. لەم دیوانەدا هەستدەکەین ئەم شاعیرەمان هێشتا خاوەنی قەڵەمێکی بەبڕشتەو هێشتا خەیاڵی پڕە لە وشەو وێنەو بابەتی شیعری. بەمانایەکی تر ئەم شاعیرە دەتوانێت هەر بابەتێک کە بیری لێدەکاتەوە، دەتوانێ بەشێوەیەکی شیعرئامێز دایڕێژێتو وایلێبکات بۆنو بەرامەی شیعری لێوەبێت. وایلێبکات لە دنیای شیعرو مۆسیقای شیعرو ئیقاعی ناوەوەی شیعر دوورنەکەوێتەوە. بەپێی بەدواداچونێکی ڕۆژنامەی ئاسۆ، ئاسۆی ئەدەبی کە لە هەشت کتێبخانەی ناوشاری سلێمانیدا ئەنجامدراوە، دیوانی هەستو نەست دووەم پڕفرۆشترین کتێب بووە لە مانگی یەکی ئەم ساڵدا. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە هێشتا خوێنەری



شیعر ئامادەیی هەیەو ئەو دیوانانە دەكرێن كە بەجۆرێك لە جۆرەكان بە جیهانی شیعر ئاشنایان دەكات.

ئەم دیوانە ٤١٦ لاپەڕەیەو لە ناوەوە دیزاینێكی جوانی بۆكراوە، تیراژی ١٧٥٠ دانەیەو نرخی ٥٠٠٠ هەزار دینارە.

## خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست

ڕۆمانی خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست یەكێكە لەو ڕۆمانە ناوازانەی كە باس لە دنیای نێوزیندانو ئەشكەنجەدانی زیندانیەكان دەكات، باس لەو دڵڕەقیو بێبەزەییە دەكات كە بەندییەكان لە سیتمە دیكتاتۆریەكانداو لەسەر دەستی بەندیەوانەكان دەیچێژن. گرنگی ئەم ڕۆمانە لەوەدایە باس لە سیستمە دیكتاتۆریەكانی ڕۆژهەڵاتو جیهانی عەرەبی دەكات كە زۆر لە ئێمەوە نزیكنو دەیان ئەزمونی تاڵو جەرگبڕمان لەگەڵ ئەو سیتمە دیكتاتۆریانەدا هەیە. ڕەجەب پاڵەوانی ڕۆمانەكە هیچ نییە جگە لەو قوربانییەی ڕۆژانە لە سیستمە دیكتاتۆریەكاندا دەپلیشێنەوەو سەرتاپای ژیانیان دەبێتە تراژیدیایەكی بێ وێنە. تراژیدیایەك لەناو بێدەنگی دەروبەرو بێدەنگی جیهاندا، لەئاست تراژیدیاكان، نوقم دەبێت. ڕۆژگارێك ئەم خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە سیخناخ بوو بە دیكتاتۆریو ستمكار، پڕ بوو لە دەسەڵاتی سەركوتكەرو خوێنڕێژ، وەلێ خۆشبەختانە ئێستا دەبینین وردە وردەو یەك لەدوای یەك ئەو دەسەڵاتانە هەرەسدەهێننو دەڕوخێن، ڕادەكەنو وڵاتو نیشتیمان جێدەهێڵن. خۆشبەختانە ڕوخاندنو هەرەسهێنانی ئەو دیكتاتۆرانە لەوەی عێراقەوە دەستپێیكرد كە بە باوكی دیكتاتۆرەكانی دەزانم.




ئەم ڕۆمانە بەزمانێكی كوردی پاراو بێ گرفت وەرگێڕدراوەو شایەنی ئەوەیە زیاد لە جارێك بخوێنرێتەوەو لە كتێبخانەی هەموو ماڵێدا هەبێت. ٢٥٠ لاپەڕەیەو تیراژەكەی هەزار دانەیەو نرخی ٤٥٠٠ دینارە.

